رەحیم سابیر

لێکۆڵینەوەیەکی
سایکۆسۆسیۆلۆژییە
لەسەر کۆمەڵگای کورد

# کوردۆلۆژی

2001

ناوی کتێب: کوردۆلۆژی

بابەت: لێکۆڵینەوەی سایکۆسۆسیۆلۆژی

نووسینی: ڕەحیم سابیر

تیراژ: ٥-

ساڵ: ٢-١

چاپی: یەکەم

کۆمپیوتەر: جلیل حسین

چاپخانە: داناز

ژمارەی سپاردن: ١ ٢٥١١ ی وەزارەتی ڕۆشنبیری ساڵی ١-٢ی دراوەتێ

لەبڵاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیریی گەلاوێژە

سلێمانی – شەقامی سالم ☎ (٢٢٨٥٦)

# ناوەڕۆك

## پێشەکیەکی کورت:

دەتوانم بڵێم ئەم کتێبە بەدەروازەیەك دابنێم بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر کۆمەڵگای کورد، لێکۆڵینەوەیەکی رامیاری، کۆمەلایەتی، سۆسیۆلۆژی، سایکۆلۆژی، هەروەها دەڵێم من پسپۆڕ نیم لەو بوارانەدا بەلام هەوڵم داوە لەو چەمکانە بدوێم و شانی بخەمە بەر، بۆ زیاتر لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەل لەسەریان لەلایەن پسپۆڕو رۆشنبیرانی ترەوە، هیوادارم کەلێنێکی کتێبخانەی کوردیم پڕکردبێتەوەو بەردێکم خستبێتە سەر بەردێك بەو هیوایەی کۆمەڵگای کوردی بەرەو پێشتر هەنگاوی جدیانەی خۆی بنێت.

رەحیم سابیر

# پێکهاتەی کۆمەڵگەو چەمکی دەسەڵات

کۆمەڵگا خۆی لە خۆیدا پێکهاتەیەکی ئالۆزە کە هەمیشە لە ناوەڕۆکیدا هەڵگری گەلێك پێشکەوتن و لە هەمان کاتدا دواکەوتنە، واتە هەڵگری هەگبەی ئاڵوگۆڕ و هەڵچوون و داچوونە بە پێی گروپە یان خڕۆکە مرۆیی‌یەکانی نێو ئەو پێکهاتەیە کە هێشتا لە دایك نەبووە، کۆمەڵ بۆ پێکهێنانی پێکهاتەیەکی ڕێك و پێك هەمیشە هەنگاوی خۆی دەنێ، جاری وایە هەنگاوەکانی سست و خاوە واتە شێوەی کیسەڵی هەنگاو دەنێ و ڕێدەکات، جاری واش هەیە قەڵەمباز بە خێوە دەبینێ واتە هەنگاوی گەورە دەنێ، هەنگاوەکانیش بە پێی تێگەیشتنی کۆمەڵ دەڕوات و گەشە دەکات زۆر جار ئەو هەنگاوانە کۆمەڵ دوو چاری لادان و شکستی دەکات و سەر لە کۆمەڵ و پێکهاتەکەی دەشێوێنێ لە گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵدا، هەنگاوی سست کە بگونجێ لەگەڵ قۆناغی گەشەکردنی کۆمەڵدا هەمیشە سەرکەوتنی بەدەست هێناوە سەرەڕای

ئەوەش مێژووی بۆ دروست کردووە و قۆناغی مێژوویی پێبەخشیوە، کەچی لە رەوتی کۆمەڵێکی قەڵەمبازدا زۆرجار کۆمەڵ تووشی شکستی و تێك شکاندن بووە و لە رێی گەشەکردنی خۆی لای داوە و دووچاری دواکەوتن بووە و لەوێشەوە پێکهاتەکەی تووشی سەر لێشێواندن کردوە و کۆمەڵگای لێڵ و گرژکردووە، دواجار لە قۆناغی مێژوویی دوور کەوتۆتەوە، واتە تووشی لادان بووە و نەیتوانیوە گەشە بەو قۆناغەبدات و مێژوویەك بۆ خۆی مسۆگەر بکات، ئۆگست کۆنت (١٧٩٨-١٨٥٧)ی فەرەنسی دەڵێ ( دەشبێت لەنگەری بەرێوەچوونی ئاسایی کۆمەڵ لە قۆناغێکی دیاریکراودا تێك بچێت بە هۆی هەندێك کێشەو لایەنی لاوازەوە بەڵام بە هۆی توانای مرۆڤەوە دەتوانرێت ئەو نەوازشانە چاك بکرێتەوە و کۆمەڵ بگەرێتەوە بۆ باری ئاسایی جارانی) ئەگەرچی لە روانگەی کۆمەڵناسییەوە دەرکەوتووە کە مرۆڤ خۆرسکی ئەفریدە بویەکی کۆمەڵایەتییە کە (ئیبن خەلدون) ئەم دیاردەیە ناو دەنێت (پێویست بوونی کۆمەڵایەتی و دروست بوونی دەسەلات) دیارە ئەو کەسانە بەشی هۆشیاری کۆمەڵن کە رادەی گەرانەوەی ئاسایی کۆمەڵ دەخەنەوە سەر هێڵی راستی خۆیان کە خۆیان بە بەشێکی هوشیاری کۆمەڵ دەزانن و رابەرایەتی ئەو قۆناغە سامناکانە دەکەن و دەیگرنە ئەستۆ، کە کۆمەڵ تێی دەکەوێ یان تووشی قەیرانێکی کۆمەڵایەتی دەبێت و لەنگەر دەگرێ، دیارە پەرەسەندنی گەشەی کۆمەڵایەتیش وەك

پێویستی مێژوویی گەشەی یاسایی بە چەند قۆناغێکی جیاواز و زنجیرەیەکی لێک نەپچڕاوپێك دەهێنێت، ئەم زنجیرەیەش لە تەك ڕەوڕەوەی مێژوودا بەرەو پێشەوە دەچێت و لەبەرئەوە دەتوانرێت لە هەر قۆناغێکدا ئاست و پلەی پێشکەوتنی هەموو قۆناغەکانی پێش خۆی ببینرێنەوە، پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی شێوەیەکی هێڵکاری لول پێچی وەردەگرێت بە خۆوە نەك شێوەی هێڵێکی ڕاست واتە ئەو پەرەسەندانەش بیردۆزێکی بێ چەند و چۆنە و بە شێوەیەکی کوێرانە روونادات بەڵکو بە پێی چەند یاسایەکی تایبەت کە دەتوانرێت ئەو یاسایانە لە پێناوی داد پەروەرێتی کۆمەڵایەتیدا بدۆزرێتەوە و فەرمانڕەوایی یان پێ‌بکرێت، گۆڕانکاری‌یەکانی کۆمەڵگای نەتەوەکان زۆربەیان تووشی ئەو گۆڕانە چاوەڕوان کراوە نەبوون کە رووی داوە و دوا جار تووشی هەڵە و سەرلێ‌شێواندن بوون، شۆڕشی کۆیلەکان و شۆڕشی جوتیاران لە مێژووی کۆندا زۆربەیان تووشی ئەو شکستی‌یە بوون کە نەیان توانیوە پێکهاتەیەکی کۆمەڵ و پێکهاتەیەکی توێژی بۆ خۆیان دروست بکەن، هەمیشە بەرە و لادان و ڕووخان ملیان ناوە و واشیان لێ‌هاتووە کاتی هەستانەوەیان زۆر زەحمەت بووبێت و تاڵی زۆریان چەشتووە تا چونەتەوە سەر هێڵی ڕاست و خۆیان کردۆتەوە بە پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکەیاندا و لەوێدا بە پێی پێویست جێی خۆیان کردۆتەوە و تێکەڵاوبوون، دیارە کۆمەڵ بەبێ پرسی کۆمەڵ خۆی

ناتوانێت هەل و مەرجی یاساکانی کۆمەڵ بخاتە کار واتە ئەو کۆمەڵـە پابـەند دەبێـت بـە هـەل و مـەرجی تایبـەتی گەشـەکردن و یاسـاکانی پرۆسێسی گۆرانی کۆمەڵ لە کۆمەڵگا خۆیدا لە منداڵانیدا هـەڵی گرتـووە لەگەڵ هۆشیاری کۆمەڵدا لە دایك دەبێت کە خۆی داوای دەکات بۆ بـەرە و پێشەوە بردنی کۆمەڵگا واتە پرس کردن بە کۆمەڵ گەشەکردنی کۆمەڵ دەردەخات بۆ پێکهاتەی ئەوەی یان ئەو چین و باوەڕەی کە دەیەوێ ببـێ وەك حەتمیـەتی مێژوویـی ئەمـەش گـەورەترین گۆرانـی کۆمـەڵ پێـك دەهێنێ لە قۆناغی گۆڕانی کۆمەڵ و پێکهاتنی کۆمەڵێکی گەشەداردا کە خۆی وەك پێویسـت پێویستییەتی کـە دواجـار بـە هـۆی بەرنامەیـەکی تایبەتەوە سەرکەوتن بە دەست دەهێنێ و لە هەناوی خۆیـدا کۆمـەڵێکی پێشکەوتوو گەشەدار سەر هەڵدەدات، یان لە دایك دەبێت واتە هوشیاری کۆمەڵایـەتی کۆمـەڵگا، مێژوو پێکهاتـە چ لـە رووی ئـابووری و لـە رووی کۆمەڵایـەتی و لـە رووی کەسـێتییەوە بێـت بـۆ ئـەو کۆمەڵـە هوشـیارە دروست دەکات کە دواجار ئەو هوشیاریە دەبێتە بەرگێك یان بازنەیەك کە خۆی تیادا دەناسێتەوە و خۆی تیادا بەدی دەکات چوونکە لەدایك بـووی ئـەو هـەل و مەرجەیـە کـە خـۆی ویسـتویەتی، زۆربـەی پێکهاتـە کۆمەڵایەتییـەکان و شۆڕشـی گـەلان و چینـە جیاجیاکـان تەنانـەت ئایدیۆلۆژیـەکان لـە ژێـر کاریگـەری ئـەو هۆشـیاریە کۆمەڵایەتیـەدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنـاوە، کۆمـەڵ خـۆی خاوەنی هـەموو شتێکە و

خۆشی بە خاوەنی سەرکەوتنەکان دەزانێ  هەر خۆشی دوا ڕۆژی خۆی دیاری دەکات، بەلآم زۆرجار کۆمەڵ هەل و مەرجی گەشەکردنی، لەبەردەمدایە و هەنگاو نانێ بۆ گەشەکردنی مەلۆتکەی منداڵدانی خۆی، واتە هەر خۆی دەبێتە لەمپەرێك لەبەردەم گەشەی خۆیدا یان لەبارچوونی توخمی مەلۆتکەی منداڵدانی، لێرەدا نرخ و بەهای قۆناغی مێژوویی خۆی دەدۆڕێنێ و پێکهاتەی کۆمەڵی ڕاستی خۆی لە دەست دەدات کە دەبوایە ببوایە، دوای شکست هێنانی ئەو کۆمەڵە و چەقینی لە قوڕی دواکەوتندا چاوەڕێی (فریاد دەرس)ێك دەبێت ئەویش لەوەوەی کە دووچاری شکستی کۆمەلآیەتی قەیرانی سیاسی و ئابووری و ئاڵۆزی دەروونی بووە، لێرەوە کە کۆمەڵ وەك حەتمیەتی مێژوویی پێویستی بە تاکە کەسێك دەبێت کە ببێتە ڕزگارکەر بۆی، واتە گەران بە دوای (فریادرەس)ێکدا، واتە کۆمەڵ هەوڵ دەدات لەو هەنگاوە ئاڵۆز و گرژەدا تاکە کەسێك بدۆزێتەوە کە وەلآمدانەوەی پرسیارەکانی پێبێت، یان چارەسەرەکانی لە هەگبەدا بێت و ڕاست و هوشیارکەرەوەی و ڕێ نیشاندەری و لێوەشاوە بێت کە لەو قەیرانانە ڕزگاریان بکات، (ئوگست کۆنت) دەڵێ (فەرمانڕەوایی پێویستییەکی گرنگە و هیچ کۆمەڵێك بێ فەرمانڕەوا نابێت ئەمەش لەو ئارەزووە وە هاتووە کە هەندێك حەز بە فەرمانڕەوایی دەکەن لەبەرئەوە هەندێکی تر شوێنیان دەکەون) واتە پێویستییە مێژووییەکان زۆرجار سەرکردە دروست

دەکەن، هەر بۆیە کۆمەڵ لە دەوری تاکە کەس خڕدەبنەوە و دەیکەنە رابەر و سەرکردە و جڵەوی کۆمەڵگای نوێی دەدەنە دەست و دەسەڵاتی رەهای دەدەنێ واتە هەموو هێزو توانای خۆیان پێدەبەخشن و کە دواجار هەموو بڕیارێك لەو تاکە کەسەدا کۆ دەبێتەوە، تاکە کەس یان ئەو سەرکردەیەش ئەو هەل و مەرجە دەقۆزێتەوە و ئەو هێز و توانایە لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە و بە ناوی سەرجەم دەوروبەر یاساکانی دەردەکات و بەناوی کۆمەڵیشەوە دەدوێ و فەرمانڕەوایی دەکات، سەرکردە زۆرجار رۆڵی خۆی نابینێ کە دەبێ وەك سەرکردە و هوشیارکەرەوەی کۆمەڵگا ببینێ کە دەبێتە هۆی لەدەست دانی سەرکردایەتی‌یەکەی، سپارتاکۆس زوڵم و زۆری دەرەبەگ وای کرد شۆڕشێکی کۆیلە بەرپا بکات، بێئەوەی خەڵکان سپارتاکۆس هەر ببینن یان بیناسن دوای شۆڕشەکەی کەوتن، بەڵام بێ بەرنامەیی و بێ دیسپلینی سپارتاکۆس بۆ شۆڕش وای کرد شۆڕەشەکە شکست بهێنێ و کە دواجار سپراتاکۆس بووە قوربانی و کوژرا، بەڵام دوای ئەوە جۆشێکی‌دا بە شۆڕشەکانی دوای خۆی و سەرکردەکانی دوای خۆی، هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو شۆڕشە [illegible]اندنەوەی کۆیلەکان بوو ((هەروەك شۆڕشەکەی ناوی لێنرا ش[illegible]ڕشی کۆیلەکان لەسەر دەستی چینی دەسەڵاتدار و چەوسێنەرەکان ک[illegible] ببوە فاکتەرێکی گرنگ بۆ شۆڕشێکی [illegible] شۆڕشی کۆیلەکان دژی رۆژداری، کەوابێ راپەڕین و شۆڕش بێ بەرنامە [illegible]

دیسپلین و هوشیاری کۆمەلآیەتی و ستراتیژی دووری ئامادەکراوی تاکە کەس مەحالە سەرکەوتنی و مەحالە دروست کردنی پێکهاتەیەکی کۆمەلآیەتی کە ژێرخان و سەرخانیکەسایەتی و دەسەلآت دیاری دەکات.

دیارە سەرکردەی بلیمەت هوشیاری دەوروبەری لێك دەداتەوە و لە هەمان کاتدا ئاراستەشیان دەکات بۆچوونە پێشەوە بە پلەی ئاراستە کردنەکانی خۆی کەلەگەڵ کۆمەڵدا بگونجێ، ئەمەش زیرەکی و هوشیاری سەرکردە دیاریدەکات، بۆیەش خەڵکان واتە ئەوانەی دەوروبەر کە لەو سەرکردەیە خڕدەبنەوە و بە چاوێکی گەورە سەیری دەکەن و زۆرجار پەرگرانە ڕێزی دەگرن تا رادەی پەرستن، مێژوو شاهیدی زۆر لەو جۆرە سەرکردانەیە لە پێشدا لە مێژووی کۆنی مرۆڤایەتیدا ئەو سەرکردانە بە شێوەیەکی تر لە دایك دەبوون و سەریان هەڵدەدا و دەسەلآتیان بەسەر کۆمەڵدا دەسەپاند، کەوابێ هوشیاری کۆمەلآیەتی دەبێتە هۆی دروست کردنی کۆمەڵێکی هوشیار و لەهەمان کاتدا سەرکردەیەکی هۆشیار دەدات بە دەستەوە، واتە تاکە کەس بێ کۆمەڵ هیچ بەهایەکی نابێت و کۆمەڵیش بێ تاکە کەسی بلیمەت و هوشیار دروست نابێت و بایەخیشی نابێت، کەواتە پێویستە سەرکردە هەبێت و دەبێت ببێت، هیچ کۆمەڵگایەکی مرۆڤایەتی بێ سەرکردە نەبووە، کە ئەمەش بەرو ڕەنجی مێژووە، کۆمەڵیش خۆی بە پێویستی

دەزانێت و بانگەشەی ئەوە دەکات کە پێویستی بە سەرکردە هەیە بیبات بەرێوە، کە گۆران دەبێتە پرۆسەیەکی حەتمی زۆربەی کۆمەڵگا دەگرێتەوە بە هەموو توێژەکانەوە، دیارە چینی دواکەوتوو ناتوانێت خۆی راگرێت لەبەردەم شالاوی گۆران و پێشکەوتندا؛ بەڵام قەوارە و پلەی ئەو گۆرانە بە پێی یاسای گۆرانی کۆمەڵ و هوشیاری کۆمەڵ و سیستەمی کۆمەلایەتی دەگۆرێ کە کۆمەڵ رووبەرووی قەیرانێکی گران دەبێتەوە و بەرگی پێکهاتەیەکی تر دەکاتە بەر خۆی یان لە پێکهاتەیەکی تردا کە نامۆیە بۆیی و دواجار پێکهاتەی کۆنی خۆی دەرمێنێ و هەرەمێکی نوێ بۆ خۆی دروست دەکات، لەو ساتانەدا هەندێ سەرکردە سەر هەڵدەدەن و دەبنە ترۆپکی ئەو هەرەمە و هەرەمی دەسەلات پێك دەهێنێ بە خۆشیەوە واتە لەسەرەوە بۆ خوارەوە و بە پێچەوانەوە، کەوابێ ئەو سەرکردایەتی‌یە رابەرایەتی ئەو پێشکەوتنە دەگرێتە دەست، واتە گرتنە دەست جڵەوی ئەسپی کۆمەڵگا. ئەو دەسەلاتە یان ئەو سەرکردایەتی‌یە کە دەسەلاتێکی کاریزمایی (CHARISMA) دەبێ کە پشت بە وەلائی رەهایی پیرۆزیی‌یەکی دیاری کراوی وەك پالەوانێتی دەبەستێ، دیارە ئەو دەسەلاتەش پابەندی بارودۆخی مێژوویی هەیە و رەوتی گۆرانی تاکەکەس بە خۆوە دەبینێ لە گۆرانی کۆمەڵدا کە هۆشیاری و لێهاتوویی تاکە کەس رۆلی سەرەکی تیا دەگێرێ، واتە کەسێتی ئەم دەسەلاتە بە ئازایەتی و حیکمەت و پالەوانێتی و

چاونەترسی جیادەکرێتەوە، لەوێشدا پێکهاتەی کەسێتی‌یەکی جێگیری تایبەتی دەبێت، کە ئارەزووومەندە کەسانی هەوادارانی وەك خۆی بن و هەمان کەسایەتیان هەبێت، تاکەکانی کۆمەڵ لە دەوری ئەو کەسایەتی‌یە خڕدەبنەوە و متمانەی پێدەبەخشن و پشتیوانی لێدەکەن و فەرمانەکانی جێبەجێ‌دەکەن و هەمووان ڕێزی لێدەگرن و وەك باوکی ڕۆحی سەیری دەکەن، زۆرجار نا هوشیاری کۆمەڵ و تێنەگەیشتنی لە کەسایەتی کاریزمایی وا دەکات کە زیاتر کەسێتی کاریزمایی یان سەرکردەی کاریزما یان خۆ بە پاڵەوان زانینەی وای لێدەکات کە زۆرجار شێوازی تاك ڕەوی بەکاربهێنێ و بایەخ بە زۆر بیروڕاکانی کۆمەڵنەدات و هەر خۆی هەموو شت بێت و ئەو هەموو هێزە ئەفسوناویانەی کە لە خۆیدا کۆی کردونەتەوە بیانخاتە گەڕو نەمری یەکجارەکی بە خۆی بدات، یان نەمری بە خۆی ببەخشێ، زۆرجار لای کۆمەڵ ئەو هەڵس و کەوتە بە شێوەیەکی نامۆ دێنە بەرچاو بۆیە زۆرجار ئەو پەیوەندیە ڕۆحی‌یە لە نێوان سەرکردەی کاریزمایی و تاکەکەس یان کۆمەڵ تێك دەچێ و یەك ناگرێ و لەق دەبێت و دەبێتە هۆی سست بوون و لاواز بوونی پەیوەندیەکانیان و ئەوانەی بە نامۆی سەیر دەکەن هەوڵ دەدەن لە ژێر ئەو دەسەڵاتە قورسەدا رزگاریان بێت تاوای لێدێت زۆرجار دژایەتی‌یەکی توند ڕەوانە بە خۆوە دەگرێ لە نێوان سەرکردەی کاریزمایی و جیابوونەوەکاندا یان لە کاتی زۆرناسکدا خیانەت لە سەرکردەی کاریزما

دەکرێ زۆرجار بۆ دەسەلاتی خیانەتکارە بەسەر دەسەلاتی سەرکردەی کاریزمادا، لێرەدا هاوکێشەی نەمانی باوک و تێك چوونی شیرازەی خێزان دێتە ئاراوە، (ماکس ڤێبەر) لەو باوەڕەدایە کە سەرکردەی کاریزمی لە کارکردنە سەر لایەنگرانی سەرکەوتنی بەرچاو بەدەست دەهێنێ ئەگەر ژمارەیان کەم بێت و دەکرێ بەلام دوای سەرکەوتنی ئەو بزوتنەوانە و بلاوبوونەوەی هەلوێست و بۆچوون و زیادبوونی ژمارەی لایەنگرانی سەرکردەی کاریزمی ئەو سیمایە لەدەست دەدات، لەبەر رۆشنایی بۆچوونەکەی (ماکس ڤێبەر)دا کاتێك. بچووکترین هەلە لەناو دام و دەزگا و رێکخستنەکانی ژێر دەسەلاتی کاریزماوە دەبێتە هۆی ناشرین کردنی ئەو هەرەمە پیرۆزەی کە بۆ ئایندەییەکی رووناك دایناوە، لە ژیانی مێژووی کۆمەلگادا چەندەها سەرکردە تێدەپەڕن، لە ژێر چەند ناوێك و لەژێر چەند بەرگێکدا، یان لە نێو جۆرە دەسەلاتێك دەردەکەون وەك چۆن لە کۆندا روویان داوە، لە ژێر چەند بەرگێکدا، لە ژێر ناوی (کوڕی خودا)، (نێردراوی خودا)، (سێبەری خودا)، (پاپا)، (ئیمپراتۆر)، (پاشا)، (دکتاتۆر.. هتد) کە ئەمانە بە پێی سەردەم کاریان کردۆتە سەر رەوتی کۆمەلگەی مرۆڤایەتی، خۆیان بە کەسانێکی نموونەیی مەزن زانیوە و نموونەیان لە ژیانی ئاساییدانیە و وەك مرۆڤێکی بەهێز و ئەفسوناوی و بە توانا و بلیمەت دەردەکەون، یان خۆیان وا دەردەخەن، هەمیشەش خۆیان لە زاری خۆیانەوە بانگەشەی ئەوانەیان کردووە،

توانیویانە پشت بە باوەڕەکانی خۆیان ببەستن و سەرنجی خەڵکی بەلای خۆیاندا رابکێشن و خەڵکان لە دەوری خۆیان خڕبکەنەوە خەڵکیش بە چاوی مرۆڤێکی ئەفسوناوی و خارق و نائاسایی و لەسەر و خۆیانەوە و بە سەرسوڕمانەوە تێی بڕوانن بەرگری ئەو سەرکردە کاریزمایییانە وایان لێدەکات کە هەندێجار خۆیان بە دروست کەری مێژوو لە قەڵەم بدەن و خۆیان لەسەر و هەموو شتێکەوە ببینن، ئەمەش ئەو هەڵەیەیە کە سەرکردەی کاریزمایی تێی دەکەوێ و دوایی دەبێتە هۆی روخاندنی هەرەمەکەی، واتە لە دەست دانی دەسەلاتی، بەلام سەرکردەی زیرەك هەمیشە دەڕوانێتە رۆحی تاکە کەسی کۆمەڵەکەی لەوێوە نەزمی خۆ بە دەستەوەدانی بۆ خۆی لێدەدات و وای لێدەکات خۆی بە قوربانی بکات، بەلام لەبەر ئەوەی کۆمەل خولقێنەری ئەو پرۆسێسە یاسایانەی ژیانە بەمەدا دەردەکەوێ کە کۆمەڵ دروست کەری مێژووە و هەر کۆمەڵیش بالادەست دەبێت نەك سەرکردە، چونکە سەرکردەش سەرکردایەتی ناگرێتە دەست گەر کۆمەڵ نەبێت، بۆیە سەرە رۆیی زۆربەی سەرکردەکان وایان لێدەکات کە بێبەش بن لە مێژوو، یان مێژوو لە دەرەوەی خۆیان سەیریان بکات، دیارە سەرکردەی لێهاتوو رۆڵی گرنگ دەبینێ لە مێژوودا و هوشیاری دەبەخشێ بە خەڵك و لە رێی هەڵدێر رزگاریان دەکات و ئاراستەی رێگەی راستیان دەکات، واتە پێویستە مێژوویییەکان سەرکردەی مێژوویی دروست دەکەن لەرێی مۆڵەتی

کۆمەڵگاوە، کەواتە پێش هەموو شتێك هێز و توانای سەرکردە لە بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی پێشکەوتنخوازەوە وەرگیراوە کە ئەم سەرۆکە بۆتە رابەری و بەرێوەی دەبات کە سەرکردەش تووشی لادان بوو لە کۆمەڵگا ئەو کاتەش کۆمەڵگا هەرەمەکەی دەروخێنێ و سەرکردایەتی لەدەست دەردەهێنێ و لە جیاتی سەرکردەی رووخا و سەرکردەیەکی تر هەڵدەبژێرێ، واتە لەو پرۆسە مێژووەدا مرۆڤ خۆی دروست دەکات و کۆمەڵگایەکی هوشیار پێك دەهێنێ وەك مارکس دەڵێ (مرۆڤ ئەو کەرەستەیە کە مێژووی خۆی دروست دەکات). واتە ئەو دروستکەریەتی دیارە مێژوو چەند زەبر و زەنگی هەیە ئەوەندەش دەرفەتی هەیە، زۆرجار مێژوو درەفەت دەدات بە نەتەوەیەك لە ناوەوەی خۆیدا گەشە بکات، یان دەرفەت دەدات کە سەرکردەیەك بۆ گەلێکی پەرتەوازە و سەر لێشێواو دروست بێت وەك پێویستی مێژوویی کە رۆڵی مێژوویی گەشەی ئاسایی ژیانی خۆی ببینێ، بەڵام کە سەرکردە لەو بارودۆخ و لەو مێژووەدا رۆڵی خۆی نەبینێ و لەگەڵ رەوتی مێژوودا هەڵنەکات، یان بە پێی مێژوو هەنگاو نەنێ سەرکردایەتی‌یەکەی بێ سێ و دوو شکست دەهێنێ و دەرمێ و مێژووش دەیخاتە بەر زەبر و زەنگی بێبەزەیی‌یانەی خۆیەوە، چونکە درەفەت هەبوو بۆ دروست کردنی سەرکردایەتی مێژوویی بەڵام سەرکردەی بێئاگا بە رۆڵی مێژوویی خۆ هەڵناسێ دواجار ناتوانێ ئەرکە مێژوویی‌یەکان جێبەجێبکات، ئەو

جۆرە سەركردانە زۆرجار لەو هەناوە مێژووەدا كە هێشتا ماويەتی بۆ سەركردايەتی ئەم بۆچلێسی دەسەلأت دێتە مەيدانی شانۆ و دەيەوێ وەك سەركردە خۆی دەرخات كە ئەو جۆرە سەركردانە بە (تصادف-لەناكاو) لە دايك دەبن و لەناكاو دەبنە سەركردە و جلەوی كۆمەلگا دەگرنە دەست، هەر بۆيە لە هەرەمی ملی دەسەلأتيان، يان سەركردايەتيان هەميشە خيانەت و خۆ بەدەستەوەدەر و لاواز و نەخۆش دەردەچن و لە رەوتی كۆمەلأيەتی و گەشەی كۆمەلأيەتی و پێكهاتەی كۆمەلأيەتی و تەنانەت ماكی نەتەوەيش لادەدەن و كۆمەل بەناوی سەركردايەتيەوە بەرە و هەلدێر دەبەن و سەركردە متمانەی خۆی دەدۆڕێنێ و كەدواجار كۆمەل ئەو سەركردەيە دەخاتە ژێر ميكرۆسكۆبی مێژووە و دەيخاتە نێو دەستاڕی گرۆتينی خۆيەوە و بە چەكی مێژوو دەيڕوخێنێ و ملی پێنەوی دەكات و جلەوی دەسەلأتی لێوەردەگرێتەوە و دەيكاتە قوربانی مێژوويەكی گەشەكردوو پێشكەوتووتر كە لە هەناويدا سەركردەی راست لەدايك ببێ، يان هەلگری تۆوی سەركردەی بليمەت و مێژوويی بێ، جاری واش هەيە ئەو دەرفەتە مێژوويیيە كە مێژوو دەيداتە سەركردە، گەر ئەو سەركردەيە لێهاتووبوو زيرەك بوو توانی لە مێژوو بگات، ئەوا ئەو هەلە دەقۆزێتەوە و رۆلی خۆی دەبينێ لە رەورەوەی مێژوودا، كەواتە دەتوانێ رابەرايەتی بگرێتە دەست و كۆمەل لەو قەيرانە رزگاربكات، كەواتە دواكەوتن لە مێژوو، دواكەوتنە لە

خولقـاندنی سـەرکردایەتی و پێشـکەوتن، دواکەوتنـە لـە پێـك هێنـانی پێکهاتەی مێژوویی و مرۆیی کۆمەڵایەتی، دواکەوتنە لە شارستانیەت، لێرەشـدا ژیـان بـۆ سـەرکردە مـەحاڵ دەبێـت، واتـە پێداوسـتی‌یە کۆمەڵایەتیەکان و پێداویستی‌یە مێژوویی‌یەکان سەرکردە دەخولقێنن.

# دەسەڵات

هەر لە بۆچون و شیکردنەوانەی سەرەوە دەتوانین بڵێین کە سەرکردە بۆ دەست بەسەرا گرتنی کۆمەڵ و ڕێکخستن و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی خۆی جۆرە دەسەڵاتێك دەسەپێنێ و وەك سیستەمێك دەیبات بەڕێوە لەوێشەوە وەك باوکێك بۆ ئەوانی ژێر دەستی خۆی هەڵس و کەوت دەکات و فەرمانیان بەسەردا دەسەپێنێ، واتە دوا پلە یان دوا ئامانجی سەرکردە دەسەڵاتە کە پێی دەگات و خۆشی بەشایستە دەزانێ، دەسەڵاتیش ئەو هەرەمەیە کە بە هۆیەوە فەرمانەکانی لێوە دەردەچێ، دیارە لە مێژووەوە دەسەڵاتەکانی ناو خێزان و کۆمەڵ و دەوڵەتیش و تەنانەت حزبیش هەمان هەرەمی هەبووە و هەمان پلیکانەی بەڕێکردووە، واتە هەمان دەسەڵاتی کاریزمایی بردویەتی بەڕێوە وەك یاسایەکی گەردوونی و سروشتی و مرۆیی، کەواتە دەتوانین بڵێین باوکی ڕۆحی کۆمەڵگا ڕۆحی کۆمەڵایەتی لە خۆیدا کۆدەکاتەو و بەرەو

ئاستی خۆ ناسینی ئەو ڕۆحە و پەی بە خۆبردنی دەبات و ئەنجام دەیگەیەنێتە ئاستی پێکهاتنی دەوڵەت، کە وابێ دەسەڵات (POWER) دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و مرۆڤ ئاشنای شێوە جیاوازەکانی بووە و بە شێوازی جیاوازکاری کردۆتە سەر ڕەفتاری مرۆڤ هەندێ جار لە یەکگرتنی مرۆڤ لە چوارچێوەی کۆمەڵە کەسانێکی تردا یان کەسانێکدا کاریگەری هەبووە و هەندێ جار لە چوار چێوەی دەسەڵاتدا بۆتە هۆی سەرهەڵدانی جیابوونەوە و یاخی بوون لە ناو کۆمەڵە کەسانێك و کۆمەڵگادا، کەواتە دەسەڵات بە بوویەرێکی کۆمەڵایەتی لە قەڵەم دەدرێ کە لەهەر کۆمەڵێکی سەرەتایی و لێکدراوو خێزان و گەورەترین دەزگای ناو کۆمەڵدا کە دەوڵەتە هەیە، دەسەڵات هێزێکی سروشتی یان مافێکی ڕەوای ڕەفتار و دەرکردنی فەرمانە لە کۆمەڵگایەکی دیاری کراودا ئەم جۆرەی دەسەڵات بە ناوەندێکی کۆمەڵایەتی گرێ دەدرێ کە ئەندامانی کۆمەڵ پەسەندی دەکەن و مل کەچی ڕاسپاردە و فەرمان و بڕیارەکانی دەبن بەو پێیەی دەسەڵاتێکی شەرعی‌یە، ئەو دەسەڵاتەش لە ڕەزامەندی ئارەزوومەندانەی خەڵکی لە مافی تاك بۆ داڕشتنی یاسا و درەکردنی فەرمان سەرچاوەی گرتوە، دەسەڵات بۆ کۆنترۆڵ کردنی خەڵك و گوشار خستنە سەریان بە مەبەستی مل کەچی کردنیان و دەست تێوەردان لەسەربەستیان و ئاراستە کردنی هەوڵەکانیان لە بواری دیاریکراودا

هەیە، (ماکس ڤێبەر)ی کۆمەڵناسی ئەڵمانی دەسەڵات و شەرعیەتی دەسەڵاتی بەسەر سێ جۆردا دابەشکردووە ئەوانیش بریتین لە:-

١ دەسەڵاتی کلاسیکی (تەقلیدی).

٢ دەسەڵاتی کاریزمایی ((Charisma)).

٣ دەسەڵاتی یاسایی ((عەقلانی)).

ئەو دەسەڵاتانەش بە درێژایی مێژوو وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لێهاتووە و لە هەموو کۆمەڵگایەکدا هەبووە و کاری پێکراوە، دەسەڵاتەکان لە کۆمەڵگای بەشەریەتدا دەگۆڕێت بە هۆی بارودۆخ و ناوچەیی و عەقڵی کۆمەڵگاکە و باری هوشیاری کۆمەڵگاش جۆرە دەسەڵاتێك دیاری دەکات لە کاتی پێویستی و لە قۆناغێکی پێویستدا کە لەکرۆکی خۆیدا بێت و لە خزمەت ئەو ناوکەدا بێت، واتە دەسەڵات لەو شوێنانەی مێژوو یان هوشیاری کۆمەڵایەتی.. ئابووری.. مێژوویی یان پێکهاتەی کۆمەڵایەتی تێدا دروست نەبووە جێگیرنەبووە، هەمیشە دەسەڵاتیش بە لاوازی و بە نەخۆشی و ناوچەیی و گرژی دەمێنێتەوە دواجار ئەو دەسەڵاتەش لەو شوێنە تەنگە جوگرافی‌یەدا لەگەڵ رۆژگاردا رۆدەچێ و نامێنێ، ئەوەش دەبێتە نوشوستی یاساکانی گۆڕان کە کۆمەڵ لە پێشکەوتنەکان دوادەخات و بەرگی بوون بە شارستانێتی پێنادات و بێ بەشی دەکات لە مێژووی پیرۆز، بەلام لە کۆمەڵگای هوشیاردا هەمیشە لە کاکڵی خۆیدا گۆڕان بەدی دەکرێ و هەوڵ دەدرێ

که بگۆڕدرێ بەرە و باشتر، واتە خرۆکی ژیان هەمیشە لە گەشەدایە، تەنانەت گەر سەرکردەیەك لاچێ سەرکردەیەکی تر و باشتر لە جێی دادەنرێت، ئا بەو شێوەیە و لەگەڵ گۆڕانەکانی گەشەکردنی کۆمەڵ دوابەدوا دەسەلات و کۆمەڵ و تاکە کەسیش دەگۆڕێ لەباشترەوە بۆ باشتر.

## دەسەڵاتی کلاسیکی ( تەقلیدی ):

دیارە بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی کلاسیکی، سەرکردە پێویستی بە دواکەوتوترین چەمکی مرۆیی هەیە کە کۆمەڵ بەرێوەببات، ئەویش ئەو داب و نەریتە کۆنانەن کە کۆمەڵ خۆیان دەیانەوێ و پێی قایلن، یان بازنادەن بەسەر ئەو داب و نەریتە کۆنانەداو ناچنە نێو بازنەی گۆڕانکاریەکانەوە، کە ئەمیش مەترسی لە دەست دانی دەسەڵات دەگرێتەوە، یان خۆ دوورخستنەوە لە گۆڕان و گەشەی کۆمەڵگا، بۆ چەسپاندنی ئەو شێوە دەسەڵاتە، دیارە پێویستی بە هەندێك بناغە هەیە کە ئەو هەرەمەی لەسەر راوەستێ واتە ئەو دەسەڵاتە کلاسیکی یە، ئەویش کۆنترین و کۆنەپەرست ترین باوەڕە کە پشتی پێدەبەستێ و دەیکاتە ژێرخانی خۆی بۆ بنیات نانی دەسەڵاتی سەرخانی خۆی، تا هەرەمەکەی لەسەر راوەستێنێ، لەو جۆرە دەسەڵاتەدا ئەرك و فەرمان تەنانەت یاساش بایەخی نیە، بەڵکو ناوەندی شخصی رۆڵی گرنگ دەگێڕێ، دەسەڵاتی کلاسیکی لەو کۆمەڵەدا لە دایك دەبێت کە هوشیاری

کۆمەڵایەتیان پێوە دیارنیە و هوشیاری لایان دروست نەبووە، ئەمەش بووەتە ڕێ خۆشکەرێ بۆ ماوەی مانەوەی تەمەنی دەسەڵاتی کلاسیک، خۆشی واتە هەر سەرکردەی کلاسیک زیاتر پێدادەگرێ بۆ ئەو نا هوشیاریە کە ئەو دەسەڵاتە هەمیشە گرێدراوە بە داب و نەریتە کۆنەکان و ئایین و ئەفسانەی دروست کراو کە دەسەڵاتی کلاسیک دەیکاتە ژێرخان و سەرخانی خۆی پێبەهێز دەکات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر هوشیاریەك کە تەنگی پێ هەڵچنێ، هەرچی پێشکەوتنیشە ڕێی لێدەگرێ و نایەڵێ ئەو پێشکەوتنانە بەشداری بکەن لە گۆڕانکاریەکاندا، چونکە دەزانێ پێشکەوتن مەترسییە بۆ دەسەڵاتەکەی بۆیە بە هەموو جۆرێك ڕێ لە پێشکەوتن دەگرێ، لێرەدا کۆمەڵگا لە ڕەوتی مێژوویی دوور دەبێ و کۆمەڵگایەکی داخراو دەبێت بۆیە هەمیشە کۆمەڵی نا هوشیار بە چاوێکی ئەفسانەیی کوێرانە وەك (سەرۆك خێل و... باوك و باوکی گەل و هتد) دەڕواننە ئەو سەرکردەیەی کە مێژووی ژیانی دەمێکە بەسەرچووە، بۆ ئەوەی نەمری پێ ببەخشن چونکە دەزانن بە نەمانی ئەو کۆتاییان دێت، بۆیە دەیکەنە پاڵەوانی چاخ و چەرخ، هەروەك لە کۆمەڵگای کورددا دەرکەوتووە کە دواجار لێی دەدوێین، کۆمەڵگا لێرەدا لە دەرەوەی مێژوو خۆی دەبینێتەوە و بێبەش دەبێ لە مێژوو، کۆمەڵیش شێوەیەکی دیماگۆیانە دەگرێتە خۆ و کوێرانە ڕێدەکات، واتە لەو سەرکردە کلاسیکییە ڕزیوە چی دێنابینن، کەوابێ

تەکتیکی ئەو بە هۆی کوێری عەقڵ و ناهوشیاری کۆمەڵەوە دەچێتە سەرو (واتە بۆی دەلوێ) پەرەش یان ماوەی مانەوەی تەمەنی زیاتر دەدات بە دەسەلاتەکەی، بەلام زۆرجار لە هەناوی ئەو دەسەلاتەدا سەیر دەکەین بەشێکی کۆمەڵ بەوە قایل نییە، ئەو بەشەی کە گۆڕان خۆی دەسەپێنێ بەسەریدا و باوەڕی بە گۆڕان هەیە پاشقول لەسەرکردایەتی کلاسیک دەگرن و هەرەمەکەی پێلەق دەکەن و هەرەسی پێ دەهێنن تاوای لێدێ دەسەلات دەچێتە نێو دەست چینێکی هوشیار بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا، واتە هاتنە دەسەلاتی نوێ بۆ سەرشانۆ، لەو هەناوەدا واتە لە کۆمەڵگای خێلایەتیدا سەرکردەی کارزمایی کە پێشوتر کەمێك لێی دواین سەرهەڵدەدات و کۆتایی دەهێنێ بە ژیانی پەترپاکی کلاسیك و دەرەبەگ بە تایبەتی سەرهەڵدانی ئەو سەرکردایەتییە لە نێو ئەو خێلانەی یان ئەو نەتەوانەی تووشی گرێ کوێرەی کۆمەلایەتی بوون، یان لە مێژوو حاڵی نەبوون، وەك کۆمەڵگای کورد، بەلام ئەگەر بێت و ئەو کۆمەڵە ناهوشیارە هەر بیەوێ پێش نەکەوێ و زیاتر پیرۆزی بەسەرکردەی کلاسیك بدات و زیاتر ئەفسانە ئاسای پێ ببەخشی ئەوا ئەو ژێر دەستەییەی پێڕەوایە، یان ئەو کۆیلایەتییەی پێڕەوایە و پڕ بە بەرگی خۆیەتی، چونکە نایەوێ پێش بکەوێت چ خۆی چ کۆمەڵگا چ دەسەلات وەك پێویست و حەتمیەتی مێژوویی.

## دەسەڵاتی کاریزمایی( Charisma ):

گۆڕان پرۆسەیەکی حەتمی مێژووە کە روودەدات، کە دەسەڵاتیش لەو پرۆسەیەدا جێی خۆی دەکاتەوە رۆڵی تایبەتی خۆی لە گۆڕانکاریەکان دەبینێ، ئەو کاتانەی کۆمەڵ دووچاری گرێ کوێرەی کۆمەڵایەتی و قەیرانی ئابووری دەبێت، هەروەها گوشارە باوە کۆنەکان و داب و نەریتە بەسەرچووەکان دەبنە مۆتەکە و لەمپەرێك بۆ داخستنی کۆمەڵ یان بۆ لول دانی کۆمەڵ لەو کاتانەدا یاساکانی گۆڕان وەك پێداویستی مێژوویی دێنە ئاراوە و رۆڵی خۆیان دەبینن لەڕەوڕەوەی مێژوودا، واتە بە هەرەس هێنانی سەرکردەی کلاسیك کۆتایی بە ناهوشیاری و ستەم و چەوساندنەوە و خیانەت و کۆیلایەتی دێت و سیستەمی پاتریاکی دەڕوخێ، واتە رووخاندنی دەسەڵاتی (باوە پیارە) زۆرجار سەرکردەکانی کورد لە باوك سالاری (پاتریاکی) فڕێدەدرێنە دەرەوەی کۆمەڵ و دەرەوەی مێژو لەبەرئەوەی ئەو سەرکردانە جێی باوکیان نەگرتۆتەوە بۆ نەتەوەی کورد بەڵکو جێی باوەپیارەیان گرتۆتەوە، ئا

لەوێوە سەرکردەی کاریزمی دێتە جێگایی و دەسەلآت دەگرێتە دەست بە پاڵپشتی کۆمەڵی هوشیار، واتە باوکی رۆحی لە دایك دەبێت بۆ کوشتنی باوەپیارە، کە لە نێوگەلدا وەك (فریاد رەس)ێك سەیر دەکرێ.
سەرکردەی کاریزمایی یەکەم جار وەك بزوتنەوەیەکی کۆمەلآیەتی سەرهەڵدەدات، لە چوارچێوەی شۆڕشێکی کۆمەلآیەتیدا، کە دواجار سەرکردە ئەو بزووتنەوە کۆمەلآیەتی‌یە دەخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە و کۆمەڵیش لە ژێر دەسەلآت و لە چوارچێوەی کەسێتی خۆیدا دەهێڵێتەوە و بەکاریان دەهێنێ بۆ بیروبۆچوونەکانی لە پرۆژەیەکی دارێژراودا، واتە دەسەلآتی کاریزمایی کە پشت بە وەلائی رەهایی پیرۆزی‌یەکی دیاری کراوی وەك پاڵەوانێتی دەبەستێ ئەو دەسەلآتە پابەندی بارودۆخی هەنوکەیی نی‌یە بەڵکو بە هوشیاری و ئیرادەی بە هێزەوە رەوتی مێژوو لەبەرچاو دەگرێ، کەسێتی ئەم دەسەلآتە بە ئازایەتی و حیکمەت و پاڵەوانێتی جیادەکرێتەوە و تاکەکانی کۆمەڵ لە دەوری خڕدەبنەوە و دەبنە شورایەك بۆیی و دەیکەنە دەم راستی خۆیان، هەر لەو روانگەیەوە سەرکردەی کاریزمایی زۆرجار هەستێکی تەواوی بە باوەڕ بە خوبونێکی رەها و باوەڕی بەشکۆیی ئامانجەکانی و قەناعەت پێهێنانی خەڵکانی دیکە بە ئامانجەکانی و توانای گۆڕینی داب و نەریت و یاسا کۆنەکانی کۆمەڵەکەی هەیە بێ ئەوەی لەلایەن تاکەکانی کۆمەڵ یان لایەنگرانی‌یەوە رووبەڕووی کێشەو گرفت بێتەوە، چونکە هەر فەرمانێك لەلایەنە ئەو سەرکردەیەوە دەربچێ بە یاسای دادەنێ و دەبێ کۆمەڵ جێبەجێی کات و لەو فەرمان و یاسایانە لانەدەن.

## دەسەڵاتی یاسایی (عەقڵانی):

بەرزبوونی ئاستی هۆشیاری تاکەکەس دەبێتە بەرز بوونەوەی ئاستی هوشیاری کۆمەڵ واتە ئاستی هوشیاری کاریگەریان بەسەریەکەوە هەیە لە نێوان تاك و کۆمەڵدا، واتە هاوبەشی دەکەن لە گۆڕانەکاندا، بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان و باشکردنی پێداویستییەکانی کۆمەڵ و سیستەمی کۆمەڵایەتییە جیاوازییەکان، واتە هەست کردنی تاك بە بوونی لە نێو دام و دەزگاکانی دەوڵەتدا و لە هەمان کاتدا بەشداربوونی تاك لە کۆمەڵی هوشیاردا بۆ گەیشتنە بە دەسەڵاتی یاسایی (عەقڵانی) دیارە بیروبۆچوونەکان و تیۆری تاکەکەسە زانست خواز و پێشکەوتووەکان ڕۆڵی گەورە و بەهێز دەبینن لەو پرۆسە عەقڵانیەدا کە لە ژێربیر و باوەڕەکانیاندا یاسا لە دایك دەبێت کە لە ژێر کاریگەری کۆمەڵدا خۆی دەنوێنێ، ئەو بیرمەندانە رابەرایەتی کۆمەڵێك یان بەشێك لە کۆمەڵگا دەکەن و بەشداری لە دروست کردنی دەسەڵات و دەوڵەتی یاسایی (عەقڵانیدا) دەکەن، بۆچوونەکانی

ئەفلاتون کەمێك بە لای ئەو دەسەڵاتە عەقڵانی و یاساییەدا دەڕۆیشت و بۆ بەیاساکردنی واتە عەقڵانیەت کردنی سیستەمی ئەوسای یۆنان، زۆرجاریش گۆڕانکاریە حەتمیەکان هوشیاری کۆمەڵایەتی و دەسەڵات دیاری دەکەن و ئەو بیرمەندانەش ڕۆڵی گرنگی تیادا دەگێڕن، سەدەی ١٧ ، ١٨ ،١٩ و سەرەتای سەدەی بیست پێکهاتەیەکی لەو شێوە دەسەڵاتەی گرتەخۆ، کە بووە گۆڕانکاری و لە سەدەکانی پێشووتری جیاواز بوو، کە زۆربەی بیرمەندان دەستی باڵایان هەبووە بۆ یاساکانی دەوڵەت و تەنانەت گۆڕینی بیروبۆچوونەکان و گۆڕینی شێوازی دام و دەزگا دەوڵەتییەکان بە تایبەتی مەسەلەی دین، ڕاستە کە میر و پادشاکان لە سەردەمەکانی ناوەڕاست تا سەدەی ڕۆشنگەری دەسەڵاتێکی ڕەهایان هەبوو بە تایبەتی پیاوە ئاینییەکان واتە دەسەڵات کلاسیکی بوو تێکەڵ بە (استبدادی) بەڵام سەرخانی دەوڵەت و پێکهاتەی کۆمەڵ عەقڵانی بوو کە لە نێو کۆمەڵدا پەیڕەو دەکرا کە دواجار بووە هۆی ڕوخاندنی زۆر لە دەسەڵاتی تاك ڕەوی و کلاسیکی بە تایبەتی لە فەرەنسا و بەریتانیادا، لەو سەدانەدا کە پێشوو باسمان لێوەکرد زۆرینەی یاساکانی مرۆڤ و دەوڵەت و بیروبۆچوونە عەقڵانیەکان سەریان هەڵدا وەك پرۆژەیەك بۆ دەسەڵات و دەوڵەت کە خاڵێکی گرنگی تایبەت بوو لە پرۆسەی گۆڕانکاری لە گەشەی کۆمەڵگادا.

## پێکهاتەی کۆمەڵگای کورد :

تێکڕا لە کۆمەڵگای رۆژهەڵاتیدا تێکەڵاوییەکی ئاڵۆز لە پێکهاتەی کۆمەڵگادا هەیە و بەدی دەکرێ، قۆناغەکانی گەشەی کۆمەڵایەتی لێکتر ئالاًون و سنوورێکی جیاکەرەوە لە نێوانیاندا بە ئاشکرا نابینرێت بە مانایەکی دی هەر قۆناغە خەسڵەت و سیمای بنەڕەتی خۆی هەڵ نەگرتووە هۆی ئاشکرای ئەوەش بەندە بە چۆنیەتی گەشەی ژێرخانی کۆمەڵایەتی‌یەوە لەگەڵ پەیوەندیەکانی بەرهەم هێناندا، دیارە گەشەی کۆمەڵایەتی لەبار و دۆخێکی لەباردا و لە مێژوویەکی دیاریکراودا دروست دەبێت گەر ئەو پەرەسەندنە لەگەڵ رەوتی ئەو مێژووە هەڵ نەکات تووشی ئاڵۆزی و گرژی پێکهاتەیی دەبێت کە دەبێتە هۆی دواکەوتنی کۆمەڵ و هێشتنەوەی لە دەرەوەی مێژوو، لە هەمان کاتدا کەسایەتی‌یەکی شل و شێواوو شپرزە دروست دەکات و کەسایەتی پاك و لە قالب دراو نادات بە دەستەوە، لەوێشەوە قۆناغەکانی دوای ئەو تێك

شکاندنه هەر بە شکاوی و خواری دێت و گۆڕانکاریەکانیش زیاتر بۆ دواوەیە و زیاتر دووبارەبونەوە بە خۆیانەوە دەبینن واتە جارێ هەستانەوە و جارێ شکست، جارێ شکست و جارێ هەستانەوە، ئەمەش کاریگەری دەکاتە سەر تاکەکانی کۆمەڵ تاوای لێدێ ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتی‌یە تووشی لول بوون و گرێکوێرەی مێژوویی دەبێت، کە بە زەحمەت کۆمەڵگا چارەسەری ئەو گرێیانەی پێدەکرێت و تووشی سەر ئێشەی ئێجگار گەورەی مێژوویی و دەروونی دەکات، مەسەلەی ئابووریش هۆکارێکە کە دەبێتە ژێرخانی ئەو پێکهاتەیە کە بە ژمارەیەك دادەنرێ لە دروست کردنی ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتیەدا، واتە رۆڵی گەورە و هوشیار کەرەوەی کۆمەڵگا دەبینێ و گەشە بە رۆحی مێژوو دەدات، کە سەرخانی کۆمەڵگا دەبوژێنێتەوە و توخمی پێکهاتەیەکی تایبەتی بۆ دابین دەکات دواجار کەسایەتی‌یەکی پتەو و بە هێزی بۆ دروست دەکات کە دەچێتە خانەی پێکهاتەی کۆمەڵ سەد دەر سەد، ئەمیش پابەندە بە هوشیاری ئەو کۆمەڵگایەوە خۆشی تیا دەبینێتەوە، لە ڕوانگەیەوە کۆمەڵگای کورد وەنەبێ گۆڕانکاری نەدیبێ بەڵام ئەو گۆڕانکاریانە لە دەرەوەی مێژووی بووە و لە خزمەت کۆمەڵگایەکی تردا بووە کە نامۆ بووە بۆی نەك لە خزمەت ژێرخانی کۆمەڵگای خۆیدا هەربۆیە کۆمەڵگایەکی شڕوشەق ماوەتەوە و پێکاتەیەکی گرژولول پێچی گرتۆتە خۆ، وە لە هەموو رویەکەوە دارخراوە واتە تووشی گرێ کوێرەی

کۆمەڵایەتی و مێژوویی‌بووە، ئەمەش وای کردووە کە چین و توێژەکانی کۆمەڵگای کوردی زۆر بە زەحمەت و گران جیابکرێنەوە و پۆلێن بکرێن، هەر بۆیە هیچ چینێکی کۆمەڵگای کوردی هاوچەرخ باڵا دەست نیە ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی یەکێتی‌یەکی سیاسی دروست نەبێ بۆ سەرکردایەتی خەباتی ڕزگاری خوازانە، واتە بازنەیەکی وون بوو هەیە لە گەشەنەکردنیدا کە ئەو حاڵەتی وونبوونەش جەستەی پێکهاتەکەی شێواندووە و لە بارێکی سروشتیدا رای نەگرتووە، لێرەوە دەتوانین بڵێن کۆمەڵگای کورد کۆمەڵگایەکی نا هوشیارە کەواتە بە کۆمەڵگایەکی سەرەتایی دەدرێتە قەڵەم، (لازارییف) دەڵێ (ئەوەی ناوچە کوردنشینەکان پێ‌ی دەناسرێن لەو وولاتانەدا نزمی ئاستی گەشەکردنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانە و شێوەی پێکهاتووی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەیە)، هەروەها دەڵێ (پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە بەشەکانی کوردستاندا وەك یەك نیە)، (هەموو بەشەکانی کوردستان لە گەشەکردندا هاوشانی یەك ناڕۆن)، لازاییف دەڵێ (هەروەها ئابووری نیشتمانی و فەرهەنگی گشتی هی کوردستان بە ئاستی ئەو وڵاتانە گەشەی نەکردووە، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارودۆخە نەگونجاوو نا هەموارانەی کە چەندین سەدەیە کورد پێ‌یدا دەڕوات، شەڕی بێ پسانەوە، سەرکوت کردنی خوێناوی ڕاپەرین و شۆڕشەکان کە بۆتە هۆی وێران بوونی وڵات و چۆڵ بوون و دابەزینی توانای بەرهەم هێنان).

هۆکـاری خڕۆکـەی نـاوەوە، نـاوڕۆك ڕۆلێکـی سـەرەکی دەبینێـت لـە جەسـتەی پێکهاتـەی کۆمەڵایـەتیدا، دیـارە کۆمـەڵگای کوردیـش هـەر لەناوەوە ئەو خڕۆکانە ڕۆڵی بە ئۆرگان بوونی خۆی جێبەجێنەکردووە، بۆیـە ئـەو پێکهاتەیـە بەشـل و شـێواوی و شـەق و شـڕی ماوەتـەوە و بەناویەکدا چووە و پتەوی بە خۆوە نەدیوە، وەك هێلکەی کاڵ و شل و دەڵەمـەیی بـووە، ئەمـەش کاریگەریـەکی وای کـردووە کـە دەسـەڵاتە جیاوازەکانی نێو کۆمەڵگای کورد زۆر لاواز لە دایك بێن و لە سنوورێکی جوگرافـی تـەنگدا پـەنگ بخۆنـەوە و ڕۆڵـی خۆیـان نـەبینن و هـەر لـەو بازنەیەدا بەبێ ئاڵ و گۆڕ بخولێتـەوە و لـەناو خۆیـدا لـول بخـوات بـێ ئـەوەی تێکـەڵ یـان ئاوێتـەی یـەکدی بـن، دواجـار بـیر لـەودیو گـردی جوگرافی نەکەن و تەنها بەردەمی خۆیان ببینن و کە ئەمەش بە درێژایـی مێژوو بە کەسایەتی‌یەکی سرك و لەهەمان کاتدا لوت وشك و کرچ و کاڵ لـە قەڵـەم بـدرێ و تـاوای لێهـات کـە بـیر لـە دەسـەڵات و دەوڵـەتیش نەکرێتەوە، دیارە دەمارگیری خێلەکی تەسکبین ڕۆڵـی گـەورە دەبینـێ بۆ دروست کردنی کەسایەتی‌یەکی لـوت بـەرز و خـۆ بـەزل زان و لەهـەمان کـاتدا پێکهاتەیـەکی شـەق و شـڕی پێدەبەخشـێ (لازارییـف) دەڵـێ (بەرچاوترین خسوسیەتی کە لە سیستەمی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کورد بەدی دەکرێ، هێشتا مانـەوەی پـەیوەندی خێڵەکی‌یـە، کـە سیسـتەمی دەرەبەگایـەتی لـەژێر خۆیـەوە شاردۆتەوە، ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتیە کە

ڕێ و ڕەسمی مێژوویی هەیە بەناو جەرگەی کۆمەڵگەی کوردەواریدا شۆڕبونەوە و شوێن پەنجەکانی بە ئاشکرا لەسەر ژیانی گشت گەلی کورد و هەر تاکێکی کوردیش دیارە، بۆ کورد سەر بە عەشیرەت بوون واتە هەستی خێڵەکی لە پێشەوە دێت وە لە پێشەوەی وشیاری نەتەوەیی و ئایینی دێت، ئەمەش مەبەست پێکهاتەی کلاسیکی کوردەواریە)، کۆمەڵگای کورد هەر لەژێر ئەو دەسەلاتە بستە بالآیانەدا (Certinism) (کوڵە بنە چەشنێکن لە چەشنەکانی دواکەوتنی هۆش) کە ئاغا و شێخ و دەرەبەگ بۆ خۆیانیان دروست کردووە لە هەمان کاتدا بە گۆشە گیری ماونەتەوە لە نێو دەرووبەرێکی ئاڵۆز و جوگرافیایەکی لێك دابڕاودا بە خێوکردن و نەشیان هێشتووە کەسێك لە پێشیانەوە بێت، سەرەڕای ئەوەش پێکهاتەی ئەو شێخ و مەلا و دەرەبەگانە پێکهاتەیەکی تەواو نەبوون سەد دەر سەد بەڵکو پێکهاتەیەکی دروست کراوو بوو زۆر جار پێکهاتەیەکی دوو جەمسەریی دەدا بە دەستەوە یان سێ جەمسەری، وەك (ئاغا شێخیسش بوو) یان (مەلا ئاغا و مەلاش بووە و سەرکردەی ڕاپەڕینێکی بەدەستەوە بوو) هەر بۆیە پێشکەوتنی چینی هوشیار بە زەحمەت دەبێت چونکە سیستەمی پێشوی کاڵ و کرچ بووە و کامڵ نەبووە، کە ئەنجامی ئەوانەش خراپ کەوتەوە بۆ کۆمەڵگای کوردەواری و بزوتنەوەکەی، سەرباری ئەو هەوڵ و کۆشش و خەباتە خوێناویەی کە لە مێژووی ئەم سەردە و چارەکەی رابردوودا بەردەوام بووە، کورد لە

لایـەك لـە رووی گەشـەی كۆمەڵایەتی‌یـەوە وەكـو پێویسـت گەشـەی نەكردووە و شێواندنی باری گەشەی سروشتی ئەم كۆمەڵگایـە بە هۆی فاكتەری داگیركردن و دابەش كردن و هۆكاری ئـابووری و جوگرافـی و ئەتنودیموگرافیـەوە كە هۆیـەكی سەرەكی بووە كـە رۆحـی كۆمەڵایـەتی كۆمەڵگا نەتوانێت وەكو پێویست لە پرۆسەی جوڵەی بڵند بووندائازادی و بوونـی خـۆی بـە دەسـت بـهێنێت و لـەو ئاستەشـدا لـە ڕووی گەشـەی هوشیاری‌یەوە دەوڵەت دروست بكات، یان هـەوڵی بۆ بدات، سـەرەڕای هۆكـاری سـەرەوە هۆكـاری ناوەوەیشـی نـەزمێكی تاڵـتر دەدات بـە دواكەوتنی گەشەی سروشتی كۆمـەڵگای كـوردی ئەویش خـراپ بوونـی پـەیوەندی خوێـن و دەمارگـیری لـە نێـو گەوهـەری پەیوەندیـەكانی هـەر خێڵێكدا دەبێتـە هـۆی هـەرەس هێنانی ئـەو خێڵـە و پاشەكشـەكردنی لـە پڕۆژەی عەمران دا واتە ئاوەدانكردنەوە، دەتوانین ئـەو هۆكارانـە دەسـت نیشان بكەین كە بووەتە هۆی روخاندنی پێكهاتەی كۆمەڵگای كورد:-

١ داگیركردن و دابەش كردنی كوردستان.

٢ شوێنی گرنگی كوردستان لـە ناوچەكـەدا كـە دوژمـن سـوودی لێوەردەگرێت.

٣. شەڕی درێژخایەنی هۆزەكان + شەڕی ناوخۆ.

٤. ئاسـتی نزمـی هوشـیاری تاكەكەسـی كـورد بـە تایبـەت دەسەڵاتداران.

٥. مانەوەی پەیوەندیە کۆن و بەسەرچووەکان.

٦ کۆچپێکردنی بە زۆر و نیشتەجێکردنی عەرەب + تورك + فارس ئەمەش زیاتر کوردی پەرتەوازە کردو پێکهاتە کۆمەڵایەتی‌یەکەی تێك شکاند.

٧ رووخانی ژێرخان و سەرخانی ئابووری کوردستان.

٨. تێنەگەیشتن لە رەوتی، یان قوناغی مێژوو.

٩. لەدەست چوونی هەلە مێژوویی‌یەکان.

١٠ دەمارگیری هۆزەکان (ناوچەیی) و پەرستنی تاکە کەسی بودەڵە و باوەڕکردن زیاد لەڕادە بە تاکە کەس.

١١ دووری یەکەکانی کۆمەڵگای کورد لە یەکتری بە هۆی باری جوگرافیاوە. لەو تێڕوانینانەی سەرەوە و لە هەناوی ئەو پێکهاتە تێك شکاوەدا کە نەتوانراوە دەسەلات یان دەوڵەت یان باوکێك دروست ببێت تەنها دەسەلاتە بستەبالاکان سەریان هەڵداوە و لە ماوەیەکی زۆرکەمدا نەماون و تەنانەت ئەو ناوچەیەشی کە بە دەستیانەوە بووە یان لە ژێر دەسەلاتیاندا بووە لێیان سەندراوەتەوە یان لە دەستیان چووە، هەر بۆیە دەتوانین دەسەلاتەکانی کورد لە نێو کۆمەڵگادا لە ژێر چەند دەسەلاتێکدا یان چەند دەسەلاتێکی میرنشینێکی بچوکدا دیاری بکەین و لەوێشەوە رۆح و پێکهاتەی سەرکردەی کورد. بخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە، دەسەلات لای کورد دەکرێن بەسێ بەشی سەرەکیەوە:-

١. دەسەڵاتی هۆز
٢. دەسەڵاتی میرنیشینەکان
٣. دەسەڵاتی شێخەکان

دیارە سەرهەڵدانی سەرکردەیەکی کورد یان باوکێکی کورد لە نێو ئەو پێکهاتە ئاڵۆزەدا شتێکی بەدەرنابێت لەو واقیعە تاڵە و هەر ئەوە پێویست بووە بۆی، لەوەش زیاتر زۆر جار گەوار نەکراوە، هەر بۆیەش سەرکردە یان دەسەڵات دەسەڵاتێکی شکست و خۆ بەدەستەوەدەر و ناتەواو و نەخۆش بووە، هۆکار هەر ئەوەنیە کە دەرەوەی کوردستان ببێتە هۆی تێك شکاندنی ئۆرگانەکانی کۆمەڵایەتی و دەسەڵات، بەڵکو زۆرجار سەرکردە رۆڵی ناجێگیر بوونی ئەو پێکهاتەیەی بینیوە و زیاتر کۆمەڵگای کوردی نامۆ و ناثارام کردووە، هەروەها رێنەدراوە کە مێژوو رۆڵی سروشتی خۆی ببینێ لەجێگیربوونی ئەو پێکهاتەیەدا کە لەگەڵ رەوتی گۆڕانی کۆمەڵدا رێك دەکەوێ، واتە کورد هەمیشە لەدەرەوەی مێژوو بووەو خۆی لە دەرەوەی مێژوو کاری کردووە ئەمەش پێچەوانەی رەوت و قۆناغی گەشەی مێژووە، بە تایبەتی دەسەڵاتی کلاسیکی کە رۆڵێکی دواکەوتوویی بینی لەو نێوەندەدا، سەرەتای سەدەی نۆزدە لەو سەردەمەدا کە بە چەرخی زێڕینی فیودالی کوردی و چەرخی گەشەکردنی فەرهەنگ و کولتور زانراوە، کورد پەنجەرەی کراوە نەبووە بۆ سەر جیهانی دەرەوە، میرە کوردەکان لەبەر پاراستنی تەخت و تەلار

ئاسۆی بیریان لە سنووری ناوچەی دەسەڵاتی خۆیان تێنەپەڕیوە و هەمیشە دوور بوون لە پایتەختەکانەوە و هیچکات بیریان لەوە نەکردۆتەوە لە ژێر یەك دەسەڵاتی چەقی کوردستانیدا خۆ کۆبکەنەوە، بەڵکو هەردەم (لەناو میرنیشینی خۆیاندا) بۆ پاراستنی تەختی دەسەڵاتی خۆیان جەنگیون، بێ سەرۆك هۆز کەس بۆی نەبووە هیچ شتێك بکات ئەمەش وای لە تاکە کەس کردووە کە دەرەوەی خێڵ نەبینێت و دیوارێك دروست ببێت لە نێوا ئەوان و جیهانی دەرەوەدا، ئەنجام دووبەرەکی و خۆ بەزل زانین و دەمارگیر سەرۆك هۆزەکان و بیروبۆچونی خێڵایەتی تەسك وای کرد سەدەی نۆزدەهەم سەدەی شۆڕش و بزوتنەوەکانی کورد شکست بهێنێ و تەنانەت لەسەرەتای سەدەی بیست هەمیش نیوەی سەدەی بیستهەم بیر لە بزوتنەوە و شۆڕش نەکرێتەوە، هەر ئەو هۆکارە زەقانە وای کرد کە هوشیاری نەتەوەیی لای خەڵکان بێ هێز بێت و بەلاوازی بمێنێتەوە لە پرۆسەی بوون بە نەتەوە و بوون بە دەوڵەت گوێی پێنەدرێ و درەوەش بایەخی پێنەدات، تاوای لێ هاتووە لەگەڵ لەناوچوونی سەرکردەی کلاسیکی هەر بزوتەوەیەکدا ئەو هەرەمە پێکهاتەیە رماوە و هەرەسی هێناوە، دیارە سەرکردەی کلاسیك باو دەتوانێ رۆڵی گەورە ببینێ لە دەرەوە و ناوەوەی کۆمەڵگادا بە تایبەتی لە ڕووی (مێژوویی و هەستی نەتەوەیی)یەوە بەلام لای کورد ئەو رۆڵەی نەبینی وەك لەسەدەی

ناوەڕاستدا بینرا، تەنها بەرژەوەندی تایبەتی و بنەماڵە یان خێڵ و هۆزەکان لێك دراوەتەوە و لەسەر و هەمووشتێکەوە دایان نابوو، (مارتن فان برونەسن) دەڵێ (هۆزە کوردەکان بەو پلەو قۆناغی گەشەکردنە نەگەیشتوون کە بیانگەیەنێتە ئاستی دەوڵەت بەڵکە لەگەڵ گشت جوداوازیەکاندا خۆیان لە خۆیاندا قوتکراوەی دەستی وولاتانی هاوسێیانن) دیارە بۆ کورد سەر بە هۆزبوون لەسەر هەموو شتێکەوەیە تەنانەت نەتەوە و زۆرجار دینیش کە ئەمە بە خسوسیەتێکی دەمارگیری تەسك سەیر دەکرێ، (لازارییف) دەڵێ (پێشان ڕاپەڕینەکان خێڵەکی بوون سەرکردەکان دەرەبەگ و شێخ بوون (زۆرجار هەردوو سیفەت لەیەك کەسدا کۆدەبووەوە) کەمیان لەوانە توانیویانە ببنە پێشەوایەکی هاندەری زۆر یا بەرژەوەندی تایبەتی بوو ئەو ڕاپەڕینانەی بە شێوەی ڕەمەکی کە هەڵدەستا بە پشت بەستن بە خزم و تیرە و عەشیرەتە هاوپەیمانەکان، بە خێرایی شوێنێکی فراوانی دادەگرت و بەهەمان خێرایش دەنیشتەوە جا یا لە ژێر زەبری هێزەکانی حکومەت یانیش بە فەرمانی سەرکردەکانی ڕاپەرینەکە لەگەڵ ڕژێمدا ڕێك دەکەوتن ئەو ڕاپەڕینانە نەبوونە ڕاپەڕینی جەماوەری توند و تیژ و بە تەوژم دیارە ئەو جووڵانەوانە بە ئاسانی بەکاردەهێنران و نەسەربەستی و نەسەربەخۆییان بۆ کورد وەدەست نەهێنا)، تەنها فەرمانڕەوایەتی ئەیوبیەکان سەرکردە ڕۆڵی خۆی بینی ئەویش (صلاح الدین الایوبی)

بـوو کــه فەرمانڕەوایــەکی کوردانــە نــەبوو بــەڵکو فەرمانڕەوایــەکی موسـڵمانانە بـوو، دیـارە بـاری کۆمەڵایـەتی گوزەرانـی کـورد بەرهــەمی پەیوەندیە پەترپاکییەکانی (باوکسالاری)یەکانی نێو هۆزەکانە، هۆزەکان لەلایەن سەردارەکانیانەوە بەڕێوە دەبرێن و ئەمانە دەسەلاتێکی یەکجار زۆریان بەسەر ئەندامانی هۆزەکەیاندا هەیە و وەکو باوبوو ئەم سەردارانە هەمیشـە ئـەندام و رۆڵـەی بـەهێزترین و دەسـتڕۆیوترین بنەماڵـەی ئــەو هـۆزەن ئەگـەر ئـەندامی ئـەو بنەماڵەیـەش نـەبن ئـەوا بـە رێگـەی ژن و ژنخوازییــەوە ئــەو پایــە و پلەیــە بــە دەســت دەهێنــن لــە کۆمــەڵگای باوکسالاری وادا دەسەلاتی ئاینی هەمیشە بەشێوەیەکی تونـد گرێـدار وە بە ئەرکـەکانی بەڕێوەبردنـەوە ئـەو سـەرەك هۆزانـەی کـە دەسـەلاتی ئاینیشیان لە دەستی خۆیاندا کۆ دەکردەوە ئەوا یەکجار بەهێز و خاوەن دەسەلات دەبوون، واتە دینیان خستۆتە خزمـەت دەسەلاتی تاکەکەسی خۆیانەوە بەلام سەرەڕای ئەوەش نەیانتوانیوە بگەنە ئامانجە نەتەوەیی و کۆمەلایەتی و نیشتمانیەکان (ئەگەر سەرنجی کۆمەڵگای کوردی بدەین بە درێژایی مێژوو گرفتی هەرە سەرەکی نەبوونی سـەرکردە یان سـەرۆك یـان ڕابەر بووە کە زیاتر مەبەست باوکی نەتەوەییە کـە بـێ چـەند و چوون ئەو باوکەش باوکی رۆحی دەبێت، کاتـێ بـاس لـە سـەرکردە و ڕابـەرە دەکرێـت یـان بـاوکی رۆحــی راسـتەوخۆ باســی دەســەلات و دامەزراوی دەسەلات دەکەین، ئەو دەسـەلاتە کوردیـە زۆرجار ناوچەیش

نەبووە بۆیە هەمیشە دەسەڵاتی کلاسیکی ی کورد بێ گیان و لاوازبووە و زەویـەکی زۆر تەسـکی گرتۆتـەوە یـان بنەماڵەیـەکی گرتۆتـەوە یـان هێزێکی کەم ئەندامی گرتۆتەوە کە سەرخان و ژێرخانی دەسەڵاتی هـی خـۆی نـەبووە و بـەڵکو هـی دەرەوەی خـۆی بـووە و بەرامەبەرەکەشـی هەمیشە لـە دەرەوەی خـۆی بینیوەتـەوە و بـە دوژمنـی خوێنـی خـۆی زانیـەوە) تا ڕادەیـەك توانیویانـە لە ژێر کاریگـەری دینـدا ناوچەیـەك یـان کۆمەڵێك بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە و دەسـەڵاتیان فراوان بکـەن، بەڵام نەیانتوانیـوە لـە ژێـر هـەمان کاریگـەردا دەسـەڵاتێکی فـراوان و جوگرافیایی دروست بکەن ئەویش مەسەلەی نەتەوە و دەوڵەتە واتە (لە هیـچ ڕێگایـەکی چـەمکی دەوڵەتیـەوە کـورد نـەیتوانیوە بگاتـە ئاسـتی دروستکردنی دەوڵـەت نە لە ڕێگـای ئاینـەوە نـە لـە ڕێگـای دەرکـەوتنی باوکی ڕۆحیەوە) ڕاستە مێژوو دەرفەت دەدات کە سەرکردە سەر هەڵدات لە بارو دۆخێکدا سـەرەڕای دروست بوونـی ئـەو دەرفەتـە بـۆ کـورد کـە بچێتـە نێـو مێـژووەوە و ببێتـە خـاوەن دەسـەڵات سـەرکردە کلاسـیکی و باوەکـان هەسـتیان بـەو دەرفەتـە مێژوویی‌یـە نـەکردووە و بایـەخیان پێنەداوە هۆکارەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ دەرەوەی کوردستان (کۆمـاری میللی مهاباد) جوانترین نموونەیە کە لە سەدەی نوێدا وەك دەسەڵاتێکی کلاسـیکی لـە نێـو کۆمـەڵگای کـورددا لـە دایـك بـوو، لـەوێدا مێـژوو شانسی‌دا بە سەرکردەی کورد مێژوو لەبار بوو دەرفەت درا بە کورد کە

مێژوویەك بۆ خۆی دروست بكات و دەسەڵاتێكی كوردی دروست ببێت و سەركردەی كلاسیك رۆڵی خۆی ببینێ و خۆی لە مێژووی گشت نەتەوەكانی تردا جێگیربكات، بەڵام لاوازی هەستی نەتەوەیی و نا هۆشیاری رابەرایەتی كۆمار و تێنەگەیشتنی لەو دەرفەتە مێژوویی‌یەو نەبوونی كەسێكی بیر تیژ بۆ كۆمار لە جێی خۆیدا بووە هۆی ڕمانی ئەو كۆمارە و لە سێ دارەدانی سەركردەكەی، لەوێوە بۆمان دەردەكەوێ كە دەرەفەت وەك پێویست رەخسا، بەڵام ئامادەباشی كۆمەڵگای كورد لەوەدا نەبوو، سەركردەش ئەو رۆڵەی خۆی نەبینی لەو دەرفەتەدا، دووچاری دوو واقیعی تاڵ بوونەوە یەكەم هەڵهاتن و دووەم خۆ بەدەستەوەدان، دە عبدالرحمن قاسملو دەڵێ (زۆر پێویستە كەم و كورپییەكانی بزووتنەوەش بخەینە ڕوو. بە تایبەتی كەم توانایی سەركردەكانی، كەمتر هەڵكەوتنی كادری پۆلێیكی و سپایی و شارەزاوو دڵسۆز بە گشت مەودایەكیانەوە دیاربوو) یان دەڵێ (هەروەك دەبێت كارایی رۆڵی دەرەكی لەبیر نەكەین) واتە رۆڵی دەروە لە روخاندنی (كۆماری میللی مهاباد)دا رووسەكان بە ڕاستی كوردیان كردبووە داری دەستی خۆیان، بۆ چەند سەدەیەك كوردیان هەڵخەڵەتاند بەوەی كە بارودۆخ لەبارنیە بۆ ئەوەی كوردستان سەربەست بێت، (كاربەدەستانی سۆڤێت زۆر بە راشكاوی بە قازی محمد و نوێنەرانی تری كوردیان وتبوو كە ئەوان باش لە نەتەوە بچووكەكانی جیهان دەڕوانن، بەڵام هێشتا كات بۆ سەربەستی

گشتی کوردستان لەبارنیە لەبەرئەوە کوردەکـان دەبێـت چـاوەڕێ بـن)، کاتێکیش کە کوردەکان وتبوویان دەیانـەوێت بە مافی نەتـەوەی خۆیـان بگەن (باقرۆف) پێکەنینی هـاتبوو وتبـووی (ئێـوە نـاتوانن دەوڵـەتی جیـا دابمەزرێنن)، ئەوەندەی کورد بۆ روسیای کرد، ئـەوەندەی شـەهید دا لـە پێنــاو روســیای قەیســەری و روســیای پرۆلیتــاردا، بەلشــەفیەکان ئەوەندەیان بۆ مۆسکۆ نەکرد، ئەوەندە سەرکردە کوردەکان بەوەفا بـوون بۆ روسیای دۆستی گەلـە چەوساوەکان!!، هیـچ نەتەوەیـەکی چەوسـاوە بەوەفا نـەبوو بۆ رووس تەنانـەت نـەوەکانی (سـتالین کـورد فـرۆش) بـۆ روس بـەوافا نـەبوون مـەلا مصطفـی لـە نامەیـەکدا کـە بـۆ (بـاقرۆف)ی (سکرتێری ك.ن.پارتی کۆمۆنیستی بەلشەفی– ئازەربایجـان)ـی رەوانـە کردبـوو زۆر بـە ئاشکرا دەڵێ (ئەگـەر سیاسـەت رێگـەی ئـەوەی نـەدەدا لەسەرمان هەڵبدەنێ، خۆ دەتوانرا بە چەك یاشتی تر یارمەتیمان بدەن، نەدەبوو ئاوا بمانفرۆشن و لەبەردەم شەقی زەمانەدا بە جێمان بهێڵن)، لە نامەیەکدا داوای لە باقرۆف کردبوو کە بە (باوکی گەلانی رۆژهەڵات ناوی بردبوو کە یارمەتی بدات چاوی بە (باوکی زەحمەتکێشان و گـەلان) واتـە (ســتالین)بکــەوێت، بــەڵام بــێ هیــوا ماوەتــەوە و لــەناو مۆســکۆدا پەرتەوازەبوون، وەك لە (نامە بۆ ستالین سەبارەت بە ئـەو هاوڕێکـانی لـە (فایلی زۆرتاییبەتی ستالین) ١٠ی شوباتی ١٩٤٩)دا دۆزراوەتـەوە، دیـارە تەنها چـاوی بـە خرۆشۆف کەوتووە و رێگە نـەدراوە چـاوی بـە سـتالین

بکەوێت، زۆربەی سەرکردەی بزوتنەوەکان هانایان دەبرد بۆ رووس بۆ رزگارکردنیـــان، وەك سمـــایل خـــانی شـــکاك، عبدالقـــادر شـــەمدینان، عبدالسلامی بارزانی، شێخ عوبەیدوڵای نەهری، شێخ مەحمودی نەمر، عبدولـرەزاق بەدرخان (لازارییف دەڵێت لە ساڵی ۱۹۰۱دا عـەبدولرەزاق پەیوەندی نهێنی لەگەڵ زینۆڤیـف هـەبووە)، تەنـها عبدولـرەزاق توانـی هوشیارانە بیر بکاتـەوە و داوای لە روسیا کرد کوردان فێری زانست و خوێنـدەواری بکەن، خۆشـی لـەو بـاوەڕەدابوو کـە دەبێـت گـەل ی‌کـورد هوشیار بکرێتەوە، ئینجا دەتوانرێت سەرکەوتن بەدەست بهێنرێت، لەبەر ئەوە کورد لە قۆناغێکی سەرەتایی کێویی پەرەسەندنی مێشك و ژێریـدا ماوەتـەوە هـەر بۆیە نزیکخستنەوەی گەلەکەمان لە روسیا ئەوپـەڕژین و شورەیە لەبەردەمیدا لادەبات، کە لە شارستانێتی دایبڕیوە)، دوای چەند مانگێك داواکەیان هێنایە دی، بەڵام لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕی یەکەمی جیـهانی رێگـەی لـەو کۆمەڵەیـــە و بەدیـهێنانی نەخشـــەکەی گـــرت و لەسـەرەتای شـــەڕدا کۆمەڵەکـە هەڵوەشـایەوە، (زنـار سـلوپی) دەڵێـت (بەدرێژایی ئەو چەند ساڵەی شەڕ تا شۆڕشی ئۆکتۆبـەر، هاریکارییـان لەگەڵ حکومەتی تـەزاریدا هـەبوو دوای ئۆکتۆبـەریش بە یـەکجارەکی بۆ تورکیـا گەڕانـــەوە، تورکـــەکان یەکســـەر بـــە گەڕانـــەوەیان عبدەولـــرەزاق بەدرخانیان گرت و بێدادگاکردنی لە زیندانی موسڵ لە سێدارەیان دا بەڵام سەید تەها و سمکۆ دەربازبوون) مێژوو شاهیدی ئەو رۆژگارانەن

که بەوەفایی کورد بۆ رووسیا دەردەخات (ن.اخالفین) دەڵێ (شەڕی ١٨٧٧-١٨٧٨) دەری دەخات کە نە پاڵە پەستۆ و زۆرلێکردنی سوڵتانی تورك و دەرەبەگەکان، نە زێڕی ئینگلیز کە بە لێشاو دەیڕشت، نەیانتوانی کورد بە دژی روسدا بکات و بەناوی جیهادەوە بەشداری پێبکەن تەنانەت ئەو کوردانەش کە خەڵەتێندرابوون بەشداری جەنگیان دەکرد بە دڵ شەڕییان نەدەکرد و لە یەکەم هەلدا ریزەکانی لەشکری تورکیان بەجێهێشت)، بێ وەفایی مێژووی رووس وای کرد کە شێخ مەحموودی نەمر لێیان راپەڕێت و پەلاماریان بدات لە خانەقین و لە سابلاخیش بە یەکدادان لە نێوان کورد و روسدا روویدابوو)، بەڵێ ستالین خەبات و خوێن و وەفایی کوردانی فرۆشت بە چەند کاڵۆنێ نەوت کۆمارێکی کوردی سەربڕی، دیاربوو کاڵ فامی سەرکردەکانی کورد لەوەدابوو کە دوی بەڵێنی دەرەوە دەکەوتن هەر بۆیە لە گەورەترین تەنگانەدا بەجێدەهێڵران و بێ کەس کوژدەکران، با سەرکردەکان لە کاڵ فامی سیاسەتی خۆیان بدوێن و دەڵێن (ئەویش لە وەسیەت نامەکەی قازی محمد یەکێکیان لەمەڕ ماڵ و منداڵی نوسیویەتی تیایدا هاتووە (بەو هەموو هۆیەوە کە لە ئیختیاری مندابو ئەگەر شەڕم کردبا رەنگ بوو تێنەشکێین بەڵام بۆ ئەوەی کە مەهاباد وێران نەبێت و بۆخاتر تێدا نەچوونی خەڵك شەڕمان نەکرد بەو هەموو ماشێن و هەلانەی کە لە ئیختیارمدا هەبووئەمتوانی لە مەهاباد هەڵبێم و دوو جاریش

لەوتارەكانی خۆمدا بە خەڵكی مەهابدم گـووت، ئـەمن دەمزانـی ئەگـەر هەڵبێم ئێرەش وەكو توریزی لێدەهات و تووشـی تـالان و بـڕۆ دەبـوو، ئەمن بە خەڵكم راگەیاند كە رەنگە بمگرن و بشمكوژن، بەلام بۆ ئەمەی ناموسی خەڵكی بپارێزرێت و تالان نەكرێت هەڵنایەم و خۆم بە قوربان ئێوە دەكەم، ئەوا من بە عەهدی وەفا ئەكەم و تا ئێستاش لە مێـژوودا نەدیتراوە كەسێك فیداكارییەكی وای كردبێت، هەڵبەتە لەسەر ئێـوەش پێویستە نیسبەت بە خزم و كەس و كاری من وەفادارین و تۆڵەی منیـش بسـێننەوە)، ئەمـەش دەقـی دوا ووتـوو وێـژی نێـوا پێشـەوا و مـەلا مصطفیيە (هەر لەبەر دەرگاكەی سەرجادەكە، مەلا مصطفی چووە پێش بەرێز پێشەواو فەرمووی:- (حەزرەتی پێشەوای فەرمانده -تكام ئەوەی كە لەگـەڵما لـە مـەهاباد دەربچێـت. ئەگـەر بەتـەنێ بمێنـم حـەوت سـاڵ ئالاكـەت لەسـەر سـەرم هـەڵدەگرم، مانـەوەت لـێرە مەترسـی لەدوایـە، حكومەتی ئێران لە سێدارەت دەدا) پێشەوا فەرمووی كە حكومەتی ئێران لە سێدارەم دەدا، بەلام من كە لە خۆشیدا لەگەڵ خەڵكی مەهاباددا بووم ئەوا لە ناخۆشیدا بە جێیان ناهێڵم، مردن و ژیانم لەگەل ئەواندایە، گەر ئێستا بە جێیـان بێڵم عەشیرەتەكانی مەهاباد بەردبارانمان دەكـەن، بـە كوشتنی خـۆم رازیـم نـەوەك مەهاباد وێرانـی ببینـم فـەرموو با بچـین بـۆ خانەقای نەهری.(مزگەوتی هەباس ئاغا) ئەگەر میللەت بیروڕای وابوو كە جێیان بهێڵم ئەوا مانعم نیە ئەگەر نا دەمێنمەوە تا لەشكری ئێران دێتە

ناو مەهابدەوە) پاشان رووی لە من کرد و واتە (عەقید بەکر کریم حەویزی) فەرمووی (ماشێنەکەی منیش بەرن و سوودی لێوەربگرن) ئەو کۆمارە گرنگترین دەرفەتی مێژوویی بوو بۆ کورد، بەڵام دەسەڵاتداران نەیانتوانی ئەو هەلە مێژووییە بقۆزنەوە، یان ببنە سیمبۆلێك بۆ بزوتنەوەکانی دوای خۆیان، کە دوایی وای لێهات مەترسەیەکی تر بخاتە سەر مەترسی‌یە مێژوویی‌یەکانی ترو لە دەروونی تاکەکەسی کورددا جارێکی‌تر بزوتنەوە سەر هەڵنەدات، گەر سەریش هەڵبدات ئەوا بە ناچاری سەر هەڵدەدات، وەك لەمەودوا لێی دەدوێین، هەر ئەو هۆیەش بوو وای کرد ستراتیژبگۆڕدرێ لە کۆمارێکەوە.. یان لە دەوڵەتێکی سەربەخۆوە بکرێتە داوای ئۆتۆنۆمی، واتە پاشە کشەکردنی ستراتیژی کورد، واتە شکستی بزوتنەوەی کورد، پاشەکشەکردنی دەسەڵات و کەسێتی کورد، چونکە مێژوو ناهوشیاری کۆمەڵگای لەهەرەمەوە سەلماندو کۆمەڵیش خۆی لەوەدا دەبینیەوە، چونکە ئەو دەسەڵاتەی پێ‌هەڵناسورێ و هەنگاویشی نەناوە بۆ دروست بوونی دەسەڵاتی کورد، قازی محمد خەم خۆری خەڵکی مەهاباد بووە، سیاسەت و سۆزی نەستی تێەڵاوکردووە، لەوێشدا دەردەکەوێت کە ستراتیژی رۆڵی نەبووە، سیاسەتێکی قووڵی تایبەتی و چەسپاوی نەبوو کزولاوازی و لێڵی هزری وای لێکردبوو (سۆز و نەستی) زیاتر زاڵ بێت بەسەر ستراتیژی دووریدا، هەر بۆیە ئەو بەرخودانەی لە جەستەیدا دروست نەکردبوو کە هەمیشە

دژی داگیرکـەر خۆبەدەسـتەوەدان و هەڵـهاتن بـێ و سـەنگەری مـردن و جەنگ بکرێ و دژی بجەنگێ تا دوا دڵۆپە خوێنی، دیاردەبوو بە شەهید بوونی لە نێو سەنگەری بەرگریدا رەورەوەی شۆڕش و مێژووی کوردی بەرە و پێشەوە دەبرد و رۆحێکی نوێی دەدا بە کەسێتی سەرکردەکانی دوا خۆی، (نەوشیروان مستەفا) دەڵێ (بە گەیشتنی هێزەکانی ئەرتەش و خۆ بە دەستەوە دانی قازی و سەرکردەکانی تری حکومەتی کوردستان بە تەواوی هەرەسی هێنا.. قازی محمد ئەیتوانی سەرکردایەتی جەنگی بەرگری بکات بە شێوەی (شەڕی جەبهەیی) وەکو چەند مانگی رابردوو لە جەبهەی سەقز کردبویان یا بە شێوەی (شەڕی پارتیزانی) وەکو لە سالآنی دووەم جەنگی جیهانیدا بوبو بە نەریتی خەباتی زۆر لە گەلانی ئەوروپاو ئاسیا دژی داگیرکەرانی نازیی و فاشیستی و ژاپۆنی یاخود ئەی توانی وەکو سەرکردەکانی ئازەربایجان رێگای هەلآتن بگرێ هەموو ئەو ریچگایانەی لەبەردەمدا کراوە بوون بەلأم لەناو هەموویاندا رێگای خـۆ بەدەسـتەوەدانی هـەڵبژارد)، سـەرکردایەتی لـە نێـو کـورددا سەرکردایەتی‌یەکی شپرزە و شڵەژاوە لە بچوکترین قـەیراندا سـەری لێدەشێوێ یـان دەگـیرێ و لـە سـێدارە دەدرێ یـان خـۆی دەدات بـە دەستەوە، ئەمەش پردی بە یەك گەیشتنی نێوان جەماوەر و سەرکردە دەروخێنـێ، سـەرکردەی کوردیـش خـۆی بـە لاواز دەزانـێ لەبـەردەم بچوکترین قەیراندا، گرێ کوێرەکەشی کە دەروونـی تەنگەتاو کردووە

ئەوەیە کە هەمیشە خۆی بەکەم دەزانێ یان بە بچووک خۆی دێتە بەرچاوو لە باوکدا یان لە سەرکردەدا خۆی نابینێتەوە چ بەرامبەر دەرەوە چ بەرامبەر ناوەوە، تاکەکانی کۆمەڵیش دووچاری هەمان نەخۆشی بوون خۆی لە (کوڕ)دانابینێتەوە بەڵکو خۆی لە (هەتیو-بێباوک)دا دەبینێتەوە کە هەمیشە چەپۆکی لەسەر بێت، زۆرجار لە خزمەتکارێکی کلۆڵدا خۆی بە باشتر دێتە بەرچاوو خۆی دەبینێتەوە، وا هەست ناکات کە دەبێ ئازاد بێت، وەك کەسانی دیکەی دەرەوەی خۆی ئازاد بێت مافی هەبێت، وەك ئەوەی بە بەرگی بڕابێت هەر ئەوەیە و لەوەش زیاتر نیە بۆی، ئەمەش تەمەڵی مێشك و نازێری سۆز دەردەخات، لەوانەیە ئەم هەست پێکردنە هۆکارەکەی ئەوە بێت کە کورد دوای رووخاندنی دەوڵەتی ماد وای لێهاتبێ تووشی ئەو نەخۆشییە دەروونیانە بووبێت، (عبدالرقیب یوسف) لە کتێبی (تابلۆکانی شەرەفنامە)دا دەڵێ (جا نەبوونی دەوڵەتێکی کوردی لەو کاتەوە بە پلەی یەکەم لەبەر سستی و بێهێزی بنیاتی نێو خۆی کورد خۆی بووە، هەتا کەریم خانی زەند کە هەموو ئێرانی داگیرکرد، نەك هەر دەوڵەتێکی کوردی دانەمەزراند، بەڵکو خۆیی بە شایانی ئەوە نەزانی ناسنامەی (شا) لە خۆی بنێت و نازناوی (وەکیل)ی لە خۆی نا واتە وەکیلی شا، لە کاتێکدا هیچ شایەك لە ئێران نەبوو، ئەوەبوو بە ڕەوای هەقی نەبینی خۆ بکاتە شای ئێران، ئەمە خاڵی بێهێزی دەروونی و کۆمەڵایەتی پیشان

دەدات کە لە ژێر دەستی‌یەکی لە مێژنەی کوردەوە هاتووە بەڵام محمد ئاغا خانی قاجاری تورکمان کە جڵەوی حوکمی لە دەستی‌یەکی لە مێژنەی کوردەوە هاتووە بەڵام محمد ئاغا خانی قاجاری تورکمان کە جڵەوی حوکمی لە دەستی زەندیەکان وەرگرت (شا)یەتی خۆیی راگەیاندوە خۆی ورە بەرزبوو ئەگەرچی نێرە مووکیش بوو خۆی بە لایەقی پاشایەتی ئێران زانی بە پێچەوانەی ورەنزمی کەریم-خانەوە)، لێرەدا دەردەکەوێ کە شکستی دەروونی خۆ بە کەم زانین کەسایەتی سەرکردە دەرووخێنێ و وای لێ دەکات گەر قابیلی سەرکردایەتیش بێت لە رووی دەرفەتی مێژوویی‌یەوە خۆی بە شایانی نەزانێت، خۆی بە بچووك بێتە بەرچاو، لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەو دەسەڵاتە لە هەناوی کۆمەڵگای کوردیدا لەدایك نەبووە ئەگەر لەدایکیش بووبێت نەناریکی لەدایك بووە واتە زۆربەیان لەدەرەوەی کۆمەڵگای کوردیدا لەدایك بوون واتە لە دەرەوەی مێژوو کە دێنە ناوەوەی مێژووی کورد وای لێدەکات تووشی نەخۆشیەکی یان برینێکی کیمیاوی دەکات و هەرەمی دەروونی و دەسەڵاتی کوردی دەڕوخێنێ و دەرفەتە مێژوویی‌یەکەی تووشی شەلەل دەکات تا دەیکوژێ، سەرکردەی کورد بەرامبەر ئەو ڤایرۆسە کە دێتە ناوەوەی جەستەی مێژووەکەی، دژە ڤایرۆسی پێنیە، بۆیە ئەو ڤایرۆسە کوشندەیە مێژووەکەی رادەوەستێنێ و تووشی سەر ئێشەی مێژوویی تری دەکات، واتە باری زیاتر گران دەکات، ئەمەش لاوازی

دەسەڵات و سەرکردایەتی سەرکردەی کورد دەردەخات، کە بە خۆی رانابینێ ببێتە دەسەڵات، یان بتوانێت دەسەڵات بگرێتە دەست، هەر بۆیە دەسەڵاتی کوردی لەناوچەیەکی تەسکدا سەرکوت کراوە و یان بووەتە داردەست، لێرەشەوە دەتوانین بڵێین کە تەنانەت ئەو رەوتە مێژوویی‌یە وای کردوە کە (فریاد رەس) بۆ کورد لە نێو کۆمەڵگای کورددا دروست نەبێت، یان لە دایك نەبێت، یان کەسەری هەڵدابێت لە قۆناغێکدا کاری بۆ نەکراوە و کاری نەکردووە، یان کاری بۆ پەیام و دیسپلینی پەیامەکەی نەکردووە، یان شێوازی سەرکردەی کاریزمی سەرهەڵنەدات، کەواتە دەتوانین بڵێن مێژوو ئامادەبوو بۆ دروست کردنی دەسەڵاتی کوردی بەڵام سەرکردایەتی هیچ ئامادەبونێکی تیادا بەرجەستە نەبووە، ئەمەش کاریگەری لەسەر تاکەکانی کۆمەڵ کردووە و کە کۆمەڵ پەراتەوازە بێت و لە سنووری پێکهاتە سەرەتاییەکەشی دەرنەچێت و بە قەد قەبارەی پێکهاتەی خۆی نەکشێ بەڵکو هەر بە بچووکی ماوەتەوە، وای کرد کە گەورەترین هەڵەی مێژووی لێبکەوێتەوە کە نەوە دوای نەوە پێوەی بناڵێنێ، تا کار گەیشتە ئەوەی هیچ تاکێکی کورد متمانە بە سەرکردەی کورد نەکات و بە مەترسیەوە بڕواننە دەسەڵات و هەمیشە سەرکردە بە شێوەیەکی دی سەیر بکەن کە نامۆبن بەرامبەر خۆیان و یەکە کۆمەڵایەتی‌یەکانی کۆمەڵگای کورد، (دێرسیمی) دەڵێ (رێکخەرە لاوەکانی کورد پڕوپاگەندەیان بۆ سەربەخۆیی دەکرد لە

بارێك رابەرانی یاخی‌بوو تەنیا خوازیاری (ویلایەتێکی) خود موختار بوون ئەویش لەو ناوچەیەی کە دەستیان بەسەرداگرتبوو)، ئەمەش ئامادەبوونی کۆمەڵە بۆ سەربخۆیی و نائامادەیی سەرکردە دەردەخات بۆ سەربەخۆیی و گرێ دان بە خوازیارێکی کەمەوە، واتە کۆمەڵ لەسەرکردە هوشیارتر بووە و سەرکردەش لەو کۆمەڵگایە نەگەیشتووە، یان نەیانتوانیوە لەگەڵ ئەو هوشیاریەدا رێك بکەوێ، یان مەبەست خیانەت بووە یان بەرژەوەندی تاکەکەس بووە، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ لاوازی هوشیاری چینی رۆشنبیران کە نەیانتوانیوە ئەو رابەرانە راکێشنە نێو ئەو ستراتیژەوە، بەڵکو زۆرجار رۆشنبیران و پارتەکان زەمینەیان بۆ شۆڕشەکە ئامادەکردووە و دوایی سەرکردایەتیان داوەتە دەست پیرانی تەریقەت و مەزهەبەکان وەك کۆمەڵەی ئازادی و رۆشنبیرانی کوردی تورکیا کە سەرکردایەتیان دایە دەست شێخ سەعیدی پیران، لەو بۆچوونانەی سەرەوە دەتوانین بڵێین کە هوشیاری لای کۆمەڵگای کورد هەبوو بە تایبەت چینی ناوەڕاست نموونەش بۆ ئەوە دروست بوونی دەیان حزبی ناسیونالستی لە ژێر کاریگەری بیری ئازادی، سەربەخۆی... دیموکراتی... هتد، تەنها پارتی (خۆیبون) کە سیاسی و رۆشنبیران دایان مەزراند، رابەرایەتیان نەدا بە دەست سەرۆکە ئایینی و خێڵەکیەکانەوە ئەمەش یەکێك بو لە هۆیەکانی بەهێزی و تا رادەیەك درێژخایەنی راپەرینەکە، بەڵام پووکانەوەی هەندێ لەو حزبانەش یان

توانەوەیان لە نێو حزبەکانی تردا ئەمەش نا ئامادەیی سەرکردایتیان دەردەخات بۆ دروست کردنی دەسەلاتی کوردی، واتە ئەو ئامادەبوونە تەنها قسەبووە و کاری بۆ نەکراوە، قسەش هیچ ناگۆڕێ، کەواتە ئەو تیۆرەی کاری بۆ نەکرێت و کاری پێنەکرێت لە پراکتیکدا جێبەجێنەکرێ بە مردوویی دەمێنێتەوە.

# ئاوڕدانەوەیەك بۆ دواوە

هەروەك لەوەوپێش روونمان كردەوە كەجۆرەكانی دەسەڵاتی كورد بەسیستەمی تاریكو جیادا رۆشتووە، دەسەڵاتی هۆز، میرنشینەكان، شێخ كەزۆرجار ئەوسێ دەسەڵاتانە لەیەك كەسدا كۆدەبونەوەو دەسەڵاتێكی ئالۆزی پێك دەهێنا، هیچیشیان لەو ئاستەدا نەبوون كەبگەنە سەركردایەتی تەواو، هەرچۆنێك بوایە دەیانتوانی لەژێر ئەو پێكهاتە كۆمەڵایەتیەدا (خێزان، خێڵ، عەشرەت) سیستەمی دەوڵەتی خێڵ، هۆز، عەشیرەت، دروست بكەن یان دروستیان بكردایە، كەواتە خوێنو دەماریگری كورد نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەو گەشەیە كەبتوانن دەوڵەتی خێڵ بۆ خۆیان دروست بكەن، هۆیەكەشی هەر خێڵە كەبەتەنیایی خۆی ژیاوە، سەرەڕای ئەوەش یەكپارچەیی هۆزایەتیان نەبووە كە ئەمە خەسڵەتێكی لاوەكیە، ئەوجا دابەش بوونو پەرتەوازەیی جوگرافی هۆز كارێكی گەورەی كردۆتە سەر لەتكردنی هۆز لەنێو

خۆیاندا، کەزۆربەی زۆری هۆزی کورد لەنێوان سنوورەکاندا لەت لەت کراون و لەئەمدیو ئەودیوی سنووری عێراق و ئێران و تورکیا دابەش بوون، ئەو هۆکارو پەیوەندیانە وای کردووە لەبری دروستکردنی دەوڵەتی سەرەتایی خێڵ کەدەبێتە ژێرخانی دەوڵەتی گەورە میرنشینان بەرهەم هێناوە کەئەمیش لەچاو دەوڵەتدا لاوازە، هەروەك (ڤان بروتین سن) دەڵێ (بەماوەیەکی نزیکی سێ ساڵی دوای لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی میرنشینەکانی کورد (١٨٤٧-١٨٨٠) کوردەکان چ لەنێو قەڵەمڕەوی حکومەتی عوسمانی یان لەنێو خۆیاندا کەمتر لێك نزیك بوونەوەو کەمتر توانایان رووەو پێکهێنانی حکومەتێکی تایبەت بەخۆیان بچنە پێش، بەڕای ئەو لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی میرنشینەکان جگە لەحکومەتێکی راستەوخۆ مانایەکی دیکەی نەبوو و لەرووی گەشەساندنی کۆمەڵایەتی یەوە بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی بەهێز هەنگاوێك بۆ دواوە بوو مەیل بۆ حکومەتێکی هۆزایەتی لەوە بەهێزتربوو) دەمارگیری هۆزایەتی لەسەر هەموو شتێکەوە بوو، بزوتنەوەی شێخ و مەلاو میرە کوردەکان لەژێر کاریگەری رەگی هۆزایەتی یەوە دەکرا، تەنانەت بزوتنەوەی شێخ و مەلاو میرە کوردەکان لەژێر کاریگەری هۆزو ئاینەوە دەکرا، خاڵی بادانەوە لەژێر کاریگەری ئەو سیتستەمەدا شۆڕشکەی شێخ سەعیدی پیران بوو کەشۆڕشەکەی کردە شۆڕشێکی نەتەوایەتی و کەمێك هۆشی هاتەوە سەرخۆ هەروەك

خۆی دەڵێ (جاران خەلیفەیەکی هاوبەشمان هەبوو، ئەوەش وای لەگەڵە ئایندارەکان کردبوو کەهەست بکات دەتوانێت لەگەڵ تورکاندا لەیەك کۆمەڵگادا بژی، بەڵام لەوەتی خەلیفەیان لابردووە، تەنیا هەستکردنمان بەزۆرداری تورکان بۆ ماوەتەوە.. ئیسلام بناغەی یەکێتی نێوان کوردو تورك بوو.. تورکەکان پێشێلیان کرد، ئێستا پێویستە کوردەکان دوا رۆژی خۆیان دابین بکەن)، دیارە هۆزەکانیش خۆیان دەبردەوە سەر بنەماڵەی پێغەمبەرو واتە لەرووی رەچەڵەکەوە دەگەڕێنەوە بۆ پێغەمبەری ئیسلام، لەسەر بنەمای درەختەکانی بنەماڵە، ئەمە بەرژەوەندییەکی هۆزایەتی بوو بۆ دەست بەسەراگرتنی هۆزێکی دیکە یان دژە مەزهەبێکی دیکە وەك لەزۆربەی بزوتنەوەکان مەزهەبێك دژی مەزهەبێکی دی جەنگیوە، وەك لێدانی ئێزدی و قزڵباشەکان لەلایەن سەرۆك هۆزو میرنشینە کوردەکانەوە، ئەو دەمارگیری هۆزایەتی یە تا رادەی پێشگەیشتنی بەرز نەچووە پێشەوە بەڵکو هەمیشە بەرژەوەندی یەکان ئەو ئاواتەیان خنکاندبوو، هەڵوەشانەوەی میرنشینەکان و ئاکامەکانی زەمینەی خۆش کرد بۆ دەرکەوتنی شێخەکان وەك رێبەرانی سیاسی خۆش کرد، بەتایبەتی لەسەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەم (١٨٠٨-١٨٣٩) رێگای بۆ دەرکەوتنی شێخ عوبەیدوڵڵا وەك رێبەری نەتەوەیی خۆش کرد، واتە لەنێو چوونی میرەکان بووە هۆی بێسەروبەری رۆژ بەرۆژ دەگەیشتە رادەی پشێوی،

(جيرارد چالیان) لەساڵی ١٩٧٧دا دەڵێ بزوتنەوە چەکدارەکانی ساڵای ١٨٢٦-١٨٣٤-١٨٥٣-١٨٥٥-١٨٨٠ بەرابەری سەرەك خێڵە کلاسیکیەکان بوو، ئەو بزوتنەوە چەکداریە لەشێوەی جەنگی خێڵەکیدا بوون دژ بەزەبرو زەنگی دەوڵەت.. بەهیچ شێوەیەك سوودیان لەو ئایدۆلۆجیە نەتەوایەتیە مەزنەکەی سەدەی نۆزدەهەمی ئەوروپا وەرنەگرت بەزۆری سەرکردە کلاسیکیەکانیان بۆ پاراستنی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بەرەنگاری رژێم دەبوون، نەك لەرادەی ئامانجی هەرێم، یان بەگوێرەی رەوت و بۆچوونی رامیاری نوێ)، هەروەها شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران (کە یەکێك بوو لەشێخە گەورەکانی نەقشبەندی کە رێبەرایەتی شۆڕشی ١٩٢٥ی کرد) تەریقەی نەقشبەندی و شێخەکانی گرنگترین رێبەرایەتی یاخیبووە.. بوون.. ئەمە ئەنجامی پایەو پلەی ئاسایی.. ئەوان و ئەو رێزە بەرزە بوو کۆمەڵانی خەڵکی کورد لێیان دەنا شێخ سەعید گەورەترین و بەردەوام ترین یاخیبوونی سەربەخۆیی خوازانەی لەسەدەی بیستەم دا رێبەرایەتی کرد دوای مردنیشی چیرۆکی وابڵاو دەبۆوە کەدەیانگوت ئەو هێشتا زیندووە، رێبەرایەتی شێخ سەعید چاوەڕوانی مەسیحیایی و هەروەها سەربەخۆیی خوازانەی لەنێو پەیرەوکەرانی دا وورژاند.. سەرەڕای ئەوەش یاخیبوونی شێخ سەعید یاخیبوونێکی هۆزایەتی بوو دوایش بەسەرکوتی ناسیونالیزمی کورد لەتورکیا کۆتایی پێهات، کەواتە سڕبوونی بزوتنەوەی کورد خۆی

نیشانی دا کەشێخ سەعید مرد، (نەك هێشتا زیندووە) چونکە دوای ئەو هەوادارانی پەیامەکەیان بۆ نەچووە سەر کەواتە نەبوو بەرۆح تا زیندو بێت لەنێو رۆحی خەڵکدا، بەڵکو بەمردنی کۆتایی هات بە بزوتنەوەی ناسیونالیزمی کورد بۆ ماویەکی درێژ، واتە قۆناغی شۆڕشێکی دی یان جیاواز، هەروەها (شێخ مەحمودی بەرزنجی) کەیەکێکە لەسەیدە بەناوبانگەکانی بەرزنجە کەرەچەڵەکی خۆیان دەبەنەوە سەر ئیمام عەلی و فاتمەی ژنی لای سونەو شیعەش رێزێکی زۆریان هەیە، (ماریتن ڤان بدونەسن) دەڵێ (شێخ مەحموود، شێخی تەنها تینووی دەسەلاّت نا بەڵکە سەرکردەیەکی لەدڵو دەروون و باوەڕە نیشتمانپەروەرو سەرکردەیەك کە ئینگلیز قەت نەیبەخشی چونکە لەبریتی ئەوەی وولاّتەکەی تەسلیمی ئەوان بکاتو خۆشی خەریکی دەستکەوت چنینەوە بێت هەولێدەدا ئەوان بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی ئازاد هەڵسوڕێنێت)، ئەوەتا شێخ مەحمود دەڵێ (بەشێکی زۆر لەتەمەنم لەچیاو شالاخو ئەشکەوتو دەربەدەری و دورخستنەوە لەخاکی نیشتمانم بەسەربرد.. هەمیشە پێچەوانەی شەپۆل و گەردەلوول مەلەم کردوە.. لەهەرە قولاّیی دەریاکانا ژێر مەلەم کردوە.. هەمیشە پێشەنگی بازو هەڵۆ بوم لەراوی دوژمناندا.. گەرچی جێی داخە (دواکەوتویی گەلەکەم) بووە ئاستەنگ بەسەر شانمەوە..!).

بێجگە لەو سەرکردەی بزوتنەوانە بەدەیان سەرکردەی تر خەباتیان کردووە بۆ رزگاری نیشتمان، لای خەڵکانیش رێزو پایەی تایبەتیان هەبووە، بەڵام بەهۆی نەبوونی ستراتیژی دوورو خۆبەستنەوە بەهۆزو ئاینەوە هەروەها شەڕی لابەلاو دوژمنایەتی هەمیشەیی و گوێنەدان بەمەسەلەی نەتەوەیی، بووە ئەوەی زۆربەی بزوتەوەکان سەرکوت بکرێن و سەرکردەکانیان، یان لەسێدارە دەدران یان هەڵدەهاتن بۆ دەرەوەی کوردستان، (وادی جوەید) دەڵێ (دەرکەوتنی شێخەکان وەك رێبەرانی نەتەوەیی لەنێو کوردان دا تەنیا لەبەرئەو رێزە نەبوو کە بەهۆی تایبەتمەندی پلەی ئایینییەکەیان هەیانبوو، بەڵکو بەم مانایە کەدوای لەناوچوونی پلە ئایینییەکەیان هەیانبوو، بەڵکو بەم مانایە کەدوای لەناوچوونی میرە گەورەکان لەنێو کەسانی ئایینیدا کەس نەبوو لەنێو خەڵکیدا رێزو دەسەلاتێکی وای هەبێ، ئاسانی قبووڵ کرانی شێخەکان وەك رێبەر لەلایەن کۆمەڵێ کوردەوە نیشاندەری نیازێکیشە کە ئەم کۆمەڵە بەپڕکردنەوەی بۆشایی دەرەنجامی نەبوونی میرەکان هەستی پێدەکرد)، دیارە باری کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتی سەرەك هۆزو پیاوە ئاینیەکان لەکۆمەڵگای باوسکالاریداو ناکۆك و دوژمنایەتی هەمیشەیی خێڵ و تیرەکان جگە لەئابووری هەمیشە گۆڕاوی هۆزە کۆچەرەکان هەموو ئەمانە هەلی باشیان رەخساند بۆ دوژمن کەزیاتر کوردستان بەوئاقارەدا ببەن و پیلان و بەرژەوەندییەکانیان جێبەجێبکەن، دوای شکستی

شێخو مەلاو ئاغاو دەرەبەگە کوردەکان لەبەرەو پێشەوەچونی بزوتنەوەی کورد، (ناسیونالیستی کورد لەکۆششی نوێسازیو دۆخ گۆڕانیدا ئەو دۆزی نەتەوایەتیەی پێشان ئاغاو سەرانی کلاسیك دەیانبینیو بەپێی بیروبۆچوونی خۆ لەجیهانو بارودۆخی رامیاری دەبزوان لەم دواییانەدا گۆڕاو بزووتنەوەی بۆرجوازی شوێنی گرت ئەمڕۆ وزەو دینامیکیەتی ئەو بوارە کەوتووەتە بەردەست وردە بورجوازی شارو لادێ ئاغای کورد کەزۆریان تا ماوەیەك لەمەوبەر رابەرێ رێزەکانی بزوتنەوەی ئازادیخوازی میللی بوون. بەربەرەکی داگیرکەر رێبازی پێ‌گۆڕین لەبەر ئەو نزیکبونەوەیان لەرژێمو رووکردنە بەرژەوەندی تایبەت ناوبانگیان لەناو کۆمەڵێ کوردەواریدا سووك بوو و سەرئەنجام بوون بە تەگەرە لەرێی گەشەو بەرەوپێش چوونی بزوتنەوەی نەتەوایەتی) دوور لەشۆڕشو ئاڵوگۆڕەکانی جیهان بژیو لەناوەوەی خۆی بەداخراوی بمێنێتەوە.

## باوکی کورد - دەسەڵاتی کورد

ئەو بزوتنەوەو راپەڕینانەی کراوە سەرکردەکانیان لەبەرگی شێخ، ئاغا، مەلا، دەرەبەگ، دەرنەچون و لەهەمان کاتدا جێگای دیاری کراویان هەبووە لەکۆمەڵگای کورددا وەك (سەرۆك، سەرۆك عەشیرەت، رابەری ئاینی، بەگ و بەگزادە) سەیر کراون، بەڵام دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکان ئەو رۆڵە گرنگەیان نەبووە لەهوشیاری کۆمەلایەتیدا، ئەمەش وای کردووە سەرجەم بزوتنەوەو راپەڕینەکانی کورد بەناوی تاکە کەسەوە ناوبنرێن نەك بەناوی نەتەوەیەکەوە یان چین و توێژێکی کۆمەڵایەتیەوە، بۆ نموونە بزووتنەوەی شێخ عەبدوڵای نەهری، سەید رەزای دەرسیمی، شێخ مەحموودی بەرزنجی، سمایل خانی شکاك، شێخ سەعیدی پیران، مەلا مستەفا بارزانی، واتە نەبوونی کەسایەتی‌یەکی گەورەی بەگزادە لەڕوانگەی کوردانەوە کارێکی سەیرو ناماقوڵ دەهاتە بەرچاو، چوکە ئەوان وەك نەوەی پێغەمبەران قەڵەم دەدران بەهۆی ئەوەی ئەوان سەر

بەتەریقەتی ئایینی‌یەکان بوون کەبەهێزترینیان قادری‌و نەقشەبەندین..
بەهۆی دەمارگیری هۆزی‌و مەزهەبی‌و ناوچەیی‌و بنەماڵەیی‌یەوە سیستەمی (شێخ، ئاغا، دەرەبەگ) کایەی دیکتاتۆری بستە بالأیان دەبینی لەبەرئەوەی هۆزەکانی هەمیشە لەگوماندا بوون بەرامبەر یەکرتی، هەروەها ئەوانیش بەهەمان شێوە لەگوماندا بوون، بۆیە خێلأیەتی کورد خێلأیەتی‌یەکی سەرەتایی توندو تیژ بووەو هەر لەو روانگەیەوە کەدەرەبەگی کورد دەرەبەگێکی لەرادەبەدەرو توندو تیژ بووەو رۆڵی دیکتاتۆری بۆ خۆش کراوەو خۆیشی پێی خۆش بووە ئەو دەورە ببینێ، حەزیشی لەفراوانی دەسەلأتەکەیدا کردووە تەنها لەناو جوگرافیای هاوخوێنیدا نەك لەدەرەوەی جوگرافیاکەی، ئەمەش وای کردووە کەدەوڵەتی خێل دروست نەبێت‌و نەشیتوانیوە توخمی دەوڵەت لەمنداڵدانیدا هەڵبگرێت، ئەم پەیوەندیانە خۆی لەی‌خۆیدا بنەمای سیستەمی لمی پەترپاکی دەدەن بەدەستەوە کە سەرکردایەتی لای کورد باوکسالاری بووەو رۆڵی تاکە کەسی ئامادەکراو دەکەوتە پێش رۆڵی دامەزراوە کۆمەلأیەتی‌یەکانەوە کە ئەم حاڵەتەش روخساری کۆمەڵگا دواکەوتووە سەرەتایی‌یەکانە، دیارە ئەو باوکسالاریەش کوێرانە بووەو نەگەشتۆتە قۆناغی سەرکردایەتی تەواویان قۆناغی کاریزمایی، واتە باوکسالاری لەدەرەوەی خێزان، یان لەناوەوەی خێزان بۆ تێکشکاندنی خێزان، کەهیچیان لەو دوانە بە باوکسالاری ناژمێردرێن، چوونکە

لەهەردووکیاندا هەر کۆمەڵگای کورد زەرەرەی کردووە، راستە لای کورد دەسەڵات هەبووە، بەڵام دەسەڵاتی رووکەش یان دەسەڵاتی ناتەواو تێك شکاو بووەو ئەو دەسەڵاتانەش هیچی باشی لێچاوەڕوان ناکرێ، تەنها پشێوی و سەر لێشواندن نەبێت، هەمیشەش لەخۆپاراستندا بوون، هەر کاتێکیش فشاری بەهێز لەسەریان بوایە خۆبەدەستەوەدان و هەڵهاتن باشترین چارەسەر بووە بۆیان، نەك بەرگری و سەپاندنی دەسەڵات، هەندێك لەو دەسەڵاتانە یان ئەو رابەرانەی رابەرایەتی بزوتنەوەکانیان کردووە خۆیان راستی ئەوە دەدرکێنن (درێرسیمی) دەڵێ (جودایی مەزهەب و بیروڕا لەنێو کورداندا زۆر یارمەتی تێ شکاندنی یاخی بوونیدا) (رۆبەرت ئۆڵسن لەکتێبی (راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران)دا دەڵێ: (رێبەرانی یاخی بوونی قۆچگیری لەنیسانی ١٩٢١ لاوازی ناسیونالیزمی کوردی بەرۆشنی نیشان دا رێبەرانی یاخی بوون خۆشیان وێڕای ژماردنی هۆیەکانی شکستو دانیان بەو لاوازییانەدا نا لەیەکێك لەهۆکارە گرنگەکانی (جوودایی مەزهەبو تایفەیی نێوان کوردان بوو).

مێژوو دەری دەخست کەباوکێکی رۆحی بۆ کورد پەیدا نەبووە کەببێتە رۆحو تێکەڵ بەئاوەزی تاکەکانی کۆمەڵگای کورد بێت هەر لەدوای زەردەشتەوە کەس نەیتوانیوە رۆحی مرۆڤی کورد داگیر بکاتو ببێتە

باوك بۆ كـورد هۆكارەكـانی دەتوانـین لـەم خالآنـەی خـوارەوەدا دیـاری بكەین:-

١-سۆزلای كورد نەبووەتە ئاوەزو لۆژیك بەڵكو هەر بەسادەیی ماوەتەوەو نەبووەتە (هەست).

٢-زۆرجار كۆمەڵگا ئامادە بووە بۆ بوون بەرۆح بەڵام سەركردە ئامادەیی تێدا نەبووە ببێتە رۆح و باوكی كۆمەڵگا.

٣-گەشەنەكردنی قۆناغەكانی كۆمەڵ و تێنەگەیشتن لەمێژوو.

٤-هەڵگیرساندنی شۆڕش و سەركردایەتی لەناچاریدا.

٥-دابڕینی كۆمەڵگا لەسەر كردەوە كە دوژمن بەم سیاسەتە هەڵدەستا بۆ لەنێوبردنی یەككگرتن لەنێوان تاكی كوردو سەركردەدا.

٦-شكسـت هێنـانی دەروونـی تـاكی كـورد لــەدوای نـەمانی دەوڵــەتی مادەوە.

## سەرچاوەکان:

١-حکومەتی کوردستان و کورد لەگەمەی سۆڤێت - نەوشیروان مستەفا/ ١٩٩٢،
٢-تابلۆکای شەرەفنامە/ عبد الرقیب یوسف - چاپی دووەم/ ١٩٩٨
٣-ئەو هۆکارانەی مەسەلەی کورد پێك دەهێنن/ لازارییف/ سعد عبداللە کردوویە بەکوردی/ بێ مێژوو/.
٤-کوردو کوردستان/ ئەبو القاسمی لاهوتی/ د. جەبار قادر لەڕوسیەوە کردوویە بەکوردی و تێبینی بۆ نوسیوە/ هۆڵەندە ١٩٩٨
٥-چەمکی دەوڵەت و بزوێنەری مێژوو لەکۆمەڵگای کوردیدا/ عەتا قەرەداغی/ ١٩٩٩
٦-پەیوەندی نێوان کوردو روسیا (کوردستانی قەفقاز یا سۆڤێتی) ئارام علی ستوکهولم/ ١٩٩٩
٧-راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران/ رۆبەرت ئۆلسن/ وەرگێڕانی بۆ کوردی ئەبوبەکر خۆشناو/ ١٩٩٩

٨-ئاغاو شێخو دەوڵەت/ مارتن ڤان بورنەسن/ کوردۆ لەئەڵمانیاوە کردوویە بەکوردی/ بەرگی یەکەم/ چاپی سێیەم/ سلێمانی ١٩٩٩
٩-گەلێکی پەژمودەو نیشتمانی پەرت/ وەرگێڕانی لەعەرەبی و فارسییەوە م/ گۆمەیی/ لەئینگلیزیەوە/ حەوێزی -سوید ١٩٩٨
١٠- ستراتیژو کەسێتی نەتەوەیی کورد/ عەتا قەرەداغی/ سلێمانی ١٩٩٨
١١-دەروازەی گۆڕینی کۆمەڵ/ بەیاد عبدالقادر/ بغداد ١٩٨٧
١٢-مرۆڤ لەروانگەی مارکسەوە/ ئەریك فرۆم/ وەرگێڕ/ هەنگاو/ چاپی یەکەم ١٩٩٩
١٣-گۆڤاری نڤار - ژمارە (٢) ساڵی یەکەم هاوینی ١٩٩٨
١٤-گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی/ ژمارە (٢) ساڵی حەوتەم مایسی ١٩٩٩ سلێمانی.

## فاكتەرەكانى دروست نەبوونى دەوڵەتى كوردى

نەبوونى دەوڵەتێكى كوردى يان قەوارەيەكى راميارى بۆ گەلى كورد. كێشەو گرفتێكى گەورەى نەتەوەى كوردە. كەتا ئێستاش كورد خەباتى بۆ دەكاتو نەيتوانيوە بگات بەمافە رەواكانى خۆى. ديارە هەر لەدواى رووخاندنى دەوڵەتى (مادە)وە دەروونى كورد تووشى شكستى هاتووە بەرامبەر بەخۆىو بەرامبەر بەدەرەوەى خۆى. ئەوەش واى لێكردووە كەتووشى گرێكوێرەى مێژوويىو دەروونى بكاتو دواجار خاوەنى كەسێتى تايبەتى خۆى نەبێت، بەڵام كورد بێوچان هەوڵى داوە بۆ بەديهێنانى مافەكانى. ئەويش لەچوارچێوەى قەوارەيەكى راميارى وا كە مافى رەواى خۆيەتى وەك هەر نەتەوەيەكىتر. سەدەى نۆزدەم بيست بۆ كورد دوو سەدەى تاڵو تراژيدىو بێهوودە بوو لەنێوان داگيركردنو پەرتەوازەيىو دابەشكردن و خەڵەتاندندا نالاندوويەتى، كورديش

بۆئەوەی لەدەستی چووە هەمیشە بێئومێد نەماوەو هەوڵی داوەو شۆڕش و راپەڕینی کردووەو قوربانی داوە بۆ گەیشتن بەمافەکانی بەڵام تا کۆتایی سەدەی بیستەم نەیتوانیوە قەوارەیەکی رامیاری یان دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ خۆی دروست بکات، دەتوانین ئەو هۆکارانە دیاری بکەین کە بوونەتە هۆی دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردی:-

١-هۆکاری جیۆپۆلەتیك.

٢-هۆکاری ئابووری.

٣-هۆکاری کۆمەڵایەتی.

٤-هۆزی کورد.

٥-بزووتنەوەی کوردو رۆڵی سەرکردە.

٦-هۆکاری سەرکردایەتی.

٧-پەیوەندی نێوان تاکی کوردو سەرکردە.

٨-هۆکاری ناوخۆ.

٩-هۆکاری دەرەوە.

١-هۆکاری جیۆپۆلەتیك:

شوێنی کوردستان و بەشی جوگرافی سیاسی کوردستان کەوتۆتە خوارو رۆژهەڵاتی ئاسیا. بەهۆی هەڵکەوتوویی شوێنەکەی لەنێو چەند نەتەوەیەکی جیاوازدا کە هەمیشە چاویان بڕیوەتە شوێنی کوردستان.

هەر لەبەرەبەیانی مێژووەوە تووشی سیاسەتی دابڕانو پچڕبوون هاتووە، بەپێی شوێنەکەی کوردستان یەکێکە لەناوچە هەرە گرنگەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لەنێو جەرگەی ئەو مەڵبەندەدایە، بەدرێژایی مێژوو جێگەی سەرنجو چاوتێبڕینو تەماعی نەتەوەکانی دەوروبەری بووە (ئەگەر فاکتەری جیۆپۆلۆتیک دەورێکی کاریگەر یا کەمی لەبڕیاردانی چارەنووسی گەلاندا هەبێت، ئەوا لێکۆڵینەوەی مێژووی کۆنو نوێی نەتەوەی کورد بەئاشکرا دەریدەخات کە هەڵکەوتی جوگرافی شوێنی کورد لەسەر ئەم خاکە دەوری بەرچاوی هەبووە لەدیاریکردنی چارەنووسی رابردوو ئێستەدا) کوردستان لەمێژە جەمسەری نێو دوو سێ دەوڵەتە (ئیمپراتۆریەتی رۆمانیو بیزەنتیو عوسمانیو خەلافەتی عارەبانو ئێران). لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمو دووەم باری جوگرافی سیاسی کوردستان گۆڕاو کوردستان بەش بەش کرا. بەتایبەتی دوای جەنگی جیهانی دووەم کە کودرستانیان کردە چوار پارچە، بەم جۆرە کوردستان بەو بوویەرە جوگرافیەی هەیەتی بووە بەشێك لەژیانی ناوخۆییو پەیوەندی نێو دەوڵەتی (تورکیا، سوریا، ئێران، عێراق) بەوەش کوردستان تووشی لێك داپچڕانی جوگرافی، سیاسی، فەرهەنگی، نەتەوەیی بووە کە دواجار بووە هۆی شێواندنی جوگرافیای سیاسی کوردستانو نەبوونی سنوورێکی سیاسیو هەربۆیە ئاسان نیە بەوردی رووبەرە جوگرافیەکەی بزانرێت دیارە شوێنگەی

جوگرافی و جیۆپۆلەتیك كارێكی یەكجار زۆر گرنگ لەژیانی رامیاری کوردستان دەکات بۆیە دەتوانین بلێین مێژووی ئەو وڵاتە بە بەرهەمی ئەم فاکتەرە دادەنرێ.

کوردستان هەر لەسەدەی شانزیەمەوە هەتا جەنگی جیهانی گۆڕەپانی پێکدادانی هێزەکانی هەردوو ئیمپراتۆریەتی سەفەوی (ئێران) و عوسمانی بووە، گەورەترین جەنگێ لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا رووی دابێت جەنگی (چاڵدێران) لەساڵی ١٥١٤ی زایینی بوو، ئەنجامەکەشی ئەوەبوو (یەکێتی جوگرافی خاکی کوردستان بەتەواوی تێك چوو) بەشی رۆژهەلاتی کەوتە بن دەستی سەفەوییەکانو بەشەکەی رۆژئاواشی کەوتە ژێر دەسەلاتی عوسمانیەکانەوە، دواتریش ئەم بەشە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەکەمو رووخاندنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، جارێکی دیکە دابەش کرایەوە بەشی هەرە گەورەی بەر تورکیای تازە کەوتو بەشێکی دیکەشی خرایە سەر سوریا، ئەوەی کە ماشەوە (ولایەتی موصلّ) لەگەلّ لایەنەکانی بەغداو بەسرەدا، دەوڵەتی عێراقی ئەمرۆیان لێدروست کرد، کوردستان بۆ وڵاتانی ئیمپریالی رۆژئاوادا شوێنێکی گرنگی ستراتیژی هەیە، چونکە لەوێ را (واتە لەکوردستان)ەوە دەکرێ هەڕەشە لەسنووری خوارەوەی یەکێتی سۆڤیەتو هەندێك وڵاتی رۆژئاوایی ئاسیا بەهۆی ناوچەی شاخاوی کوردستانو پەیوەستی سنوورەکەی بەدەوڵەتە داگیرکەرەکانەوە وای

کـردووە بەتایبـەتی لـەڕووی بەرگرییـەوە شـوێنێکی گرنـگ بێـت و بـۆ مەبەسـتی تایبـەتی دوژمنـان بەکاربهێنرێ، دیـارە دوژمـن ئـەو شـوێنە شاخاویانەی بەکارهێناوە لـەڕووی سـتراتیژی و تـەکنیکی سـەربازییەوە دژی نەتەوەیـەکی دی، دەوڵـەتێکی دی، دیـارە هـۆی بوونـی کـانزای جۆربەجۆر بەتایبـەتی نـەوت و هـەندێ کـانزای‌تر هـەروەها تێپـەڕبوونی مـەزنترین دوو روبـاری رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت دیجلـەو فـورات کـە بەکوردستاندا تێدەپەڕی بێجگە لە دەریاچەکانی‌تر کە بایەخی ئابووری گرنگیان، هەیە تەنانەت کێشەی نێودەوڵەتی و بیکەنە هەڕەشە ئەم دژی ئـەو، ئـەو شـوێنە گرنگـەی کوردسـتان سـەرنجی خـەڵکی کوردسـتانی ڕانەکێشا بەڵام لـەم دواییـیەداو بەتایبـەتی لای داگیرکـەران بایـەخێکی یەکجار زۆری بووە بەتایبـەتی کە ئـەمڕۆ بـاس هـەر باسـی نەوتە، دیـارە زۆربەی چاڵە نەوتەکان دەکەونە سنووری خاکی کوردستانەوە، هەڵبـەت شوێنێکی وەها کە کورد بۆ خۆی درکی پێنەکردووە لەڕووی جوگرافی و گرنگی سیاسـیی‌یەوەو سـوودی لـی‌وەرنەگرتووە بـۆ مەسـەلەکەی، بـەڵام دوژمن زیرەکانە شوێنی جوگرافی سیاسی کوردستانی خستۆتە خزمەت خۆیـەوەو کوردسـتانی لـەڕووی جیۆپۆلەتیکـەوە کۆنـتڕۆڵ کـردووەو لـەپێناو بەرژەوەندییـەکانیدا بـەکاری هێنـاوەو نەیهێشـتووە بـەهیچ شێوەیەك کوردستان سنوورێکی جوگرافی سیاسی هەبێت.

**٢-هۆکاری ئابووری:**

ئابووری بەشێکی گرنگە بۆ ژێرخان و سەرخانی دەوڵەت و هۆکارێکی
کاریگەرە لەدیاریکردنی پێکهاتەی کۆمەڵ و سیستەم و پرۆسێسی
پێشکەوتن. کوردستان خاوەنی ئابووریەکی سروشتی و کانزایی یە
سەرەڕای چڕی دارستانی و دەریاچەکانی و شاخەکانی کە زیاتر لەنیوەی
تۆپۆگرافیای کوردستان پێک هاتووە واتە دوای نەوت و کشتوکاڵ
گەورەترین کەرتی ئابووری پێك دەهێنێ، سەرەڕای ئەو ئابووریە پێگەی
ئابووری کوردستان پێگەیەکی کۆنەو کاریگەری کردۆتە سەر کەمی
بەرهەم هێنان بەهۆی نەبوونی سیستەمێکی ئابووری جێگیر ئەمەش وای
کردووە کە ئابووری کوردستان سیفەتێکی تەقلیدی وەربگرێت، دیارە
ئابووری کوردستان وەك یەك بەڕێوەناچێت هۆیەکەی دواکەوتوویی
پیشەسازی یەو ئابووری کوردستان زیاتر لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییە
چونکە ئەو ناوچانەی نەوت و کارگەی پیشەسازی لێیە زیاتر دەکەونە بن
دەستی دەوڵەتە داگیرکەرەکانەوە، ئەو هۆیانە وای کردووە کە
دواکەتوویی پەیوەندیەکانی کۆمەڵایەتی ئێستای لێبکەوێتەوەو چینی
پیشەیی و هۆشیاری لەهەناوی بەرهەمی خۆماڵیدا لەدایك نەبێت، چونکە
کورد لەلایەن دەوڵەتە داگیرکەرەکانەوە دەچەوسێتەوەو درەنگترو
بەئاستێکی زۆر کەمتر لەنەتەوەی باڵادەست پێش دەکەوێت، چونکە
کورد لەلایەن دەوڵەتە داگیرکەرەکانەوە دەچەوسێتەوەو درەنگترو
بەئاستێکی زۆر کەمتر لەنەتەوەی باڵادەست پێش دەکەوێت، ئەو

ناجێگیری و پەرتەوازە ئابووریە کارێکی خراپی کردۆتە سەر کۆکردنەوەو یەك نەگرتنی گەلی کوردو چالاکی خەباتە سیاسیەکەی لەپێناو گەیشتنی بەمافە نەتەوەییەکانی گەشەنەکردنی ئابووری دەبێتە هۆی لاوازی هۆشیاری نەتەوەیی و دواتر دارمانی ژێرخانی ئابووری کەواتە دەتوانین بڵێین لەکوردستاندا پێشکەوتن رووی نەداوە لە ئابووریدا، بەوپێیە پێشکەوتن روونادات بۆ بیرکردنەوە لەدروست کردنی یان پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی.

٣-هۆکاری کۆمەلآیەتی:

بەهۆی پشێوی لاوازی باری ئابووری کوردستان و نەبوونی سیستەمێکی تۆکمەی ئابووری یان ئوتارکێکی ئابووری، هەمیشە باری کۆمەلآیەتی بەر لادان و پەرتەوازەیی کەوتووەو جێگیری بەخۆیەوە نەدیوە. بۆئەوەی پێکهاتەی کۆمەلآیەتی خۆی لەو قۆزاخە ئابووریە سەربەخۆیەدا دروست بکات کە کۆمەڵ تیایدا سیستەمی ئابووری خۆی تیا دروست دەکات و لەهەمان کاتدا گەشەی پێدەدات و دەشیپارێزێت، بۆیە کۆمەڵی کورد کۆمەڵێکی شل و شێواوو ناجێگیر دەبینرێت و کۆمەڵگای کورد نەبووەتە کۆمەلآیەتی، دیارە ئەوەی ناوچە کوردنشینەکانی پێی دەناسرێتەوە لەو ولآتانەدا نزمی ئاستی گەشەکردنی پەیوەندیە کۆمەلآیەتیەکانەو شێوەی پێکهاتەی کۆمەلآیەتی کۆمەڵگەیە؛ هەروەك چۆن ئابووری

کوردستان لە بەشە جیاجیاکان وەك یەك نییە ئاوەهاش پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەبەشەکانی کوردستاندا وەك یەك نییە بەهیچ جۆرێك هۆشیاری کۆمەڵایەتی بەئاستی وڵاتە داگیرکەرەکانی گەشەی نەکردووە. هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارودۆخە نەگونجاوو ناهەموارەی کەچەندین سەدەیە کورد پێیدا دەڕوات. شەڕی بێپسانەوە سەرکوت کردنی خوێناوی راپەڕینو شۆڕشەکان کۆچ پێکردنی بەزۆر پەرتەوازەو دوورخستنەوەی خێزانو هۆزی کورد بۆ ناوچەکانی دوور لەشارستانیەت، کە دواجار بووە هۆی وێران بوونی وڵاتو چۆڵ بوونو دابەزینی توانای بەرهەم هێنانو دووربوونەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان لەچوارچێوەیەکی پتەوو تۆکمەدا دروست نەبووە ئەو توێژانەی وەرنەگرتووە کەپێی بڵێن کۆمەڵ. کۆمەڵایەتی، کۆمەڵگای تەواو بەهۆی دووری کۆمەڵی کورد لەیەکترییەوە، ئەوەش لەژێر پیادەکردنی سیاسەتی پەرتکەو زاڵبە)دا بەڕێوەچووە کە دوژمن نەیهێشتووە دوو هۆز ببن بەیەكو یەکگرتن لەنێو کورداندا دروست ببێت، دیارە دواکەوتوویی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەی کوردستان لەسەر پێگەیەکی ئابووری کۆنو جێگۆڕکێ دامەزراوە، ئەمەش سیفەتێکی تایبەتی داوە بەئابووری تەقلیدی کوردستان، واتە ژێرخانی ئابووری پتەو دروست نەبووەو هەمیشە بەرلێدان کەوتووە، کوردستان لەڕووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیو تەنانەت نەتەوەییەوە وڵاتێکی یەکجار

ئاڵۆزەو بووەتە جێگەی چەند نەتەوەیەکی جیاجیاو چەند دین‌و ڕێبازێکی جیاجیا، ئەویش بەهۆی ڕێگەی هات‌وچۆگەرانی نێوان ئاسیاو ئەوروپا وا بووە واتە هەندێك لەو هات‌وچۆکەرانە لەبەر هۆی تایبەتی لە کوردستاندا جێگیرو نیشتەجێ بوون، دیارە (تەعریب‌و تەتریك‌و تەفریس کردنی ناوچەکانی کوردنشین ئەویش بەهۆی کۆچ پێکردنی کوردەکان لەزێدی خۆیانداو نیشتەجێکردنی نەتەوەکانی دی لەشوێنیان کەپێکهاتە کۆمەڵایەتی‌و نەتەوەیی‌یەکەی لەنێو بۆتەی ئەو بیانیانەدا لەدەست داوە بەهۆی جێگۆڕکری‌و ڕامالینیان نەتوانراوە ژیانی باری ئاستی کۆمەڵایەتی خۆیان ببینن‌و ببنە کۆمەڵگایەکی ڕێکخراوو تۆکمە کە بتوانن لەوێوە ئامادەباشیان تیادا بێت بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی، کوردستان بەدرێژایی مێژوو لەنێو داگیرکەراندا ئەم دەست‌و ئەو دەستی پێکراوە جارێك یۆنانیەکان‌و جارێکی دیکەش عەرەب فەرمانڕەوایی‌یان تێدا کردووە. دەمێ تورکە سەلجوقییەکان‌و دەمێکی دیکەش مەغۆلەکان دەستیان بەسەردا گرتووە. سەردەمێ نەتەوەکان و سەردەمێکی دیکەش سەفەوییەکان‌و عوسمانیەکان داگیریان کردووە دوای کۆتایی پێهاتنی دەسەلاتی ئەو فەرمانڕەوایانە هەموویان وڵاتیان چۆڵ کردووەو بەجێیان هێشتووە ژمارەیەکی کەمیان ماونەتەوەو بەتەواوی جێگیربوون‌و دواتریش بوون بەبەشێك لەدانیشتوانی کوردستان، ئەمەش بووەتە هۆی شل‌و شێواوی

پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵی کوردیو کە دواجار بەلاوازی ماوەتەوەو بەژێر دەستەییو کۆیلەتی رازی بووەو هەمیشە لەحاڵەتی بەرگریدا ژیاوەو نەتوانراوە کۆمەڵێکی یەکگرتوو بۆ پێکهێنانی یەکێتییەکی کۆمەڵایەتی سەربەخۆ. یان دروست کردنی دەوڵەتێك (ابن خلدون) بۆ ئەو حاڵەتە دەڵێ: (لە شارێکدا کەهۆزی زۆی تیا دا بێت یان کۆمەڵی جیاجیای لەخۆگرتبێ زەحمەتە بتوانرێ دەوڵەتێکی بەهێزی جێگیر دروست بکرێت) سیاسەتی دوژمن ئەوە بووە کوردێك دژایەتی کوردێکی تر بکاتو هۆزێك دژایەتی هۆزێکی دیکەو ئیمارەتێك دژایەتی ئیمارەتێکی دی بکات، بۆئەوەی لەجەنگدا بنو بیر لەیەکگرتنو پێکەوەژیان نەکەنەوە. بەڕاستی ئەو سیاسەتەی دوژمن لەکوردستاندا زۆر زیرەکانە پیادەکراوەو بەڕێوەچوو. سەرەڕای ئەوەش باری کۆمەڵایەتی کورد بەهیچ شێوەیەك گەشەی کۆمەڵایەتیو مێژوویی بەخۆوە نەدیوە تووشی بازدانی لابەلا بووەو لەکۆمەڵگای خۆی نامۆ بووە. کۆمەڵێکی پاشماوەیە لەکۆمەڵگای نیمچە دەرەبەگ واتە هێشتا ئەو پەیوەندیە کۆنە هەر ماوەو شێوە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی کورد پێك دەهێنێو لەو سیستەمەدا تووشی گێژاوی یان گرێکوێرەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاتی کورد بەدی دەکرێت هێشتا مانەوەی پەیوەندی خێڵەکییە کە سیستەمێکی دەرەبەگایەتی لەژێر خۆیەوە شاردۆتەوە ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتیە کە رێو رەسمی مێژوویی هەیە بەناو جەرگەی

كۆمەڵگای كوردەواریدا شۆڕبۆتەوەو شوێن پەنجەكانی بەئاشكرا لەسەر ژیانی گشتی گەلی كوردو هەر تاكێكی كوردیش دیارە بۆ كورد سەر بە عەشیرەت بوون واتە هەستی خێڵەكی لەپێشەوە دێتو لەپێشەوەی هۆشیاری نەتەوەیی و كۆمەڵایەتیو ئایینیەتی ئەمەش بارێكی سلبی كردۆتە سەر ژیانی كۆمەڵایەتی كۆمەڵگای كوردی كە كۆمەڵێكی سەرلێشێواوی سستو لاوازی لێدەربچێتو ببێتە كۆمەڵێكی داخراوی خۆخۆرو دەرەوەی خۆی نەبینێتو لە پرۆسەی گەشەكردنی كۆمەڵایەتی بێبەری بێت دوایش لەپرۆسەی بوون بەدەوڵەت بێبەش بێت.

٤- هۆزی كورد:

پێكهاتەی كۆمەڵگای كورد پێكهاتەیەكی خێڵەكی و ئاڵۆزەو لەناو چوارچێوەی سیستەمی دەرەبەگایەتیدا خۆی دەنوێنێتو پەلوپۆی هاویشتووە بۆ دەروونی هەموو تاكێكی كورد بەرچاوترین خاسیەتێك كە لەسیستەمی كۆمەڵایەتی كۆمەڵگای كوردی بەدی بكرێت هێشتا مانەوەی پەیوەندی خێڵەكی‌یە لەسیستەمی دەرەبەگایەتی لەژێر خۆیەوە حەشار داوە، مانەوەی ئەو پەیوەندیە كارێكی سلبی كردۆتە سەر كۆمەڵو شۆڕشی كورد، دیارە هۆز لەدروست بوونی كۆمەڵو هەرەمی دەوڵەتدا رۆڵێكی سەرەكی دەبینێ. كۆبوونەوەی هۆزەكان لەنێو خۆیاندا كۆبوونەوەی خوێنو نەسەبەو پێكەوە گرێدانی هۆزو سەرۆك هۆزەكانە.

هەر ئەو پەیوەندیە خوێنیيەیە کەسیستەمی هۆز بەڕێوە دەبات. لای هۆزی کورد ئەو پەیوەندیە خوێنیيە دروست نەبووەو برای خوێنی لەدایك نەبووەو لەبنەماڵەی هۆزداو کۆبوونەوەی خوێن و نەسەب پێك نەهاتووە بۆ یەکگرتنی هۆزەکانی کورد لەنێو خۆیاندا شێوەی (ئیتنکراسیۆنی- یەك نەگرتنی هۆز)ی وەرگرتووەو هەمیشە دوورکەوتنەوە لەیەکتری لەئارادا بووە.
تەنانەت زۆرینەی هۆزەکان ملیان بۆ رابەری بزوتنەوەیەکی کورد کەچ نەکردووە. لەبەرئەوەی لەهۆزی خۆیان نەبووە یان بەهۆی جیاوازی بیری ئایینی و مەزهەبیەوە یان سەر بەسنووری جوگرافیای هۆزایەتیيەکەیان نەبووە ئەمەش گرژی خستۆتە نێوان تاك و تاکی کورد/ هۆزو هۆزی کورد، سەرۆك خێڵ و رابەری بزوتنەوەکان/ ئەمەش واتەی پەرش و بڵاوی و گرژیەك لەپێکهاتەی هۆزدا دروست بووە، دیارە هۆی ناوخۆی باری هۆز دەگەڕێتەوە بۆ گرژی ناوچەکە واتە کوردستان کەناوچەیەکی شاخاوییە هۆزی کوردیش بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵەکانیان کەپیشەی سەرەکی لادێ نشینەکان و بەتایبەتی هۆزەکان، کە لەشوێنێکی تەسکی کشتوکاڵیدا ئاژەڵەکانیان بەخێو دەکرد، ئەمەش وای کردووە کەبەروبووم و بژێوی ژیانی رۆژانەیان کەم بێت بۆئەوەی بەرهەمی ئاژەڵییان زیاد بکات پێویستیان بەشوێنێکی فراوانە بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵەکانیان و بەهۆی سنوربڕینی هۆز لەپێناو بەخێوکردنی ئاژەڵدا

دەبووە شەڕو پێك دادان ئەمەش وای كرد كە هۆزەكان لەیەك دووربكەونەوەو گۆشەگیربن لەوێشەوە وای كرد كە پێكهاتەی هۆزی كورد بەداخراوی بمێنێتەوەو هەر هۆزێك بجەنگێ لەپێناو سنووری) هۆزی خۆیدا بۆ پێكهێنانی ئەو ئامانجە ئابوورییە، هۆزەكان چەكداریان دروست دەكرد بۆ پاراستنی سنوورو بەرژەوەندیەكانیان. هەتا سنووری ئاژەڵداری زۆرو فراوان بێت ئەوا سنووری (هۆز) بەناچاری فراوان دەبوو ئەمەش واتای جەنگی دەنواند لەنێو هۆزەكاندا كەدواجار دەبووە جەنگی درێژخایەن لەنێوانیاندا، لێرەدا دەتوانین دوو هۆكاری جیاواز دیاری بكەین بۆ دروست نەبوونی رۆحی كۆمەڵایەتی و دوورو نزیكی تاكەكانی هۆز لەرەوتی بوون و نەبوونی بەكۆمەڵ بوونی هۆزی كورد.

أ- هۆزی كورد بایەخی بەكشتوكاڵ نەداوە بەڵكو هەر بایەخی بەئاژەڵداری داوە، كشتوكاڵ كاری زۆر دەوێ و كاری هەرەوەزیشی دەوێ كە لەوێدا سۆزو هاریكاری و پەیوەندی پتەو دروست دەبێت كەنەسەب و برای خوێنی پێك دێت و لەهەمان كاتدا هەستی نەتەوەیی و نیشتمانی بەهێز دەكات.

ب- هۆزی كورد بایەخی بەئاژەڵداری داوە، ئاژەڵداری لەجێگایەكی تەسكدا، ئەمەش ئەو هەستەی لای كورد دروست كردووە كە (ئێمە دژی ئەوانی تر بین) هەروەك ئیسماعیل بێشكچی دەڵێ، ئاژەاڵداری

> تواناكاری ئەوەی تیادایە كەپەیوەندی پێشبخات لەنێوان هۆزەكاندا لەوشێوە پەیوەندیانەش كەشێوەی خۆبەخۆیی لێ‌پەیدا بووەو دەبێ كەتەنها بیر لەخۆیان و خێزان و هۆزەكانیان بكەنەوەو بیر لەشتی‌تر نەكەنەوە ئەمەش پێی دەڵێن: (ژیانی سەربەست) هەروەك ئیسماعیل بێشكچی دەڵێ، واتە هەستی پێكهاتن و پێكەوە ژیان و هەستی نەتەوەیی و بیركردنەوە لەسەربەستی گەل و یەكگرتن نەهاتۆتە ئاراوە بەهۆی باری ئابووری بەرهەمی ئاژەڵداری.

دیارە هەموو دەستێوەردانێكی دەرەكی بۆ نێو هۆزو سیستەمی ناوەوەی هۆزو سیستەمی ناوەوەی هۆز كردارێكی فعلی راستەوخۆی پێكهاتەكەی كەمەرجێكی بنەڕەتیە لەتێكەیشتن لەگەڵ داگیركەراندا بەجۆرێكی‌تر هۆز دەبێتە كۆیلەی ئەوەی داگیری دەكات واتە كۆیلەی هۆزەكانی‌تر ئەمەش ئەوكاتە روودەدات كە نەتوانێت سیستەمی ناوەوەی بپارێزێت دژی داگیركەران، لەم حاڵەتەشدا هۆز ناسنامەی خۆی دەدۆڕێنێت، ئەو كۆمەڵەی كەلەو بارودۆخە ئابوروی و كۆمەلایەتی و رۆشنبیری‌یەدا پێ‌گەیشتوون و ژیانیان بردۆتە سەر دەبنە خۆخۆیی و تەنها بیر لە سەربەستی خۆیان دەكەنەوەو بیر لەهۆزایەتی خۆ دەكەنەوە، كە ئەمەش داخراوی دروست كرد واتە (كۆمەڵگایەكی داخراو) بۆ سەربەخۆیی و سەربەستی نیشتمان دەبوایە تاكی كورد بیبەخشیایە بەسەربەستی بۆ نیشتمان بەلام لای كورد / تاكی كورد / هۆزی كورد / سەرۆك هۆز / ئەوە

بەدی نەکراوە هەربۆیە سەربەستی نەتەوەیی و درك کردن بەسەربەستی نیشتمان هەستی پێنەکراوەو سەربەستی نیشتمان قوربانی سەربەستیی داخراوی تاکە کەس و هۆزکراوە، کەئەمەش پرۆژەیەکی ناوەوە بووە بۆ کوشتنی هۆزو - هۆز، ناتەبایی و ناڕێکی هۆز لەو درزانەوە پەیدا بووە کە زیاتر ناوچەیی بوو/ جوگرافی بەرژەوەندی بوو/ ململانێی سەرۆك هۆز بوو/ ئەمەش وای کرد کەرۆڵی کۆبوونەوەو یەکگرتن لەدەست بدەن و هەڵەپەی ئیماراتی بکەن وەك لەوەی هەڵەپەی دەوڵەت بکەن یان قەوارەی سیاسی بکەن، هەرەمی پێکهێنانی سیستەمی دەوڵەتی کورد بەتایبەتی لەسیستەمی هۆزایەتیدا هەرەمێکی سەرەو خوارە لەسەرەو بۆ خوارەوەیە نەك لەخوارەوە بۆ سەرەوە، کە ئەمەش دواجار وای لێهاتوە لەدەوڵەتەوە بۆ ئۆتۆنۆمی واتە (لە پیریەوە بۆ منداڵی) نەك لە (منداڵی‌یەوە بۆ پیری) وەك لەم شێوەیەدا دیاری دەکەم:-

هەرەمی سیستەمی دەوڵەتی کورد (هۆزایەتی):-

*دەوڵەت....... دەوڵەتی ماد

*ئیمارەت بابان سۆران... هتد

*کۆمار.......... کۆماری سوور/ کۆماری مهاباد

*ئۆتۆنۆمی هەرەسی ١٩٧٤

*تۆنۆمی راستەقینە............

- حکومەتی هەرێم

ئـەو دەسـتەواژە هەرەمی‌یـە شـیرازەی بـوون بەدەوڵـەتی تێکـداوە. نەدەشتوانرا یەکێتی‌یەکی سیاسی لەنێوان هۆزەکاندا پێك بێت لەسەر ئاستی سەرۆك هۆزەکان تەنها ئەوە نەبێت کەسەرۆك هۆزەکان ملکەچی هـەندێکی‌تر بوونایـە یـا هـەندێ لەدەسـەڵاتەکەیان بدایـە بـەوی‌تر بـۆ سـەرکردایەتیەکی یـەکگرتوو، کەئەمـەش زۆر زەحمـەت بـوو بـەهۆی سروشتی پێکهاتەی ناوەوەی هۆز خۆی، ململانێ بەر شتێکی گەورەیە لەنێوان هۆزەکاندا لەپێناو ناودەرکردن و نەسەب‌و شەرەفدا.. نەتوانراوە یەکێتی‌یەکی سیاسی دروست ببێت تەنها لەحاڵەتێکدا نەبێت ئەویش یەکێك لەو هۆزانە زۆر بەهێز بوایەو بەوشێوەیە کە هەموو هۆزەکانی‌تری بخستایە ژێر رکێفی خۆیەوەو بـاجی بسـەندایە ملیـان کـەچ کردبـا بـۆ سەرۆکەکەی کەئەمەش هەنگاوێکی گرنگە بۆ پێکهێنانی ناوەند، دیـارە سەرۆك هۆز هـەموو شتێك بـووە لـەهۆزدا واتـە زۆرجـار دەبـووە رابـەری شۆڕشـێك یـان بزوتنەوەیـەك ئـەویش لـەژێر سیسـتەمی هۆزایـەتی‌و ئایینی‌یەوە». ئەم سیستەمە داخراوە وای کردبوو ئەوانەی دەوروبـەری گەر لەپێناو خیانەتیشدا بوایە رادەپەڕین‌و دووی سەرۆك هۆز دەکەوتن، سـەرۆك هۆز نـەیدەتوانی سـتراتیژی دوور دابنێـت بـەڵکو هـەر دەسـتەو تاقمەکەی خـۆی دەبینیـەوەو بـەهۆی گـرژی مێژوویـی‌و سـەرکردایەتی خێڵەکی‌یەوە بەرامبەر رووداوەکان هیچی پێ‌نەدەکراو شکستی دەهێناو

زۆرجار دەبووە داردەستی دوژمن و کەسایەتیەکی خۆبەدەستەوەی لێدەردەچوو، سەرەڕای ئەوەش بەهۆی دەمارگیری هۆزیەوە لەنێو هۆزێکدا کە لەسەرەوە بۆ خوارەوەو لەخوارەوە بۆ سەرەوە ئەو دەمارگیری‌یە چل و پۆپی خۆی دروست دەکرد، واتە تاکێك لە هۆزێکدا هیچ نەبوو بەرامبەر سەرۆك هۆزەکەی بەلام بەرامبەر هۆزێکی‌تر سەرکردەیەك بوو واتە خۆی بەسەرکردەیەك و دەسەلاتێك دەبینی لەوی‌تر ئەویش پالپشت بەهۆزەکەی هۆزێکی‌تریش هەمان هەرەم و هەمان بۆچوونی هەبووە، کەئەمەش زەمینەی نزیك بوونەوەی لەیەکتری نارەخسێنێ لێرەدا پێشەوایەتی‌یان رابەرایەتی بەشێوەیەکی پەرش و بلاو بوو بوو لەرێی فووکردن بەخۆداو لەژێر کاریگەری هۆزایەتیدا کە ئەو شێوەیە وای کردووە یەکێتی هۆز دروست نەبێت و نەتوانن بیر لەدەولەتی کوردی بکەنەوە.

٥-بزوتنەوەی کورد رۆلی سەرکردە:

کورد بۆئەوەی ئەوەی لەدەستی چووە بیسەنێتەوە هەستا بەشۆڕش کردن لەپێناو سەربەخۆیی کوردستانداو شۆڕشیش نەیتوانیوە هەنگاوی ستراتیژی بنێت بۆ دەستەبەرکردنی سەربەخۆیی کرودستان لەنێوان ئەو دووبەرداشەدا کۆمەلی کورد کۆمەلێکی بێ‌هێزی لاوازی لێدەرچوو، شۆڕشەکانی کورد لەنێو ئەو دوو چەمکەدا تووشی نوشستی و

هەستانەوە هاتووەو چارەسەری تەواویان پێنەبووە بۆ داواکاریەکان یان بۆ هەلورەوتەکانی مێژوو یان بۆ بنیات نانی دەولەت، زۆرجار شۆڕش بەهەرەمەکی بەرپابووەو بەناچاری چووەتە پێشەوە بێئەوەی دوورونزیکی خۆی لێك بداتەوەو ئەرێو نەرێیی خۆی بزانێت، واتە بێبیرکردنەوە شۆڕشو راپەرینەکانیان گرتبووە ئەستۆ، بەمەش دیارە بزوتنەوەکانی کورد لەهەلومەرجی تایبەتی خۆیاندا نەبوونو ئەو زەمینەیەش خۆش نەبووە یان لەبار نەبووە بۆ شۆڕش یان بۆ راپەڕین واتە بەپێی پرۆسێسی گەشەی کۆمەلایەتی شۆڕش نەکراوە بەلکو لەژێر فشاری دەرەوەدا بەناچاری دەستکراوە بەشۆڕش هەربۆیە زۆر جار شۆڕشێکی گەورە دەپوکایەوە، زۆرجار مێژوو هەلیداوە بەکۆمەلانی خەلك کەشۆڕش بەرپا بکەنو لەگەل ڕەوڕەوەی مێژوودا هەلبکەنو لەگەل هەنگاوەکانی مێژوودا بەرەو بوون بەدەولەت بچن، بەلام سەرکردە یان رابەری کورد ئەو ئامادەباشیەی تیادا نەبووەو ئەو هەلە مێژوویییانەی چارەسەر نەکردووەو گەشەی بەبزوتنەوەکەی نەداوە بەلکو دواکەوتووە لەرەوڕەوەی مێژوو، یان سەرکردە ئامادەباشی تیا بووە بۆ بەرپاکردنی شۆڕشو گرتنەدەستی رابەرایەتی بەلام کۆمەلی خەلك ئەو ئامادەباشیەیان تێدا نەبووە کە لەگەل داواکاری سەرکردەکاندا هەل بکەن واتە پێبەپێ رووداوەکان بڕۆنو دوانەکەون لەمێژووی بوون بەدەولەت، ئەمەش بەدرێژایی مێژوو بووە بەنەخۆشییەکی دەروونیو

تووشی کۆمەڵگای کوردی هاتووەو وای لێکردووە مەودای بەدەوڵەت بوون دوورتر بێت و ئاڵۆزتر بێت و نووشی شکستی‌یە یەك لەدوای یەکەکان ببێت، نە سەرکردە متمانە بەخەڵکان بکات و نەخەڵکانیش متمانە بەسەرکردە بکەن و دواجاریش گلەیی و گازندە دەگرنە مێژوو و مێژوو تاوانبار دەکەن، واتە (غەدری مێژوویی) دەکەنە بەهانە کە ئەمەش پاساو هێنانەوەیەو خۆگێل کردنە بۆ هەڵەی سەرکردایەتی یان هەڵەکانی کۆمەڵ خۆی.

زۆربەی بزوتنەوەکانی کورد لەژێر تێکەڵاوی ئایدۆلۆژی جۆربەجۆرو کاریگەری دەرەوەی ئاوەزی کوردی بەرپاکراون بەهیچ شێوەیەك مۆرکی چینێکی کۆمەڵگای کوردی پێوە دیار نەبووە لێرەشەوە هیچ ئایدۆلۆژێکی کوردی خاوەنی چینێکی تایبەت بەخۆی نەبووە بەڵکو هەمیشە ئایدۆلۆژەکان لەدەرەوەی هەناوی کۆمەڵگای کوردەوە دەهاتنە ناوەوەی هەناوی کۆمەڵگا، ئەمەش وای کرد کەچارەسەر بۆ برین و کێشەکان نەدۆزرێتەوەو جولانەوەکان لەواقع نامۆ بن و دوور بن لەکۆمەڵگای کوردی و دواجار خیانەت و خۆبەدەستەوەدان و بێئومێدی لێ‌پەیدا ببێت چونکە چینێك لەکۆمەڵگای کوردی هاوچەرخدا بالادەست نیە. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی یەکێتی‌یەکی سیاسی دروست نەبێت بۆ سەرکردایەتی خەباتی رزگاری خوازانە لەپێناو دروست کردنی دەوڵەتی کوردیدا.

٦-هۆكاری سەركردايەتی:-

ديارە سەركردايەتی گەورەترين رۆڵ دەبينێت لەرەوڕەوەی مێژووداو بەرەو پێشەوەبردنی كۆمەڵگا بۆ ئامانجە ستراتيژیو بەرژەوەندييەكانی كۆمەڵو لەوێشەوە بۆ هاوپەيمانی خەڵك بۆ بوون بەدەسەڵاتو دەوڵەت. لەبەرئەوەی كۆمەڵگای كوردی پرۆسيسەكانی ياسای پێشكەوتنی كۆمەڵی بەخۆوە نەديوە. ديار بووە سەركردايەتيش لەو بوويەوە تاڵە بەدەر نەبووەو بازدانيش بەسەر ئەو كۆمەڵگا تراديسيۆنالەدا سەركردايەتی تووشی لادانو سەرلێشێواوی دەكاتو پەيوەندی نێوان سەركردەو تاكە كەسی كورد دوور دەبێت واتە ئەو پەيوەندیيە رۆحیيە دروست نەبووە.

پەيوەندی نێوان سەركردەو تاكەكەسی كورد پەيوەندیيەكی (سۆز) ی كرچو كاڵەو نەبۆتە پەيوەندی رۆحی نێوان باوكو كوڕ يان پەيوەندی لەنێوان سەركردەو تاكە كەسی كورد هەربۆيە كە سەركردە دووچاری رووخان هاتووە شۆڕشێك تووشی رووخان هاتووە لەوێشەوە دەروونی تاكە كەسی كورد تووشی بێئومێدیو شكست هاتووەو تووشی ئەو گرێكوێرەی ئەو (ناپەيوەندیيە رۆحی)يە بووە كە دواجار وای لێهاتووە تاكە كەس لەسەركردە جودا بێتەوەو دووری لەنێوانياندا دروست ببێتو تاكە كەس حەوسەڵەی نەبێت شۆڕش بكاتو دووی

سەرکردە بکەوێت، دوژمنیش ئەو هەلەی قۆستۆتەوەو نەیهێشتووە پەیوەندی نێوان تاکە کەسی کوردو سەرکردە دروست ببێت یان پتەو ببێت هەربۆیە ئەو پەردەی نێوانیانی تێك داوە یان بەهۆی کوشتن و لەسێدارەدانی سەرکردەو دوورخستنەوەی شۆڕش و خاکی کوردستانەوە یان بەهۆی مالی کردنی کۆمەلی کورد لەلایەن دوژمنەوە بەرامبەر بەشۆڕش ئەویش بەهۆی گرێدانی کۆمەلی کرود بەهۆزو ئیماراتەکانەوە یان بەهۆی سەرۆك هۆزەکانەوە (جاش/ شۆڕشی چەواشە) دروست بکات و کە لەو نێوەندەوە توانیویەتی گورزی کوشندە بوەشێنێت بەشۆڕش و سەرکردایەتی کورد، کە دواجار بێ ئومێدی دروست بووە چ لای سەرکردەو چ لای تاکی کورد ئەم بۆ ئەو، سەرکردایەتی لەژێر سیستەمی فیودالیداو پاشماوەی فێودالیداو هۆز بەڕێوەچووەو دیاریشە هەر سەرۆك هۆزێك یان سەرکردەی ڕاپەڕینێك یان میری ئیمارەتێك ملی بۆئەوەی بەرامبەری کەچ نەکردووە بۆ بەرژەوەندی گشتی و هەر کەسە بۆ خۆی سەربەخۆیی خۆی ویستووەو خۆشی بەسەرکردەیەکی جیاواز زانیوەو پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان تێك شکاون و هەوڵ نەدراوە سەرکردایەتیەکی یەککگرتوو دروست ببێت بۆ پێکهێنانی دەولەتێکی کوردی.

٧-پەیوەندی نێوان تاکی کوردو سەرکردە:

کۆمـەڵ بـێ سـەرکردەیەکی لێـهاتوو ناگاتـە مەرامـەکانی و هـەروەها سـەرکردەش بـێ کۆمـەڵ هیـچ بایـەخی نـابێت و هیـچ رۆڵێـك نـابینێت لەکۆمەڵگادا، بایەخداری و پێداویستی سەرکردە لەپەیوەندی روحی یەوە پەیدا دەبێت کەتاك و سەرکردە پەیمانی رۆحی دەبەستن واتە پـەیوەندی رۆحی لەنێوان تاك و سەرکردەدا بتوانێت رۆڵی سـەرکردایەتی و لەهـەمان کاتدا دەسـەڵات بگرێتـە دەسـت. پاڵپشـت بـەو هـێزەی کـە لەکۆمەڵـەوە وەری دەگریـت و کـە لەسـەر ئـەو پەیوەندیـە رۆحی یـەوە کـە دامـەزراوە، زۆربـەی سیسـتەمی سـەرکردایەتی لـەمێژوودا بەتایبـەتی ئـایینی بـەو رەوتـەدا بـەرێوەچووە تـا گەیشـتوونەتە دەسـەڵات و دروسـت کردنـی دەوڵەت ئەو پەیوەندیە رۆحی یە لای کورد دروست نەبووە لـەنێوان تاکی کوردو سەرکردەدا. ئەویش بەهۆی تێنەگەیشتنی لەو چەمکە دوایـش بەهۆی دابڕانـی سەرکردە لەتاك لەلایـەن دوژمنـەوە ئـەو پەیوەندیە پێـك نـەهاتووەو نەگەیشـتۆتە حاڵـەتی تێکـەڵاوبوون، زۆرجـار هۆکـاری دروستنەبوونی ئەو پەیوەندیە رۆحییە لەسەرکردەدا بەدیدەکرێ ئەویش بەهۆی ئـەوەی کـە سـەرکردەی بزوتنـەوەکان زۆربـەیان هـەڵمێژوویی و رۆڵی مێژوویيان لەبەرچاو نەگرتووە واتە نەبوونەتە جوڵێنەری مێژوو بۆ بەگەڕخسـتنی کۆمـەڵ لـەپێناو گەیشـتنی بـەمێژوو لەهـەمان کـاتدا نەشیتوانیوە رۆحی تاکـە کەسـی کـورد داگـیر بکـات و بیخاتـە خزمـەت مەسەلەکەیەوە هەربۆیـە جیاوازیـەك دروسـت بـووە لـەنێوان ناهۆشـیاری

سەرکردەو گەمژەیی کۆمەڵ، یان زۆر جار حاڵەتی وا دروست بووە کە کۆمەڵ هوشیار بێت و سەرکردە لەو ئاستە هوشیارییەی کۆمەڵدا نەبێت کە لەگەڵ هەنگاوی کۆمەڵدا بچێت بەڕێوە لەهەمان کاتدا پرۆسەی بۆ پێشەوەچوونی مێژوویی لەیاد کردووە کاریگەری دوژمن بۆ ئەو پەیوەندییە کاریگەریەکی بەهێزی هەبووەو نەیهێشتووە ئەو پەیوەندییە رۆحیە لەنێوان سەرکردەو تاکی کورددا دروست بێت ئەویش بەهۆی لێدانی سەرکردەو دوورخستنەوەی لەکۆمەڵ و هێڵی ستراتیژی شۆڕش یان لەسێدارەدانی سەرکردە کەئەمەش خۆی لەهەرەسی کۆمەڵ و شۆڕشدا بینیوەتەوە لای کورد. یان پاوان کردنی کۆمەڵ بەلایەکی تردا کەلادانی کۆمەڵایەتی و بێهۆشیاری دروست کردووەو دواجار کۆمەڵ دژی سەرکردە بەکاردەهێنێت و وا دەکات کە کۆمەڵ لەسەرکردە بەگومان بن یان دووی نەکەون یان بێزار بن لێی واتە دوژمن هەمیشە لەو درزەوە زۆربەی شۆڕشەکانی کوردی پێکاوەو زیرەکانە ئەم بەرنامەیەی داڕشتووەو زۆربەی راپەڕین و شۆڕشەکانی بەو تەکتیک و سیاسەتە شکست پێهێناوە زۆرجار کۆمەڵی کورد بێسەرکردە ماونەتەوەو ئەمەش وای کردووە کە زیاتر پاوان بکرێن و پەرتەوازە بن و زۆربەیان لەبۆتەی نەتەوەکانی تردا بتوێنەوە یان ببنە ژێردەست و مەسەلەی رەوای خۆیان لەیاد بکەن کەئەویش دروست کردنی دەوڵەتە دەتوانین بڵێین کە ئەو پەیوەندییە رۆحییە گەورەترین هۆیە بۆ بوون بە دەوڵەت کۆی گشتی

هۆی دروست نەبوونی ئەو پەیوەندییە لەم چەند خاڵانەی خوارەوە دیاری دەکەین:-

ا-بێمتمانەیی سەرکردە بەکۆمەڵو تاکی کورد هەروەها بێمتمانەیی کۆمەڵو تاکی کورد بەسەرکردە، ئەمیش زۆرجار لەژێر فشارو کاریگەری دوژمندا بەرێوەچووە، بەتایبەتیش بەهۆی شکستهێنانی شۆڕشو راپەڕینەکانەوە.

ب-تێنەگەیشتنی (سەرکردە +تاك+ کۆمەڵ) لە مێژوو هەڵی مێژوویی.

ج-تێنەگەیشتنی کورد بەسەرکردەوە لە (هەستو نەست)ی دەروونی کە وەك گەنجینەیەکە ئەو دوو ئاوێتەی تیادا کۆدەبێتەوە واتە کۆمەڵی کورد لەو دوو چەمکە تێنەگەیشتووەو نەشتوانراوە لێی تێبگەنو بیخەنە خزمەت ئاوەزو لۆژیك، لەهەمان کاتدا سەرکردەش نەیتوانیوە دەروونی کورد بۆ خۆی داگیر بکاتو داخوازییەکانو ئامانجەکان بپێکێ چونکە ئەو دوو چەمکە هەوێنێکە بۆ دروست کردنی پەیوەندی لەنێوان تاكو سەرکردەدا ئەویش هەوڵدانە بۆ گەیشتن بەدەسەڵاتو دەوڵەت.

د-جیاوازی مێژوویی لەنێوان تاكو کۆمەڵو سەرکردەدا زۆرجار هەل رەخساوە بۆ سەرکردە کە سەرکردایەتی بگرێتە دەستو رابەرایەتی کۆمەڵ بکات بەڵام سەرکردە لەو ئاستەدا نەبووەو نەیتوانیوە ئەو رۆڵە ببینێت کە ئەمەش بووە هۆی شکستهێنانی سەرکردایەتی لەنێوان کورددا، یان کۆمەڵ بەتاکیشەوە ئامادەباشی هەبووە بەڵام سەرکردە

درکی پێنەکردووە ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی پەیوەندی رۆحی لەنێوانیاندا دروست نەبێت، یان زۆرجار هەلی مێژوویی رەخساوە بۆ کۆمەڵ کە رۆڵی خۆی ببینێت لەدروستکردنی سەرکردەو دروست کردنی دەوڵەت بەڵام کۆمەڵ ئامادەباشی نەبووەو لاواز بووەو هەستی بەلێپرسراوی مێژوویی نەکردووە ئەمەش وای کردووە نە سەرکردە دروست ببێت لەنێو رەورەوەو هەناوی مێژووداو نە دەوڵەتیش پێك بێت، ئەمەش لەدەستدانی پرۆسەی بەرەو پێشەوە چوونی خۆی دەنوێنێ و درۆاندنی مێژووەکەی بۆیە لای کورد مێژوو بوەتە تراژیدیایەك و چەند جارێك دووبارە دەبێتەوە.

ه-جێیگیر نەبوونی ئایدیۆلۆژیایەکی سەرتاسەری بۆ کوردو نەبوونی ستراتیژێکی دوور ئەمەش وای کردووە لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی دەوروبەردا کۆمەڵی کورد بخولێنەوەو دواجار بووەتە هۆی بێئومێدی و نارەزایی لەخۆو دەوروبەر زۆرجار تاکی کورد گەیشتۆتە حاڵەتی وا کە خۆزگە دەخوازێت کورد نەبوایە.

٨-هۆکاری ناوخۆ:

دریژەپێدانی پاشماوەی دەرەبەگی و خێڵەکی کارێکی کردۆتە سەر پێکهاتەی کۆمەلایەتی کورد وای کردووە کە هەمیشە کورد لەژێر ئەو سیستەمە گرژەدا بمێنێتەوەو چارەسەر بۆ دۆزی خۆی نەدۆزێتەوەو

لێك جیابوونەوەی چینەكان پەیدا نەبێت بەگوێرەیەك كە لەگەڵ گەشەی هۆشیاری نەتەوەیی و كۆمەلایەتی و مێژوویی‌دا هەڵنەكات، بەڵكو هەمیشە ڕێی لادان و تێكشكانی بەخۆوە دیوە بەتایبەتی لەناوەوەی كۆمەڵگای كورد كە بووە هۆی پەیوەندی كۆمەلایەتی لەنێو كوردان دروست نەبێت و زیاتر لەناو خۆیدا لێكترازان و بیر لەیەكگرتنەوە نەكەن تەنها بیر لەتۆڵەو جەنگ و بەرژەوەندیە تەسكەكان بكرێتەوە.
درێژەكێشانی شەڕی ناوخۆ زیاتر كۆمەڵگای كوردی تێك شكاند كوردستان ئارامی بەخۆوە نەدیوە تا بتوانێت لەنێو خۆدا جێیگرییەكی هۆشیاری بۆ خۆی دروست بكات و بیرێك لەمەسەلەكەی بكاتەوە بەگشتی كوردستان لە هەموو ڕوویەكەوە گەشەی نەكردووە. دیارە گەشەكردن و داواكانی ناوەوە دەتوانن فاكتەرو فشاری دەرەوە بوروژێنن و ڕاكێشن بەلای مەسەلەی دەوڵەت بوونیدا. بەلام كاریگەری دەرەوە بۆ ناوەوە زیاتر بووەو وای كردووە ناوەوە بەگرژی بمێنێتەوە هەمیشە هەوڵەكان لەناوەوە چاوەڕوان بن و ئاراستەی دەرەوەی لەسەر بێت وەك چاودێرو بڕیاردەر بەكوردی و بەكورتی ناوەوە چاوەڕوانی دەرەوەیە ئەمەش گەورەترین زیانی لەدەوڵەت بوونی كورد داوە دەتوانین هۆكارەكانی ناوەوە بۆ ئەم خالانە بگەڕێینەوە.

ا-پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان بەتوندی جیاوازیو ناتەبایی پێوە دیارە لەنێو شەڕی ناوخۆو ناکۆکیە لاوەکییەکان زیاتر ئەو پەیوەندییە شیرازەی تێك چووە.

ب-شێوەی نارەزایی کورد بۆ مەسەلەکەی مۆرکی نەتەوەیی دەمارگیری پێوە دیاربوو نەك جولانەوەیەکی ئابووری کۆمەڵایەتی ئەمەش بەهۆی سەرکوتکردنی کورد لەلایەن داگیرکەرانەوەو شێوازی لەناوبردنی بزوتنەوەکانو قڕکردنی کورد لەهەموو روویەکەوە بۆیە زۆرجار شۆڕشەکانی کورد شۆڕشێکی توندیان بەخۆوە دەبینی جولانەوەکانیش زۆرینەی لەژێر سەرکردایەتی (شێخ - ئاغا- دەرەبەگ - مەلا)دا بووەو زۆرجار مەسەلە نەتەوەییەکەی خستۆتە خزمەت مەسەلەی خۆیی رێبازی ئایینی‌یەوە واتە لەدەسندانی مەسەلە گەورەکە.

ج-نەبوونی خەباتی چینایەتی ئەمەش کاریگەری ئابووریو رۆڵی سەرکردە لەشۆڕشەکاندا واتەی نەبوونی هوشیاری چینایەتی چینەکانی کۆمەڵگای کوردی.

د-شۆڕشەکانی کورد پەیوەندیان بەیەکەوە نەبووەو هەر شۆڕشێك لەهەلومەرجی تایبەتی ناوچەیی خۆیداو لەژێر کاریگەری دەوڵەتی سەردەستدا بەرپاکراوەو ئەمەش وای کردووە کە زۆرجار شۆڕشەکان ئەم دژی ئەو بێت. ئەمەش دیاردەی پێکەوە نەگونجاندنی هێنایە ئاراوە.

٩-هۆکاری دەرەوە:

مەسەلەی کورد وەکو کێشەیەکی نێودەوڵەتی لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم سەری هەڵدا، لەسەدەی بیستەمیش دوای شەڕی یەکەمی جیهانی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتان بایەخی زیاتر بوو. لەم ماوەیەی دواییدا مسەلەی کورد گۆڕانێکی گەورەی گرنگی لەلایەنی سیاسەتی دەرەوە بەسەر هاتووە لەنێوان ئەو دوو سەدە جیاوازەدا مەسەلەی کورد چووە نێو برسی دەوڵەتە ئیمپریالە زلهێزەکان بەتایبەتی ئەمریکا - روسیا - بەریتانیا - فەرەنسا، هەر دەوڵەتە لەروانگەی بەرژەوەندی خۆیەوە سەیری کوردستانی کردووەو لەخزمەت خۆیدا بەکاریهێناوە. هەبوو لەژێر ناوی بەرگریکردن لەنەتەوەیەکی بێدەوڵەتو بەش خوراوو ژێر دەستەو داردەستی ناوچەکە وەك وەرەقەیەکی سیاسی مەسەلەی کوردی بەکارهێناوە، ئەوجا لەدیدی ئاینیو ئاینزاییەوە یاریان بەمەسەلەی کورد دەکرد. ئەم بەرژەوەندییانە بەتایبەتی لەکێشەی هەردوو سیستەمی جیهانی (سەرمایەداری -سوشیالیستی) بەزەقی دەرکەوتن، کوردستان کرایە گەیشتن بە مەرامەکانیانو تا بتوانن لەوەێوە بەرژەوحندییەکانیان بپارێزنو بگەنە ئامانجی سیاسی خۆیان. هەروەها لەلایەکی ترەوە دەوڵەتانی ئیمپریالی هانی سیاسەتی شۆڤێنیانەیان دەدا دژی گەلی کورد لەو وڵاتانەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست لەلایەکیتر دەست تێوەردانی بێگانەیان دەکردە بەهانەیەك بۆیە زیاتر مەسەلەی کورد

ئاڵۆز بوو کرا بەکێشەی نێو ئەو دەوڵەتانەو لەژێر چاودێری هاوپەیمانی ئیمپریالی کەجولانەوەی کوردو مەسەلەکەی بەلاوازیو بێچارەسەر مایەوە. ئیمپریالیزمی جیهانیش ئەوەی گەرەك بوو هەروەها دژی سەربەخۆیی کوردستانو دروستبوونی دەوڵەتی کوردی بوون لەناوچەکەدا چونکە بەرژەوەندی ئەوانو داگیرکەران لەدابەشکردنی کوردستاندا بوو نەك لەیەك پارچەییدا هەربۆیە مەسەلەی کورد درێژەی کێشاو زیاتر پاوان کرا بەچەند ئایدۆلۆژیەکی ترەوە، بەهۆی گۆڕانکارییەکانی ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست مەسەلەی کوردیش تووشی گۆڕان بووە زیاتر سەرەو گرژبوونو ئاڵۆزی چووە، واتە دوای ئەوەی کە دەوڵەتانی داگیرکەری (راستەوخۆ - ناڕاستەوخۆ) بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ دەوڵەتانی ئیمپریالی دەگوێزایەوە بۆ لایەنێکیدی ئیمپریالی ئاوەهاش مەسەلەی کورد.بەرەو ئاقارێکیدی رێی دەنا، واتە بەرەو رۆژگارێکی نادیار کەهەمیشە دەکەونە بەر هەڕەشەو گوڕەشەی دەرەوەو ناوەوە کەسیاسەتی (پەرتکەو زاڵبە)ی بەسەردا جێبەجێدەکرا، واتە کوردستان لەناوەوە تووشی خوێن داچۆڕانێکی دووردرێژ دەبوو، جولانەوەی کوردیش لەئاستی ئەو سیاسەتە نێو دەوڵەتیەدا نەبوو کە چارەسەرێکی پێبێت بۆ مەسەلەکەی هەربۆیە دەکرانە کەرەستیەك بۆ هێنانەدی ئامانجەکانیان کەلەژێر دروشمی هاوپەیمانی ئیمپریالی بەرێوە دەچوو، ئەوجا هێنانە ناوەوەی چەند

ئایدۆلۆژێکی نامۆ بۆ ناوەوەی کوردستان بۆ پێکهێنانی قەڵەمڕەوی خۆیانو دواجار لادانی کورد لەمەسەلەکەی کە وای لێکرد کورد جارێك ئەملا بگریو دژی ئەولا بێتو جارێك ئەولا بگرێتو دژی ئەملا بێت تەنانەت هەندێ بزوتنەوەی کوردی دژایەتی جولانەوەی رزگاریخوازیشیان دەکرد، ئەم سیاسەتە واتە سیاسەتی دووفاقی (ازدواجیة)ی داگیرکەرو بەتایبەتی ئیمپریالیزم کاریگەریی زۆری کردە سەر مەسەلەکەی. دوای گەشەکردنی جولانەوەی کوردو گرژی پەیوەندی نێو دەوڵەتان بەتایبەتی دوای جەنگی ساردو رووخاندنی سیستەمی سۆشیالیستی سۆڤێت بەتایبەتی دوای راپەرینی بەهاری ١٩٩١ مەسەلەی کورد هاتەوە سەر شانۆو کورد جارێکیتر بەجیهان ناسرایەوە. کوردیش بەئاگاهاتو سیاسەتی ئیمپریالیزمی ناسیو کەوتە کۆکردنەوەی ماڵی خۆی بۆ هێنانەدی مافەکانی، بەڵام جارێکیتر دەوڵەتە زلهێزەکان بەرژەوەندییان خستەوە گەڕو پەیوەندی نوێیان لەنێوخۆدا بەست ئەو ئاڵوگۆڕانە وای کرد کەهەمیشە بەرژەوەندی کورد وەلا بخرێتو هەمیشە کوردستان بخرێتە تۆڕی ئەو بەرژەوەندیەوە کە دەوڵەتان بۆ خۆیان رسیویانە راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، دیارە دەبێت لەنێو ئەو ململانێو بەرژەوەندیو گرژییەدا کورد هەوڵ بدات خۆی لەژێر فشاری دەرەوە دەربهێنێو خۆی وا لێبکات کە دەوڵەتان دان بنێن

بەمافەکانیداو قەوارەیەکی رامیاری پێك بهێنن، لێرەدا دەتوانین بەچەند خاڵێك ئەو ئامانجە بپێکین:-

ا-پتەوکردنی بەرژەوەندییەکان لەسەر ئاستی دیبلۆماسیو سیاسی، ئەویش لەسەرشانی مەسەلەی کورد نەبێت.

ب-دارشتنی ستراتیژێك بۆ رووبەرووبوونەوەی هەر مەترسییەك لەلایەن دەوڵەتە زلهێزەکانو دەوروبەرەوە.

ج-کۆکردنەوەی هەموو دەنگەکانی دەرەوە بۆ چارەسەرکردنێکی دیموکراتیانەو ئاشتیانە بۆ کێشەی کورد لەرێگەی هەموو پارتو گروپەکانی کورد وغەیرە کورد بۆ مەسەلەی کوردو کوردستان.

د-لەبەرچاوگرتنی هەلی مێژوویی و مامەڵەکردنی کوردو لەگەڵ هەلی مێژوویی‌داو لەدەست نەدانی مەسەلەکەی.

ە-سیاسەتی دەرەوە بەهیچ شێوەیەك لەبیر نەکرێو حساباتێکی ووردو تایبەتی بۆ بکرێ.

و-هەوڵبدرێت پەیوەندییەکانی کۆن روون بکرێتەوە بۆ کردنەوەی ئەو گرێکوێرانەی کەچەند دۆستێکی کورد هەندێ لەو ولاتان تێیکەوتوون ئەویش بۆ پتەوکردنی مەسەلەی کورد جارێکی دیو لێك نزیك بوونەوە پەیدا ببێت.

سەرچاوەکان:

١-جوگرافیای کوردستان/ عەبدوڵلا غەفور - چاپی دووەم - سلێمانی ٢٠٠٠

٢-ئەو هۆکارانەی مەسەلەی کورد پێك دێنن/ لازار رییف/ وەرگێڕانی سعد عبدالله/ بۆ مێژوو.

٣-کوردو شۆڕش و هەلی مێژوویی/ حوسێن محەمەد عەزیز/ چاپی دووەم ٢٠٠٠

٤-كردستان مستعمرة دولية/ اسماعيل بيشكچى/ ترجمة زهير عبدالملك ١٩٩٨

٥-پێکهاتەی کۆمەڵگاو چەمکی دەسەڵات/ رەحیم سابیر/ گۆڤاری نڤار/ ژمارە (٨)ی ساڵی ٢٠٠٠

# کۆمەڵی مەدەنی لەبەر رۆشنایی چەمکە جیاوازەکاندا

بە کۆمەڵ بوون خۆی لە خۆیدا ئاوەزی یە، هەروەك چۆن رێزگرتنی کەسانی دی، وەزیفەیەکی ئاکاری و ئەقلانی یە. ئەو بۆچوونە رۆشنگەریە، بالاترین ئاکار لەخۆ دەگرێ بەپێی بۆچوونی (ئادەم فیرگسون Adam Fergsus ١٧٢٣-١٨٠٦) کۆمەڵی مەدەنی، لای فیرگسون، وەك کارێکی پێشکەوتنە لە منداڵی یەوە بۆ هەرزەکاری، یان لە (الخشونە- رەقی یەوە Rudeness کە ئەوەش وشەیەکە سەلبی نیە. لای (فیرگسون) بۆ مەدەنیەت (Cilivilization)، بەرژەوەندی خەڵکان پێویستە لە بەرژەوەندیە گشتیەکاندا ئاشکرا بکرێن، ئارەزووی جیابوونەوە لە کۆمەڵ مەیلێکە بۆ دارمانی خۆ، ئامۆژگاری پێویست ناکات کە سەپێنراو بێت یان بە ئازار بێت، یەکسانیش لە هەڵس و کەوتدا لەگەڵ کەسانی تر بە بەزەیی هاتنەوە نیە بەڵکو چاکەیەکە پێی هەڵدەستین بۆ خۆمان.

(رۆسۆ) وای بۆ دەچێ کە کۆنترین کۆمەڵی تاك و سروشتی کۆمەڵی خێزانە، منداڵان پەیوەستن بە باوکیانەوە، لەبەرئەوەی ئەوان پێویستی‌یان پێ‌یەتی لە پێناو مانەوەیاندا ئەم پێویستی‌یەش، کۆتایی پێدێت هەروەها لەگەڵیدا پەیوەندیە سروشتی‌یەکانیش نامێنێ، ئەگەر بەردەوام بوون لە مانەوەداو بە یەکگرتویی دوای ئەوە ئەو مانەوەیە مانەوەیەکی سروشتی نابێت، بەڵکو ئیرادەیی دەبێت، لێرەشدا خێزان دەبێتە خێزان بەپێی پەیمان، ئەم سەربەستی‌یە هاوبەشە ئەنجامی سروشتی مرۆڤە، خێزان یەکەم شێوەیە بۆ کۆمەڵە مرۆیی‌یەکان، سەرکردە شێوەی باوك وەردەگرێ و گەلیش شێوەی منداڵ وەردەگرێ، کاتێ بە یەکسانی و بە سەربەستی لەدایك دەبن، وازناهێنن لە سەربەستی خۆیان، تەنها لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیاندا نەبێت. ئا بەو شێوەیە گوێزانەوە لە حاڵەتی سروشتیدا بۆ حاڵەتی مەدەنی، لە مرۆڤدا روودەدات. وەك گۆڕانێك بە ئەلتەرناتیڤێکی غەریزەیی لە یەکسانیدا. هەروەها لە کردەوە ئاکاریەکانیشدا. چەمکی هیگلیانە بۆ کۆمەڵی مەدەنی فراوانترە لەبەرئەوەی تەنها پەیوەندی‌یە ئابووریەکان و پێکهاتە چینایەتی‌یەکان پێك ناهێنێ، نوێ‌کردنەوەی هیگڵیانە، کۆمەڵی مەدەنی دروست دەکات. وەك حاڵەتێکی نێوەند لە نێوان خێزان لەلایەك و لەلایەکی ترەوە لەنێو دەوڵەتدا، لەبەرئەو هۆیەش چەمکی هیگل، هەموو دەزگاو پەیوەندی‌یەکانی پێش دەوڵەت ناگرێتە خۆ وەك (خێزان)

هـەروەك حاڵـەتی كۆمـەڵێ سروشـتی لای (لـوك) بـەڵكو پلەیـەكی لـە پەیوەندییـەكانی ئـابووری بـە رێكخسـتنە دەرەكییەكانـەوە بـەپێی رێبازی دەوڵەتی لیبرال واتە كۆمەڵی بۆرژوازی دەوڵەتەكەی دەگرێتەخۆ. بازنەی كۆمەڵی مەدەنی رووەو دەوڵەتمان دەبات، كەواتە ئێمە لەبەردەم بۆچوونێكداین لە خێزانەوە دەردەچێ بۆ كۆمەڵی مەدەنی بـۆ دەوڵـەت، هیگڵ دەڵێ (ئەگەر دەوڵەت و كۆمەڵی مەدەنیمان تێكەڵ كردو ئاسایش و پارێزگاری موڵكایەتی تایبەتی و سەربەستی كەسایەتیمان بۆ دابین كرد بـەرژەوەندی تاكـەكان دەبنـە ئامـانج كـە لـە پێنـاویدا كۆبوونەتـەوە، هـەمووش وا خـۆ دەردەخـەن كـە قوربـانی دەدەن لـە پێنـاو بـەرژەوەندی هەموودا، هەموو درۆ دەكەن، لەبەرئەوەی كەس خێری گشت ناوێ تا ئەو كاتـەی كـە لەگـەڵ بەرژەوەندییـەكانیاندا نـەگونجێ. پێویسـتە ئـەو بۆچوونە، بچێتە نێو بابەتێكی سیاسی راست، كە دەگەرێ بۆ خـۆش گوزەرانی بەشەر. كۆمەڵی مەدەنی دروست نابێت تا ئەو كاتەی كۆمـەڵ لەدەوڵەت جیاواز نەبێت، ئەگەر دەوڵەت جیاكەرەوەی خۆی بێت هـەر بە خۆ دروست بووبێت بێ كۆمەڵ ئەو دەوڵەتە دروست نابێت تا كۆمـەڵ دروسـت نەبێت، دەوڵەتیش كوری نوێ بوونەوەیە، لە هـەمان كاتیشـدا كۆمـەڵی مـەدەنی دروست نابێت لـە لاوازی دەوڵـەتدا، كۆمـەڵی مـەدەنی لـەدایك بـووی هـێزی دەوڵەتـەو لـە پێنـاو بەرامبـەركی ئـەو هێزەدایـە، كۆمـەڵی مـەدەنی واتـە سیاسی، هـەروەها واتـای سیاسـیش ناگرێتـەوە،

واتای دەوڵەت هەروەها نادەوڵەتیش ناگرێتەوە، بەڵام مێـژووی هـزری کۆمەڵ بەسەربەخۆیی لەدەوڵەت دەست پێدەکات لەگـەڵ پێشکەوتنی هزری پەیمان لە یاسای تایبەتدا، جیاوازی لە نێوان کۆمەڵ و دەوڵەتدا لەوەدا نیە کە لە نێوان کۆمەڵ لە دەرەوەی دەوڵەتدا بێت، یان دەوڵەتێك لە دەرەوەی کۆمەڵ بێت، بەڵکو جیاوازیەکە لـە نێوان کۆمەڵی مەدەنیدا هەروەك (مونتیسکۆ) دەیبینێ و جیاوازیەکە لە نێوان کۆمەڵی مەدەنیدا هـەروەك (لـوك) دەیبینـێ، دابـەش کردنـە وەزیفیـیـەکان دەمێننـەوە، هـەروەها رۆچوونـی کۆمـەڵی مـەدەنی لەگـەڵ دەوڵـەتدا دەمێنێتـەوە، گوێزانەوە لە کۆمەڵی مەدەنی بۆ دەوڵەت بەشێوەیەکی پلەکی دەبێت، لەبەرئەوە دەوڵەت لەناو کۆمەڵی مەدەنیدا هەیەو کۆمەڵی مەدەنیش لەناو دەوڵەتدا هەیە. هیگڵ لە قۆناغێکی پێش وەختدا ئەوەی دۆزیـەوە کـە دەوڵـەت خـێزانێکی گـەورە نیـە، هـەروەها دەوڵـەتی جیـاکردەوە لـە پەیوەندی خێزانی، هەروەها لە پەیوەندی دینیش جیای کردەوە، بەڵام جیاوازی لـە نێـوان دەوڵـەت و کۆمـەڵی مـەدەنیدا، خـۆی لـە خۆیـدا، سەرەتای دەوڵەتە، کە لە نەی لێکراوی جەدەلیانەی پەیوەند پـەیمان، بـەڵام کۆمـەڵی مـەدەنی لەسـەر بناغـەی پـەیوەندی پـەیمان دەسـت پێدەکات، واتە کۆمەڵی مەدەنی جیاوازە لە خێزان کە بە پێی پەیمان دروست دەبێـت، دەوڵـەت ئـەوە گـەوار (قبـول) ناکـات و نـەفی دەکـات، ئەمەش جیاوازییە لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵی مەدەنیدا، واتە دەوڵەت

خۆیبوون دەکات لە کۆمەڵی مەدەنیدا و دوایش بەرەو پێشی دەبات، بۆ ئاستێکی بەرز، کە لەسەر بناغەی پەیمانی خێزانی و دینی هەڵناستێ، بەڵکو لەسەر تاوانی مرۆڤ و ئاکاری مرۆڤ، ئەویش لە جیاوازی کردنی مرۆڤەوە بۆ خێرو شەڕ، ئەوەش دەوڵەتە کاتێك کۆمەڵی مەدەنی، خێزان نەفی دەکات. واتە خزم نەفی دەکات، ئەمەش بەهۆی پەیمانەوە کە کەسانێك دەبێت بۆ ئاڵ و گۆڕ. کاتێکیش دەوڵەت کۆمەڵی مەدەنی نەفی دەکات بەرهەمی خزم دێنێتەوە بەرهەم بەڵام وەك خێزان نا بەڵکو وەك کۆمەڵێکی ئاکاری کە لە هەناویدا مافەکانی تاك و ئەرکەکانی هەڵگرتبێت، لێرەدا خۆی نادات بەدەست کۆمەڵێکەوە کە خێرو شەڕو بەرژەوەندییەکانیان نەزانن، هەروەها پشتیش نابەستێ بە پەیمانی کۆمەڵایەتیان. چونکە خێزان لە ئاستێکی نزمدا دەبینرێ و دەبێ بەپێی ئەو پەیمانە کە خۆی دەیەوێ بەرەو پێش بچێت و خۆی بسازێنێ لەگەڵ دەوڵەتدا، دەوڵەت لێرەدا ئەو خێزانە نەفی دەکات، چونکە بەرهەمی خزم دەهێنێتەوە بەڵام دەیکاتە کۆمەڵێکی ئاکاری و کە بزانێ ماف و ئەرکەکانی چییە، واتە دەیکاتە کۆمەڵێکی ئاکاری و دەیهێنێتە بەرهەم، ئەو کۆمەڵەش خۆیان لەگەڵ هەنگاوی ئەو دەوڵەتەدا کە هەردوو لا پێی رازین هەڵگری ماف و ئەرکەکان دەبن، لە هەناویاندا و بۆ پێشکەوتنی دەوڵەت لە کۆمەڵی مەدەنیدا وەك هێزێکی دەرەکی دەردەکەوێ وەك دەوڵەتێکی فریاگوزاری دەردەکەوێ، لەهەمان کاتدا وەك دەوڵەتێکی

خۆش گوزەرانی کۆمەڵایەتی دەردەکەوێ، کە هەڵدەستێ بۆ وەڵامدانەوەی پێویستییەکان، لە کۆمەڵی مەدەنی دروستی دەکەن یان بۆ وردبینی دەربارەی دژایەتیەکانی کۆمەڵی مەدەنی لەو قۆناغەدا چەند ئەرکێك دەبینێ:

١-ئیدارەی کردنی یەکسانی.

٢-رێکخستنی ئابووری دژی هەژاربوون.

٣-پاراستنی یاساو سیستمی ئاسایشی گشتی.

پێشکەوتن و گەشەکردنی کۆمەڵی مەدەنی، خۆی لە خۆیدا ئامانجێکە بۆ رێکخستنی سیاسی، بۆ کۆمەڵ دەوڵەتیش کەرەسەیەك دەبێت بۆ گەیشتن بۆ ئەو ئامانجە نەك ئامانجێك بێت بۆی.

کەوابێ کۆمەڵی مەدەنی ئامانجێکە دەکەوێتە نێوان کۆمەڵ و دەوڵەت، بە واتایەکی دیکە قەڵەمڕەوێکە بالاتر لە بەرژەوەندی تاك و نەشکەوتۆتە ژێر دەسەلاتی رەسمیش، لێرەدا ئیدی دەوڵەت مامەڵە لەگەڵ تاك تاکی خەڵك ناکا، بەڵکو کاری بە گرووپە رێکخراوەکانەوە کە خواستەکانیان لە چوارچێوەی یاسادا دەخەنەڕوو (ئەو دوو تایبەتمەندییە بنچینەی کۆمەڵی مەدەنیە، کە هەموو شتەکانی دیکە دەگرنەخۆ لە پێش هەموویانەوە سەربەخۆیی لە دەوڵەت و وەك رادەی نێوان خەڵك و دەوڵەت دەردەکەوێ، ئەوجا جیاکردنەوەکانی دی دەست پێدەکات.

**بە هاوولاتی بوون**

گوێزانەوە لە کۆمەڵی مەدەنی بۆ دەوڵەت، خۆی لە خۆیدا، گوێزانەوەی تاکە بۆ هاوولاتی. هاوولاتی ئەندامێکە لە کۆمەڵی مەدەنیدا، هەروەها لە خێزانیشدا، بەڵام ئەوەی جیای دەکاتەوە وەك هاوولاتی، تێربوون نیە بەڵکو توانای لەسەر بڕیاردان هەیە لەوەی خێر چیە و شەڕ چییە، لەسەر ئەو ئاستە تاك سەربەستی خۆی نادۆزێتەوە لە خێزاندا، هەروەها لە کۆمەڵی مەدەنیشدا نایدۆزێتەوە، بەڵکو تەنها لە دەوڵەتدا دەیدۆزێتەوە. تەنها زەبور زەنگیش دەوڵەت ناپارێزێ، بەڵکو ئەو سیستەمە دەیپارێزێ کە هەموو ئەو جۆرە دیسپلینەی کە تاکەکان بڕیاردەدەن لەسەر ئەوەی کامە خێرەو کامە شەڕە؟

(سبینوزا) دەڵێ: ( ئەو نزیکایەتیەی کە کوڕ و کۆیلە و هاوولاتی پێکەوە دەیبەستێ، هەریەك بۆ مل کەچی جیوازیەکی زۆر گەورە هەیە، لە نێوان کۆیلەو کوڕ و هاوولاتیدا. بەو شێوەیە دایدەڕێژێ، کە بەرژەوەندی تایبەتی خۆی تێدایە، بەڵام هاوولاتی ئەو کارانەی کە دەسەلات پێی دەدات و ئەو پێی هەڵدەستێ، لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی لە هەمان کاتدا بەرژەوەندی خۆشی، هاوولاتی ئەو کەسەیە کە فەرمانەکان جێبەجێ دەکات و لە هەمان کاتدا مل کەچی یاساکان دەبێت و هەروەها هاوبەش دەبێت بۆ پێدانی ڕێپێدان بە یاسا، (بودان) هەنگاوی یەکەمی ئەو تیۆرەی داڕشت پێش (هوبز) کاتێك هاوولاتی

کرده (ئەندامی چینایەتی‌یە سیاسیەکان) هەروەها غەیرە هاووڵاتیەکانی ئەوانەی کە سەر بە هیچ چینێکی سیاسی نین رەعیەتن لە پەیوەندیەکانیان بە دەسەڵاتی رەهاوە) ئەمەش بە نەفی کردنی (للحق الطبيعي) لە سەدەی ناوەڕاستدا باو بوو وەك سیستەمێکی راستەقینە کە قەوارەی کۆمەڵایەتی (هەموو) پێشتر بووە لە قەوارەی (کیان) تاکی (بەش) قەوارەی تاك وا لێدەکات کە ماناکەی لە ئەندام یان لە ئەندام بوونەوە پەرە بسەنێ بۆ هەموو، لە تیۆری (بودان)دا هاووڵاتی ئەندام نیە لە دەوڵەتدا، بەڵکو بووە بە نیشتەجێ بوو. بەو شێوەیە کۆمەڵ یەکسان دەبێت لە چینە سیاسیەکاندا ئەوانەی ئەندامن و ئەوانەی ئەندام نین دەبنە رەعیەتی گەورەکان، بەشێوەی تیۆری جیاوازی نێوان هاووڵاتی لابرا ئەویش بە ناسینی پێشینەی کە خاوەن ئیمتیاز و هەروەها ناهاولاتیش شێوەی یەکسانی پێشینەی وەردەگرێ بەشێوەی نەرێیەتی، هەروەها یەکسانن لە بەردەم دەوڵەتدا لەبەرئەوەی رەعیەتن بۆی، لەم حاڵەتەدا بەرگری‌کردن لە هاولاتی شێوەیەك وەردەگرێ کە بەرگری نەبێ لە مافی هاووڵاتی تاك تەنها (مەدەنیەت) لەبەردەم دەسەڵاتی دەوڵەتدا، بەڵکو شێوەی بەرگری کردن دەنوێنێ لە ئیمتیازاتە کۆنەکان کە ماونەتەوە بۆ دەستەکان واتە (نبلاء) و (الاكليروس) دوایش چینی سێهەم.

(هوبز) ناچێته خانەی ئەوەی کە بەرگری بکات لە هاوولاتی، بەڵکو هەنگاوێك بۆ پێشەوە دەچێ لە هزری ڕێنیسانسدا بەتایبەت لەلای (بودان و ماکیاڤیللی) لێك داپچڕاندنی تەواو لەنێوان هاوولاتی و مرۆڤدا، ئەویش بە لێك داپچڕاندنی لە نێوان حاڵەتی سروشتیدا کە (الحق الطبیعی) شێوەی باوی وەرگرتبێ، کە مافی مرۆڤ بۆ گەیشتن بە ئارەزووەکانی هەموو شێوە کەرەسەیەك بەکاردەهێنێ بۆ گەیشتنی، هەروەها لە نێوان حاڵەتی مەدەنیەتدا کە مرۆڤ دەگوازێتەوە بۆ هاوولاتی واتە رەعیە بەوەش بواری دەکرێتەوە بۆ هزری سیاسی مەدەنی، بۆ پێشکەوتن بەرەو هاوولاتی نەك لەسەر گەڕانەوە بێت بۆ ئیمتیازە بەجێماوەکان، یان بەپێی هەبوونی لەنێو پەیوەندی دارەکاندا، بەڵکو لەسەر بنچینەی پێشکەوتن بە شێوەیەکی پلەکی بەرەو هاولاتی گشتی نوێ کە لەسەر ماف و ئەرکەکان لە پەیوەندیەکاندا لەگەڵ ئەوانی تردا، هەروەها لەگەڵ دەوڵەتیشدا، لە حاڵەتی لیبارلیدا، یان بازدانی شۆڕشگێڕانە بۆ یۆتۆپیا کە بەرهەمی یەککگرتن دەگەڕێنێتەوە لە نێوان مرۆڤ و هاوولاتیدا، بەلام لەسەر بنچینەی کۆمەلایەتی (نەك سروشتی) لە حاڵەتی دیموکراتی شۆڕشگێڕی یان کۆمۆنیستیدا.

(رۆسۆ) دەڵێ (نابینە مرۆڤ تا نەبیتە هاوولاتی) ئەمەش واتەی تواندنەوەی کۆمەڵ لە دەوڵەتداو تواندنەوەی مرۆڤ لە هاوولاتیدا، جیابوونەوەی کۆمەل لە دەوڵەتداو تواندنەوەی مرۆڤ لە هاوولاتیدا،

جیابوونـەوەی یەکەم لـە مێـژووی کۆمـەڵی مـەدەنیدا، جیابوونەوەیـە لـە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵدا، دەوڵەت و ئابووری، بەڵام جیابوونەوەی تاك و گۆڕینـی بـۆ هـاووڵاتی، کـە ئـەو کەسـێکە یـان بـۆ کەسـێك کـە ئـەو هاووڵاتی‌یەیــە، ئــەم کێشــەیە ڕووبــەڕووی هــەندێ لــە دەوڵەتــە دیموکراتیـەکان دەبنـەوە، کێشـەی گوێزانـەوە تاکە بـۆ هـاووڵاتی کـە وەك قەوارەیـەکی مـاف دانـی پیـادابنرێ و هـەروەها زیندوکردنـەوەی هـزری کۆمەڵی مەدەنی کۆن، لەگەڵ یادنەکردنەوەی بەرهەمەکانی دیکە، بەڵام زیندووکردنـەوەی کۆمـەڵی مـەدەنی بـە تەنـها ئامانجێکـە بـۆ خـۆی نـەك هۆکارێك بێـت بـۆ هێنانەکایـەی سیسـتەمێکی دیموکراتـی کـە ئـەوەش جێی خۆپارستنە لێـی، کۆمـەڵ مـەدەنی لای (مونتسکیو) ئـەم شـێوەی خوارەوە دەگرێتەخۆ:

١-بڕیاری یاسا.

٢-جیاوازی لەنێوان کۆمەڵ و دەوڵەت.

٣-هاوسەنگی لە نێوان دەسەڵاتداراندا یان هاوسەنگی لە نێوان هێزەکان لە دەوڵەتدا.

هیگڵ دەڵێ: (شیکردنەوەی جەدەلی بۆ کۆمـەڵی مـەدەنی کۆتـایی پێهات، کۆمەڵی مەدەنی ناتوانێت ئاوەزو سەربەسـتی لـەخۆوە دەسـتەبەر بکات، بۆ ئەمـەش هیگڵ پێشنیاری کرد، کە دەوڵـەتێکی بـەهێز هـەبێت بـۆ بـە گەیشتن بـەو ئامانجـە، ویستیشـی لـە نێـوان دەوڵــەت و نێـوان هـزری

سەربەستیدا سازکاری بکات، یان بیسازێنێ، ئەویش لە ڕێگای دانی موڵکایەتی تایبەتی‌یەوە کە سروشتێکی دەستوری بەهێز دەگرێتەخۆ.

## دەوڵەتی نوێ

کۆمەڵی مەدەنی لە کۆی پەیوەندیەکانی تاکە مادیەکانەوە پەیدادەبێت، لە قۆناغێکی تایبەتیدا لە پێشکەوتنی هێزە بەرهەم هێنەرەکاندا، واتە هەموو شێوە ژیانەکان بازرگانی و پیشەسازی دەگرێتە خۆ، بۆ قۆناغێکی دیاری کراو. بەمەش دەوڵەت و نەتەوە تێدەپەڕێنێ، هەروەها سەرەڕای ئەوەش دەبێ خۆی جەخت کاتەوە لە دەرەوەی خۆی وەك دەوڵەت، لەگەڵ ناوەوەی خۆی، وەك نەتەوە، هاوکاری کردن لە نێوان تاك و دەوڵەتدا، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێ نێوەندێك، ئەمەش خۆی لە خۆیدا هاوکار نەتەوەیی‌یە (بارسونز) دەیەوێ نەتەوەی نوێ لەسەر پێگەی هاوولاتی دابمەزرێنێ، واتە هاوولاتی یان هاونیشتمانی بەسیەتی لە پێناوی لایەنگریدا بۆ نەتەوەکەی، کۆمەڵ لە ئەبستکراتیدا هاوشێوەیە لەگەڵ هزری نەتەوەدا، بەلام ئاراستەکراوە بۆ ناوەوە نەك بۆ دەرەوە، واتەی کۆمەڵ دەگەیەنێت بە ئاراستەی ناوەوەو واتای نەتەوە دەگەیەنێ بە ئاراستەکردنی بۆ دەرەوەی کۆمەڵی مەدەنی بەو شێوەیە ناتوانرێ پۆلێن بکرێت کە تەنها بێ لە لێك دابڕانی لە دەوڵەت. لە ڕاستیدا خۆی هاوشێوەیە لەگەڵ نەتەوەدا، کەواتە کۆمەڵی مەدەنی ئەو کۆمەڵە نیە کە تەنها لێك دابڕان بێت لە دەوڵەت، شێوەی پەیوەست بوون

کە هێزی بەرهەم مەرجی بۆ دادەنێ لەسەر پلەیەکی تایبەتی لە پێشکەوتنی مێژوویدا کە لەگەڵ خۆیدا کۆمەڵی مەدەنی مەرجیەتی شانۆی راستەقینەیە بۆ مێژوو کە هەموو جۆرە پەیوەست بوونی مادی لە نێوان تاکەکاندا لەسەر ئاستی تایبەتی لە پێشکەوتنی پیشەسازی‌یە، بەو مانایە دەوڵەت و نەتەوە تێدەپەڕێنێ کە خۆی بۆ دەرەوە ئاراستە دەکات، لە شێوەی دەوڵەت، کاتێکیش نەتەوە رزگاری دەبێت لە ناسینەوەی ئەندامەکانی بە رۆشنبیری و شوناسی (الاثنية) لە کۆمەڵی مەدەنی نزیك دەبێتەوە، نەتەوایەتی دەگوێزرێتەوە بۆ شوناسێکی تر لە شوناسە بچووکەکان، ئەو شوناسە سەردانەواندن نابێت، بەڵام لە لایەکی ترەوە بەرزناکرێتەوەو بەهایەکی لەخۆی زیاتری نادرێتێ، مل کەچ بوون بۆ پابەندبوون وەکو هاوشێوەکانی شوناس دەگۆڕدرێ بۆ بەها، وە رۆڵی دەبێت لە دروست کردنی ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیی. هیچ یەککگرتنێکی بەزۆر بۆ تاك ناتوانێت بە نەتەوایەتی بوون دروست بکات، بەهەر شێوەیەك لە شێوەکانی (موریس بارس) دەڵێ (نەتەوە بە نیسبەت تاکەوە وەك گڵ وایە بۆ دار، پەیوەندی لە نێوانیاندا پەیوەندی ئیرادەی سەربەست نیە بەڵکو پەیوەندیەکی پێویستە هەستی مێژوویی، هەستی سروشتی سامی گەوار کردنی پێویست، کە ئەمەش مانای نەتەوایەتی‌یە، ئەو ئاستەی کە (ئاکتون) دیاری‌دەکات لە نێوان دەوڵەت و نەتەوەیەتیدا ئاستێکی پارێزراوە بەڵام جیاوازی دەکات لە نێوان هەردووکیاندا، ئەم جیاوازیەش وا دەکات کە دەوڵەت لەگەڵ نەتەوەدا،

یان زیاتر بێت لە ناوەوەیدا، جیاوازی کردن لە نێوان نەتەوەو دەوڵەتدا لەلای (ئاکتون) وەك ئەو جیاوازیە وایە لە نێوان دین و دەوڵەتدا، هیچ بوارێك لە نێوەندیاندا دروست نابێت لە کۆمەڵی مەدەنی و لە نەتەوەدا، بیری نەتەوەیی هیچ بوارێك ناهێڵێتەوە بۆ بیری کۆمەڵی مەدەنی، لەبەرئەوەی هیچ جیاوازیەك نابینێ لە نێوان کۆمەڵ و نەتەوایەتیدا کە لەسەر تاك پێویست دەبێ تێکەڵی ببێت، کۆمەڵ و تاك سەربەستی خۆیان وەردەگرن کاتێك لەگەڵ نەتەوەدا دەگاتە ئامانج. بەڵام لە کۆمەڵی مەدەنی ئاراستەکراوی دژ بە دەوڵەت دەگوازرێنەوە بۆ کۆمەڵی نەتەوەیی (اثني)، پاڵ پێوەنانی کۆمەڵ دژی دەوڵەت، کۆمەڵێکی مەدەنی لەدایك نابێت بەڵکو بە پێچەوانەوە هەرکاتێك نەتەوەیەکی سیاسی لە هاوولاتی هەبێت ئەوا کۆمەڵێکی مەدەنی دروست دەبێت و سەرهەڵدەدات، ئەمەش نەك تەنها دەربارەی دەوڵەت، بەڵکو دەربارەی نەتەوەش. تەنانەت گەر بە یەك بگەن و یەك شێوەبن لە دووریانی مێژووی یەکتریاندا، کۆمەڵی نوێ یان کۆمەڵی مەدەنی نەتەوەیی یە لە پەیوەندیەکانیدا لەگەڵ دەوڵەت و نەتەوەدا، کۆمەڵێکی مەدەنیە لەگەڵ پەیوەندیەکانی بەدەرەوەدا، کاتێك نەتەوەیەك گشت گیرە واتە ئاراستەیە بۆ ناوەوە کۆمەڵێکی مەدەنی دەبێ، کاتێکیش کۆمەڵی مەدەنی بەرەو دەرەوە دەچێ دەبێتە نەتەوەیەکی نوێی کۆمەڵی مەدەنی، ئەوکاتە دروست دەبێت کە بەهۆی توانای مێژوویی ئەندامەکانیەوە کە بۆچوونیان وابێت کە جیاببنەوە لە دەوڵەت، بەمەش دەبێتە نەتەوەیەکی

نویَ بەهۆی رۆڵی نوێوە کە دەیگێڕیَ و ئایدیۆلۆژی نەتەوەیی (اثـني) هاوچەرخ داڕشتنێکی پێش نوێگەری ئایدیۆلۆژی نەتەوەیی نیە، بەڵکو بەرهەمی نویَیە بۆ دابڕانی رووکاری مێژوویی (جیهانگیری) و (بەشکاری) (العولمة و التجزؤ) هەردووکیان سنووری دەوڵەت و نەتەوە دەبڕن و لە دەرەوەو لە ناوەوە ئەم هاوکێشەیە دەردەچێ کاتێ چوارچێوەی سیاسی لەخۆگرت، لەو دەوڵەتانەی کە دەگوازرێنەوە بۆ نەتەوەی نویَ لەبەرئەوەی لەخۆوە دروست نابێت، وەك ئەنجام کاری پشەیی و ئابووری نەتەوەی نویَ بەڵکو وەك کەرەسەیەك بۆ دروست کردنی ئابووری نویَ لە دەوڵەتە ئەوروپاییەکان، بەڵام هەندێ شوێن هەن ئەو جۆرە پرۆسیسەی تیا دروست بوو دوای ئەوەی دروست کردنی نەتەوە بەهۆی دەوڵەتەوە بەسەرچوو، لەبەرئەوەی هوشیاری نەتەوەیی بیَ ئەو دروست بووە (بلسنر) و فەرهەنگی (نەتەوە دواکەوتووەکان)ی بۆ دانان دەلالەت بۆ ئەو نەتەوانەی کە لە سەرەوە یەك دەگرن، بەهۆی دەوڵەتەوە، کە رووبەڕووی ئێستا (کلۆڵی خۆی) دەبێتەوە بە محاوەلەکردنی زیندووکردنەوەی دەوڵەت بە رابردووی نەتەوەیی و رۆشنبیری کە کاکڵەی نەتەوەیی جێگیرە، بەڵام هەندێ گەل هەن کە لە (گەلی دواکەوتو)ش دوا بکەویَ.

سەرچاوەکان:

١-تطور النظرة الواحدية الى التأريخ- جورج بليخانوف- ترجمة محمد متجير مصطفى، مراجعة د. وهبة بيروت. بێ مێژوو.

٢-اشكالية مفهوم المجتمع المدني- د. كريم ابو حلاوة الطبعة الاولى سورية ١٩٩٨

٣-المجتمع المدني دراسة نقدة- د. عربي بشارة- مركز دراسات الوحدة العربية الطبعة الاولى بيروت ك٢، ١٩٩٨

٤-كردستان مستعمرة دولية- اسماعيل بيشكچى- ترجمة زهير عبدالملك ١٩٩٨

٥-الفرد و المجتمع- ب بيخوفسكى- ترجمة هندي رياض. الطبعة الثانية/ بيروت ك٢ ١٩٧٨.

٦-کۆمەڵزانی و کورد- فوئاد تاهیر سادق- سلێمانی ١٩٩٩

٧-کۆمەڵی مەدەنی- وەرگێڕانی ئەبوبەکر خۆشناو ٢٠٠٠

٨-گۆڤاری مەدەنیەت ژمارە (٢ و ٤) ساڵی یەکەم ١٩٩٩.

٩-گۆڤاری نڤار ژمارە (٢) هاوینی ١٩٩٨.

١٠-گۆڤاری نڤار ژمارە (٥) بەهاری ١٩٩٩.

# بە مەدەنیکردنی کوردەواری

بە هۆی داگیرکردنی کوردستان و سەرکوت کردنی مرۆڤی کورد لە ژێر قورسایی ئامراز و ئایدیۆلۆژیە جیاوازەکاندا، یان لە ژێر پاڵەپەستۆی ئایدیۆلۆژی دەرەوە، کوردەواری تێك شکا و بێ گەشە و گۆڕان مایەوە لە هەموو روویەکەوە، مرۆڤی کورد بێبەش بوو نەك تەنها لە خاکەکەی، بەڵکو لە مافە سەرەتاییەکانیشی وەك (مرۆڤ - کۆمەڵ).

لێرەشەوە مافی هاونیشتمانی و هاوولاتی و مافی جودایی لێسەندرایەوە، چونکە ئەو رژێمانەی کە کوردەواریان قان داوە ئایدیۆلۆژیایەکی رەگەزپەرستانە و دیکتاتۆرانەیان بەکاردەهێنا، ئەمە تەنها کۆمەڵی کوردی نەگرتبۆوە، بەڵکو کۆمەڵی خۆشیان سەرکوت کردبوو، ئەمەش بواری بۆ رەگەزپەرستی خۆش کردوو دەرگای دیموکراتی قفڵکرد، داگیرکەران بواریان بە کۆمەڵی خۆیان نەداوە کە

نزیك ببنەوە لە كۆمەڵی كورد بۆ ئەوەی شێوە تێگەیشتنێك روونەدات لە نێوان تاكی داگیركەر و تاكی داگیركراودا، لێرەدا، كورد لە شارستانیەت، لــە كۆمــەڵی هاوچــەرخ دوركەوتــەوە، واتــە دووربــوو لــە پێشــكەوتنە كۆمەڵایەتیی و روناكبیری‌یەكان، بەوەش داگیركەر سیستەمێكی تۆكمەی هاوچەرخ و كۆمەڵێكی سـەر بـە سیسـتەمی خـۆی مسـۆگەركرد لەسـەر شانی كۆمەڵێكی تـر و لـە خزمـەت كۆمـەڵێكی تـردا، واتـە بێ‌خواسـتی كـوردەواری كۆمــەڵی داگیركــەر كۆمــەڵێك دروســت بــوو لەســەر شــانی كۆمەڵێكی دی، هەر لەسـەرەتای سـەدەی بیستەوە تـا كۆتـایی سـەدەی بیست كوردەواری تێك شـكاو نـەبووە كۆمـەڵ، بـە تایبـەتی لەبەرەبـەیانی سـەرهەڵدانی هـزری نیشـتمانی و دەوڵـەتی نەتـەوەیی‌دا كـە سـەدەیەكی زێڕین بوو بۆ گەلان، كە بوونـە كۆمەڵ و نەتـەوە و دەوڵـەت، بـەڵام كـورد ئەوەشــی هــەیبوو لــە دەســتی‌دا و لێــی ســەندرایەوە، سیســتەمە داگیركـەرەكان داپچڕانێكیـان كــردە جەسـتەی بەهاونیشـتمانی بــوون. بەشـداربوونی كـوردەواری لـە نێـوا كۆمــەڵدا، ئـەو پرۆسـەیە وایكـرد كوردەواری هەنگاوی ئاسایی خـۆی نـەنێ و لـە گەشەكردن بێبـەش بێت كە گـەلان پێیـدا تێپـەڕین، جا بۆ ئـەوەی كـورد ببێتـە كۆمـەڵ و شـان بـە شانی كۆمەڵـەكانی دی رێبكات و بگاتـە ئاسـتی ئـەو كۆمەڵانـە و ببێتــە كۆمەڵێك لە دەستەی ئەو كۆمەڵە دەبێت هـەنگاوی وا بنێ كە شایستەی ئەوەبێت بچێتە نێو كۆمـەڵی هاوچەرخ، كە لێی بێبـەری بووە و بوونـی

خی بسەلمێنێ، خۆهاویشتنە نێو ئەو کۆمەڵە هەر وا ئاسان نیە، بەڵکو خەباتی دیموکراتی و شۆڕشی کۆمەڵایەتی دەوێ، ئەو کۆمەڵەش، کۆمەڵێ مەدەنییە، کە ڕەنجی چەندەها ساڵەی خەباتی گەلانە بە تایبەتی فەیلەسوف و بیرمەندان.. هتد.

لە سەدەی بیستەمدا: کورد شێوەکانی پێکهاتی دەوڵەتی لە دەست داو لە باریچوو، ئیتر بە هۆی هۆکاری دەرەوە بێت، یان هۆکاری ناوەوە، بەڵام لە سەدەی بیست و یەکدا و لە هەزارەی سێهەمدا کورد کەوتە نێو کۆمەڵی جیهانییەوە واتە کەوتە بەرچاوان و ڕێی بۆ کرایەوە گەشەی خۆی بکات و لە قۆزاخەی گۆشەگیریی و دواکەوتویی بێتەدەردوە وەك (تاك-کۆمەڵ-نەتەوە-لەوانەشە چوارچێوەی سیاسیش) ڕێگەی خۆی بگرێت و بەرەوپێش ڕێبکات، کارکردن بۆ چوونە نێو ئەو کۆمەڵە، هەروا کارێکی ئاسان نیە، بەڵکو زەحمەتی دەوێ شۆڕشی کۆمەڵایەتی هەمەلایەنەی دەوێ، ململانێی دەوێ، خۆڕاگری و ئازادی و دیموکراتی دەوێ، شۆڕشی روناکبیری دەوێ، بۆ چوونە نێو ئەو بابەتەش دەتوانین لە چەند دەرگایەك بدەین:

**کوردەواری**

کوردەواری بە هۆی بارودۆخی دیموگرافی و جوگرافی و سیاسییەوە، بووەتە کۆمەڵێکی شەق و شڕ، ئەو هۆکارانەی وایکردووە کە پێکهاتەی

کۆمەڵ لە نێوخۆدا دروست نەبێت، کە دوارۆژ ببێتە جێی دڵخۆشی بۆ بە کۆمەڵ بوونی کوردەواری بە گشتی کوردەواری، لەچین و توێژە جیاجیاکانی پێك نەهاتووە هەر بە شەلەلی ماوەتەوە، ئەگەر توێژەکانیش جودابوونەتەوەوەك شێوەیەکی سادە ئەوابە هەمان شەلەلی لەدایك بووە و بەرێوەچووە، واتە کوردەواری بە پێی قۆناغەکانی پرۆسێسی، چینی سروشتی دروست نەبووە هەربۆیە کۆمەڵ تووشی سەرلێشێواندنی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بووە چ لە رووی دەروونی و چ لە رووی کۆمەڵی یەوە، چونکە ئەو کۆمەڵە لە دەرەوەی خۆی گەشەی کردووە و چووەتە ناوەوەی خۆی کە ئەمەش بووەتە هۆی تێك شکاندنی خۆ لە خۆدا و لە دەرەوەی مێژووش، کە ئەمەش پرۆسیسی لەدایك بوونە لە دەرەوەی منالْداندا.

لێرەوە کۆمەڵێکی خەرەکەشکاو دروست بوو، لە سەرەوە بۆ خوارەوە و لە خواریشەوە بۆ سەرەوە، کە تاك و کۆمەڵ هیچ رۆلێك نابینن بۆ گەشەی کۆمەڵ بەڵکو زۆرجار دەبنە تێکدەر لە نێو کۆمەڵی خۆیاندا، واتە هەردووکیان لەو چوارچێوەیەدا بێنەوەی یەك بگرن لە پێناو خۆیاندا دەبنە (دوو توخم) دژی یەکدی رادەوەستن و یەکتری تێك دەدەن، دوایش بووەتە دارمانی ژێرخانی پێکهاتەی کوردەواری لە خۆدا، نموونەی ئەو هۆزە کوردانەی لە جوگرافیایەکدا دەژیان، هەمیشە دوور لە یەکتر، کۆشەگیر لە یەکتر، ئەم دژی ئەو دەجوولایەوە، ئەمەش

ڕێخۆشکەر بوو بۆ هۆکاری جوگرافیا کە کار زیاتر بکاتە سەریان و زیاتر لێك دابڕێن و دابەش بن و خۆیان تێك بشکێنن (ئیسماعیل بێشکچی) دەڵێ:

دیاردەی دووری هۆزەکان و لێك دابڕانیان لەسەر حسابی بەرژەوەندی سەرۆك هۆز وای لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتی‌یەکان کرد کە تێك بشکێن و یەك نەگرن سەرەڕای ئەوەش هۆکاری جوگرافی و دووری نێوان دێکان وایان کرد کە پەیوەندی و تێکەڵاوبوون لەلای تاکەکەسی کورد دورست نەبێت)، هیگل راستی کرد کە دەڵێ (شاخەکان خەڵکان دابەش دەکەن، بەڵام دەریاکان و رووبارەکان نزیکیان دەکەنەوە لە یەکتری)، واتە شاخەکان بوونە هۆی ئەوەی زیاتر (تاك–کۆمەڵ)ـی کورد لێك بترازێن و دوربکەونەوە لە یەکتری و دواجاریش یەك نەگرن، لەزهنی تاکی کورددا هەر ئەو روانینە سادەیەی هیگل و واقیعیەکەی ئیسماعیل بێشکچی خۆی دەنوێنێ، چونکە شاخ و بەرزایی و گرد، سنوورێك بۆ دەروونی کورد دادەنێ، کە نابێ لەگەڵ ئەودیو شاخ و گرددا نزیکی دروست ببێت، یان ناتوانێت نزیك ببێتەوە، ئەویش بە هۆی ئەو بەربەستە دەروونیەوە کە خۆی لە شاخە وێنەدارەدا دەبینێتەوە، ئەمەش کاری میکانیکی (خڕکردنەوەی تاکی لە کۆدا و– کۆی لە تاکدا)ـی وەستاند واتە تاکی کورد نەیتوانی لە کۆمەڵی خۆیدا سووری گەشەی ژیانی پێبگات هەربۆیە کودەواری بە (تاك... تاك) مانەوە و کۆمەڵێکی

تۆکمەیان لەناو خۆیاندا پێك نەهێنا ئەمەش واتای نەبوون بە (کۆ-کۆمەڵ-نەتەوە-دەوڵەت)، کە کۆمەڵ لە پێکهاتنی چەند تاك و تیرەیەك و خێزانێك و کۆمەڵێك پێك دێت، دەتوانێ پێکەوە کۆمەڵێکی گەورە دروست بکەن و دواجار دەتوانن بە هۆی گەشەی هوشیاری و بوونی کۆمەڵایەتی‌یان دەوڵەت دروست بکەن بەڵام کورد بە هۆی دووری خۆیان لە کۆمەڵەکەیان تووشی نامۆیی بەکۆمەڵ بوون و لێرەشەوە تووشی جۆرە وەهمێکی مەزنایەتی بوون یان تووشی شێتی مەزنایەتی (پارانۆیا Paranoia) کە زادەی پەرش و بڵاوی دەسەڵاتە، کە دواجار بووە هۆی دروست بوونی دەسەڵاتی بستەباڵاکان (هۆزی-پەترياركی-کلاسیکی.. هتد) کە چەند سەدەیەکی خایاند لە کوردەواری و، کوردەواریشی زیاتر تێك شکاند و لە (بوون بە کۆمەڵ)ـی بێبەش کرد، تاوای لێهات کۆمەڵێکی لاواز و گرژ و بێچارە دروست بوو لە دەروەی کۆمەڵ ئەم شکست خواردنی کۆمەڵایەتی‌یە وای لە تاکی کورد کردکە متمانە بە دەرەوەی خۆی بکات و پشت بە دەرەوەی خۆی ببەستێ، ئەمەش دووری دەروونی نێوان تاکەکانی کوردەواری دیاری‌دەکات و لە هەمان کاتدا بڕوا نەبوونە بە خۆ (بۆ بوون بە کۆمەڵ) دەتوانین ئەو تەگەرانەی بوونەتە هۆی دواکەوتنی کوردەواری دیاریان بکەین بۆ ئەوەی زیاتر لە کوردەواری بگەین، دەتوانین تاکی کورد لە روی دەروونیەوە شیبکەینەوە و ئەو تەگەرانە دەست نیشان بکەین، کە بوونەتە هۆی

**ئەوەی کورد، لە کۆمەڵدا خۆی نەبینێتەوە و دووربێت لە پەرەسەندنەکانی بوون بە کۆمەڵ.**

## تاکی کورد

**تاك یەکەیەکی مادی کەرەستەییە لە کۆدا، بە بێ تاك بوونی کۆمەڵ مەحاڵ و بێ کۆمەڵیش تاك مەحاڵ دەبێت، دەتوانین بڵێین کاری میکانیکی لەیەکتر دەکەن، گەر تاك لە دەرەوەی کۆمەڵدا کاربکات، کارکردنەکەی بۆ خۆی مردینکە، خۆی لێرەدا دەبێتە لەمپەرێك بۆ بوون بە کۆمەڵی خۆی. کە زیان دەبەخشێ بە کۆمەڵ لە رووی چەندایەتی‌یەوە زۆرجار لە رووی چۆنایەتیشەوە، پێشکەوتنی تاك بە کۆمەڵەوە بەندە و بە پێچەوانەشەوە، لەناو ئەو کۆمەڵەدا ململانێ سەرهەڵدەدات لە نێوان تاك و کۆمەڵ، کە دیاریشە سەرکەوتن بۆ کۆمەڵ دەبێت، نەك تاك، چونکە رێژەی کۆمەڵ زۆرترە وەك لە رێژەی تاك، گەر تاکیش هوشیار بێت، چونکە تاك بە تەنیا بوونی کۆمەڵی دیارناکات، هەروەك مارکس دەڵێ: (هوشیاری خەڵك بوونیان دیاری‌دەکات) تاك لە دەرەوەی کۆمەڵدا، نابێتە تاکێکی کۆمەڵایەتی، بەڵکو دەبێتە تاکێکی کلۆڵ و وشکهەڵهاتوو، لە هەمان کاتدا، واقیع بینانە نابێت و بیرکردنەوەی لە بازنەی گۆشەگیری تاکی خۆیدا خول دەخواتەوە و گەر هەوڵیش بدات لە کۆمەڵ بدوێ، لە دوورەوە ئەوا بێکەڵك دەبێت، ئەمە لە کاتێکدا کە کۆمەڵ هوشیار نەبێت، بەڵام بەلای کۆمەڵێکی هوشیارەوە ئەوا ئەو تاکە لەوانەیە ببێتە رێگەی بزاوتێك لە کۆمەڵدا، بەڵام کۆمەڵیش ئاراستەی هێڵی خۆی پیشان دەدات**

و لەو ڕێگایەوە تاك دەخاتە نێو بازنەی خۆیی و لە خۆیدا دەیهاڕێ، واتە دەیکاتە یەکێك لە کۆمەڵ و کۆمەڵی پێدروست دەکات و لە هەمانکاتدا دەیخاتە خزمەتی کۆمەڵ و بوونی ئەو کۆمەڵایەتیەش هوشیاری ئەو تاکە کەسە و ئەو خەڵکانە دیاری دەکەن، لێرەدا مرۆڤ یان تاك دەبێتە تاکێکی بەرهەم هێن و چالاك، نەك تاکێکی تەمەڵ و مشەخۆر و گۆشەگیر و راکردوو لە کۆمەڵ، بەم پێیە تاکی دابڕاو و دوور، دەچێتە نێو کۆمەڵ و گشت کۆمەڵێك دروست دەکەن.

کە تاك رۆڵی تیا دەبینێ لە پێشخستنی کۆمەڵدا و پێکهاتەیەکی تەواوی پێ دەبەخشێ و کۆمەڵ رزگاری دەبێ لە پەرش و بڵاوی خۆیی و تاکەکانی خۆی کۆدەکاتەوە لە پێناو کۆمەڵ و رەگەزەکەیدا کە تاکە ئەو تاکەی کە دەبێتە تاکێکی کۆمەڵایەتی.

ئۆگست کونت (١٧٩٨-١٨٥٧)ی فەرەنسی مەرجە بنەڕەتیەکانی سیستەم و ئارامگیری کۆمەڵایەتی لە ئیستاتیکای کۆمەڵایەتیدا، لە کۆمەڵزانییەکەیدا دەڵێ: (مەرجی بنەڕەتی بەدیهێنانی ئیستاتیکای کۆمەڵایەتی بریتیە لە پێکەوە گونجاندنی گشتی هەموو لایەنەکان).

## کۆمەڵایەتی کوردەواری

بە هۆی لاوازی ژێرخان و سەرخانی کوردەوارییەوە، گەشەی کۆمەڵایەتی قۆناغی خۆی نەدیوە، وەك کۆمەڵایەتی کە پێی بناسرێ، چونکە کۆمەڵ لە کۆمەڵایەتی خۆی نامۆ بووە ئەمەش وای کردووە کە کۆمەڵی کورد لە کۆمەڵە سەرەتاییەکاندا چەق بەست بێت و بمێنێتەوە

بۆ ئەوەی سەرخان بەکاربهێنرێ بیرێ لە ژێرخانی دارماو بکرێتەوە و دواجار بیکاتە فاکتەری دروست بوون، بۆ بوون بە پلان و پرۆسەی دروست بوونی کۆمەڵێکی کۆمەڵایەتی، ئەمەش بە گونجاندن لەگەڵ گەشەی سەرخانی (تاك-کۆمەڵ) لە هەموو روویەکەوە، واتا بەپێی هەل و مەرجی تایبەتی.

کە گۆرانکاری دەپێکێ لە کۆمەڵێکی دواکەوتوودا چوونە نێو کۆمەڵێکی کۆمەڵایەتی‌یەوە، کە خۆی پێشکەوتنە لە خۆدا، لە کۆمەڵێکی دواکەوتوودا زۆرجار گۆڕان دروست دەبێت بۆ بنیات نانەوەی، هەر نەبێ ئەوەی لە دەست چووە ئەویش بەهۆی پەرۆشی کۆمەڵ بۆ ئەو هەل و مەرجە تایبەتەی کە کۆمەڵ تێی کەوتووە، واتە جەختێکی تایبەت بۆ سەر گۆڕان، گۆڕانی کۆمەڵ لە بارێکەوە بۆ بارێکی دی، ئەم گۆڕانەش گۆڕانی کاتی دەبێت بۆ ئەوەی پرۆسەی بوون، بە کۆمەڵایەتی لە بارنەچێ، تا ئەو کاتەی وردە وردە پرۆسەی بوون جێگیردەبێت و کۆمەڵێکی کۆمەڵایەتی دادەنرێ و سەرلەنوێ کۆمەڵ بنیات دەنرێتەوە.

لە هەموو روویەکەوە، ئەمەش رێگایەکە بۆ پاڵنان بە رەورەوەی باری وەستاوی دواکەوتوو، بۆبەرەوپیچشەوەبردنی کۆمەڵ و، بووژانەوەی کۆمەڵ، لێرەدا کارێکی میکانیزمی دروست دەبێت بۆ پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە نێوان تاك و کۆمەڵدا بۆ بوونبە کۆمەڵایەتی، واتە هارپینی دوو کەرەستە لە یەکتردا کە وادەکات یەك بگرن، واتە پردی دووری

نێوان تاك و كۆمەڵ دەڕوخێنێ و لە یەكتردا ئاوێتە دەبێت، كە پرۆسەیەكی مەزنی بە كۆمەڵایەتیكردنی كۆمەڵە (چەمكی ئەركخوازی Functionism) ئەو زانایانەی كە پێیان وایە، تاك، نەسەقێكە و یەكێكیان ئەوی تر راست دەكاتەوە، هەروەها مەبەست لەم ئاقارە پێویستی زانینی رادەی ئەو تێكچڕژانە بێت، كە لە نێوان ئەو سیستەمانەی ژیانی كۆمەڵ وەك گشت پێك دێنن، لەگەڵ بەشی هەر سیستەمێك پاراستنی بەیەكەوە بەستراوی ئەو كۆمەڵە و لەبەردەوامبوونی یەكێتیەكەی)، لە كۆمەڵێكی دواكەوتودا هەندێ ئاستەنگ دێنە بەردەم ئەو سیستەمەی بەدیهێنانی ئەوەی لێ داواكراوە، یان ئەوەی دەیەوێ هەنگاو بۆ پێشەوە بنێت، ئەو ئاستەنگانە بەرە و رووی دەبنەوە، زۆرجار خۆیان لە سیستەمی ئایینی و ئابووری و ئایدیۆلۆژی خۆیان دەبیننەوە، بۆئەوەیئەو لەمپەر و ئاستەنگانە نەمێنێت، دەبێت سیستەمی نوێ، ئەو بەربەستانە بناسێت و چارەسەریان بكات. تا ئەو سیستەمە پشتیوانی پلان و دانانی گۆڕانكاریەكان بێت و بەرهەڵستكاریان نەكات.

هەروەك باسمان كرد لەبەرئەوەی كوردەواری نەبووەتە كۆمەڵێكی كۆمەڵایەتی چونكە نە تاك خزمەتی كۆمەڵی كردووە و نە كۆمەڵیش هەستاوە بە ئەركی پێویستی خۆی، بەرامبەر تاك. بە تایبەتی كە دەسەڵاتێكی تۆكمە بەدیناكرێ، كە یەكەكانی كۆمەڵ پێكەوە گرێبدات، لەبەرئەوەی تاكی كورد، دوورە لە كۆمەڵ و، كۆمەڵیش، نرخ و بەهای تاك

نازانێ و، تاكیش هەمیشە لە دەرەوەی كۆمەڵدایە و كۆمەڵیش بە هیچ نازانێ، ئەمەش واتای دووریەكی لێك تێنەگەیشتن، كە لاوازی ئەركەكان دەردەخات لە نێوان خۆیاندا، لەسەرێكی ترەوە ئەو دەرفەتە نەرەخساوە كە كۆمەڵ لەناو خۆیدا و لە ناوكی خۆیدا ببێتە كۆمەڵێكی كۆمەڵایەتی، داگیركەری كوردیش ئەو هەلەی نەداوە بە كورد كە كوردەواری ببێتە بەشێك لە كۆمەڵایەتی لە هەمان كاتدائەو بەشە كۆمەڵایەتی‌یەی خستۆتە خزمەت ژێرخان و سەرخانی كۆمەڵی خۆی، بەڵام ئەمەش پاسا و نیە، بۆ ئەوەی كوردەواری، نەبێتە كۆمەڵێكی كۆمەڵایەتی، بەڵكو هەڵنزیكبوونەوەیتاك لە كۆمەڵ و بەشداریكردنی لە پرۆسەی بوونبە كۆمەڵ، بۆ ئەوەی هەڵی بە كۆمەڵ بوونی كوردەواری، لەدەست نەچێ. دەتوانین هۆكەی لەم دیدەی خوارەوەدا ببینین:

## هۆی بە كۆمەڵایەتی نەبوونی كوردەواری

بە كۆمەڵایەتی بوونی كۆمەڵ، پرۆسەیەكی حەتمی‌یە، بۆ یەك گرتنی كۆمەڵ لەناو یەكتردا. واتە كارلێكردنی كۆمەڵایەتی لە نێوان دوو كەس و زیاتر لە پێناو قەدەغەكردن یان كەم كردنەوەی ململانێ و جیاوازی، ئەوەش شێوازێكە بۆ پێكەوە ژیان بە ئاشتی لە نێوان تاكەكان و گروپ و كۆمەڵەكاندا، یەك لە گەڵ یەكدی كە پەیوەندی‌یە كۆمەڵایەتیەكانی نێوانیان لە خۆدەگرن. ئەمەش دەبێتە گۆڕان لە شێوازی رەوشت و

هەڵس و کەوتیان، بە مەبەستی گونجان لەگەڵ کەسانی تردا، تاکی کورد نەیتوانیوە نە لە خۆی بگات نە لە کۆمەڵی خۆی، هەربۆیە بە زەحمەت دەتوانرێت یەك بگرن و یەکگرتنێك دروست ببێت، لەبەرئەوەی کوردەواری بە تاکەکانیەوە بەو قۆناغەدا تێنەپەریوە، کە چۆن پێکهاتەی کۆمەڵێك دروست دەبێت هەمیشە لە نێوان تاکەکای کورددا، هەستی زاڵ بوون هەیە، ئەم بەسەر ئەوی‌تردا، بەمەش بە هۆی ناهوشیاری کەسایەتی‌یان واتە تاکی کورد ویستویەتی کۆمەڵ بخاتە خزمەتی تاکی خۆی کە ئەمەش پێچەوانەی بوون بە کۆمەڵایەتی‌یە، لەبەرئەوەی (هوشیاری کۆمەڵایەتی گرنگی‌دانی تاکەکان بۆ ئاشنابوون بە رەوشتی کۆمەڵەکەیان و بەشداریکردن بۆ لە ئەستۆگرتنی لێپرسراوێتی)، چونکە تاکی کورد دەسەڵاتی نەدیوە لە سەروخۆیەوە، ئەو دەسەڵاتەشی کە دیویەتی لە ماوەیەکی کورتدا تێك چووە و رماوە، ئەمەش واتە بە هۆی رەشبینی تاکی کورد، بەرامبەر دەسەڵاتی کورد، تاکە کەسی کورد لە کۆمەڵ جیابۆتەوە و خۆی دووررادەگرێ لە کۆمەڵ، واتە بەشدارنەکردن لە بنیاتنانی دەسەڵات و بەڵکو چاوەڕوان کردنی دەسەڵات کە لە پاشەڕۆژدا وا لە تاکە کەسی کورد دەکات، کە دەسەڵات بیهێنێ و بیبات نەك ئەم پێگەی دەسەڵات دامەزرێنێ و کاری خۆی بکات، لەپرۆسەو بوونی دەسەڵاتدا، خۆ بینینەوە لە دەرەوەی بازنەی دەسەڵات و کۆمەڵ، واتە دوورکەوتنەوە لەدەسەڵات و کۆمەڵ وای لەتاکی کورد کردووە جۆرە

کەسایەتی‌یەك دروست ببێت کە بە زەحمەت رۆحی مل کەچ بوون بۆ کۆمەڵی خۆی یان بۆ تاکە کۆکەڵی خۆی هەبێت، ئەمەش شێوەی گونجان و لەیەك گەیشتن و پێکەوە هەڵ کردن دەشێوێنێ و گونجانی کۆمەڵایەتی پێك ناهێنێ داگیرکەریش ئەو کارەی بۆ چووەتە سەرو زیاتر درزی خستۆتە ئەو نێوەندەوە واتە لەتاك و تاکی کورددا و کۆمەڵ و کوردەواریدا، بۆ ئەوەی نەبنە کۆمەڵ و پێکەوە ژیانێکی کۆمەڵایەتی دروست نەکەن، کە پرۆژەی کوشتنی بەکۆمەڵایەتی بوونە. دیارە نەبوونی دەسەڵاتێکی گونجاو بۆ کوردەواری وادەکات کە تاکی کورد پەرش و بڵاوبێت و بیر لەیەك گرتنەوە نەکەن یان پرۆسەی بوون بەکۆمەڵ دوابکەوێ، سروشتی کەسایەتی کورد ئەوەی پێوە دیارە کە هەمیشە بۆ کۆمەڵی خۆی مل کەچ ناکات و لێبوردنی نی‌یە، کە یەکێکە لە کردارەکانی گونجانی کۆمەڵایەتی، کەچی تاکی کورد بۆ دەرەوەی خۆی لێبوردنی هەیەو ئامادەیە بۆ مل کەچ کردن کە سستی و لاوازی کورد دەردەخات بەرامبەر دەرەوەی خۆی هۆکاری ئەمەش ئەو رووداوە مێژووی‌یانەیە کە بەسەر کوردەواریدا هاتووە. بەتایبەتی چەوساندنەوەو قڕکردن، وای لە تاکە کەسی کورد کردووە کە هەمیشە رەشبین بێت سەرەڕای ئەوەش شکست هێنانی شۆڕشەکانی کورد جەختێکی تر بوون بۆ سەر تێك شکاندنی کەسایەتی و کوردەواری، بێگومان نامۆیی تاکی کورد لەوەدایە، کە نازانێت چەمکی گونجان و لێبوردن بەکاربهێنێ، بۆ

خزمەت خۆی، ئەویش لەئازادیو رادەربڕینو دیموکراسیەتدا خۆیان بەرجەستە دەکەن، تەنانەت لەپرۆسەی ئاشتی دەترسێو نازانێ بەکاری بهێنێ چونکە کورد ئاشتی راستەقینەی بەخۆیەوە نەدیوە سەرەڕای ئەوەی کە کورد هەمیشە لەپێناو ئاشتیدا جەنگاوەو قوربانی بۆ داوە، بەڵام بۆ نەگەیشتن بەئاشتی تووشی رەشبینی بووەو بەلایەوە نامۆیە لێبوردنو مل کەچ کردن، کە شێوازێکی عەقلانی و هوشیاریە بە پێویستی نازانێ بەڵکو بە زۆری دەزانێ و بەکەمزانی سەیری دەکات.

بۆیە بە زەحمەت ئەو تێکەڵاویە دروست دەبێت بۆ هاڕینی تاکی کورد لە کۆدا، ئەمەش دەردێکی مێژوویی خۆی هەیە کە هەر تاکێکی کورد خۆی بە ئاغایەك دەزانێ، تەنانەت زۆرجار تاك بە ناوی کۆوە دەدوێ و کۆش بە ناوی تاکەوە دەدوێ، واتە ئەم خۆی بەو دەزانێ و ئەویش خۆی بەم دەزانێ، کە بیرتەسکی و وشکی عەقڵی پێوەدیارە لەهەمان کاتدا پچڕ پچڕکردنی گوریسی کۆمەڵە. کەواتە پەندە کوردیەکە راستە کە دەڵێ: (تۆ ئاغا و من ئاغا کێ جێمان بۆ ڕاخا)، بە ئاغابوونی تاکەکەسی کورد، هەر لە مێژەوەیە وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی خۆی نواندووە، ئەو دیاردە ناشازە، بە هۆی تاکی کوردە و کاریگەرێتی لەسەر کەسایەتی تاکی کورد، بڵقی کردووە و سەر ئاو کەوتووە، بۆیە تاکی کورد زۆرجار لە ئاخاوتنیدا دەڵێ (ئێمە) ئەم (ئێمە) یەی پاڵپشت بووە بە هۆزێك - حزبێك نەك پاڵپشت بە سەرجەم کۆمەڵ، یان زۆرجار تاکی کورد لە

ئاخاوتنیدا دەڵێ (من) ئەم (من)ەی خۆی ئاغایەتی خۆی دیاریدەکات و پاڵپشت بە خۆیی و دەستەوتاقمەکەی نەك سەرجەم کۆمەڵ، لێرەش ئاغایەتی و تیرەیی و باوك سالاری، پێش کۆمەڵ و کۆمەڵ هاتووە و لێك داپچڕانێکی کۆمەڵایەتی دروست بووە، لە ژێر ئەو پرۆسە بستە باڵایانەدا، نەك یەکگرتن، ئەمەش وایکردووە کە دیاردەی دەسەڵاتی جیاجیا و پەرش و بڵاو لای هەریەك لە تاکەکانی کۆمەڵ دروست ببێت و لەگەڵ خۆیدا ڤایرۆسی کوشتنی ناوکی کۆمەڵ هەڵگرێ.

### ململانێ لەنێو کوردەواریدا

ململانێ هەر لەبەرەبەیانی مێژووەوە، بووەتە دیاردەیەکی سروشتی مرۆڤ، لەکۆمەڵ چین دارو کەسەکاندا ململانێ رۆڵی پێشکەوتن و عەقڵانیەتی کۆمەڵ دەبینێ و دەریدەخات، بەڵام ململانێ لەکۆمەڵێکی پەرشوبڵاوو خەرەکە شکاودا، رۆڵی تێك دەرانە دەبینێ، چونکە ئەو ململانێیە بێچارەسەر دەبن، بۆ کۆمەڵ و لەچوارچێوەی ململانێی شەریفانە تێدەپەڕن و جەنگ و کوشتن، جێگەی ململانێ دەگرنەوە، لەنێو کوردەواریدا.

ململانێ دروست نەبوو، تا لەسەر بنەماکانی عەقڵ و لۆژیك بەرێوەبچێت، هەرەمەکی بوەو لەپێناو بەرژەوەندی کۆمەڵدا نەبووە، بەڵکو لەپێناو (کەسێك - بنەماڵەیەك - تاقمێك - حزبێك) دا بووە، ململانێ دەبێ

پێشکەوتن، پێشکەش بەکۆمەڵ بکات. لەخزمەتی کۆمەڵدا بێت، نەك هەوڵدان بۆ زاڵ بوون، ئەم بەسەر ئەویتردا.
دیارە تاکی کورد رۆڵی ململانێی نەدیوە، لەگەڵ خۆیدا، یان تێی نەگەیشتووە، لێرەشەوە ململانێی ناو ناوکی کۆمەڵو لەپێناو کۆمەڵدا پەیدانەبوون، تا بیکاتە چەکێکی عەقڵانیو بەکاریهێنێ، کوردەواری دووربووە لەململانێی لۆژیکانەی ناوخۆ بەڵکو هەمیشە ململانێی بووە لەپێناو مانەوەی خۆیدا، واتە دژی دەرەوەی خۆی پەیرەوی کردووەو ململانێی ناو ناوکی خۆی لەیاد کردووەو فەرامۆشی کردووە، کە گەورەترین پرۆسەیە بۆ پێگەیشتنی کۆمەڵ، هەربۆیە زۆرجار ئەو ململانێیەی لەنێو کورددا روودەدەن، یان سەرهەڵدەدەن، توندوتیژی بەخۆیانەوە دەبینن، زۆرجار دەگاتە جەنگی تەواو، واتە رووبەڕووبونەوە بەچەك، کەئەمەش پێگەی دیموکراتیو ئازادیو ئاشتی دەکوژێ.

## چەمکی لێبوردن لای کورد

دەمارگیری بەهەموو شێوەیەکییەوە، دەبێتە بەربەستێکی ئەبستۆملۆژیو کۆمەڵایەتی، لەهەمان کاتدا بەشێوەیەکی ئەرێیەتی کاردەکاتە سەر پەیوەندیەکانی نێو کۆمەڵی مەدەنی، کەفرەییو، هەمەجۆری تەنانەت لێکنەچوونەکانیش دەگرێتەخۆ، سەرەڕای ئەوانەش دیالۆگو ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕاکان لەنێو چینەکانی کۆمەڵدا، تێك

دەدات، دەمارگیری لەکاکڵەکەیدا نەفی کردنی ئەویترە و زاڵ کردنی رایە بەسەر ئەویتردا، کە خۆی لەباوەڕو ئایدیۆلۆژیادا دەبینێتەوە، کۆمەڵێ بەشەری پێویستی بەبڵاوکردنەوەی بەهای باوەڕی لێبوردن هەیە، وەك دیدێکی مرۆڤایەتی و ئاکاری و گشت گیری، بیری گەوارکردنی ئەویتر لەهەموو مەیدانێکدا وەك سایسەت، دین، نەتەوەیی، کۆمەڵایەتی.

دیارە لێبوردن یەکێکە لەکردارەکانی گونجانی کۆمەڵایەتی، پرۆسەی لێبوردن، بۆ پاراستنی دۆستایەتی و گونجان و هاوکاری و هاریکاری، بۆ پاراستنی باری کۆمەڵایەتی و هاوسەنگ و لەنگەر راگرتنی هێزە کۆمەڵایەتیەکانە، دەتوانین بڵێین، پرۆسەی لێبوردن، پێویستی‌یەکی کۆمەڵایەتی و مێژووییە، بۆ کوردەواری، بۆ پێك هاتنەوەی کوردەواری و روخاندنی تەگەرەکان، لێبوردن پێویستە بۆ کۆمەڵێك کەبارودۆخی کۆمەڵەکەی شپرزەو نالەبار بێت، لێبوردن لای کورد چەمکێکی وشکی بەخۆوە گرتوە، ئەویش بەهۆی ئاڵۆزی و بیرکردنەوەی وشکی کەسایەتی مرۆڤی کورد، لێبوردن شێوازەکانی کەسایەتی و باری کۆمەڵایەتی بەرەو پێش دەبات و لەوەستان و گرژی رزگاری دەکات. کورد لێبوردن بەچەمکێکی زۆر قورس دەزانێ و بەتەنازولی دەزانێ، واتە گەر لێبوردنی هەبێت ئەوا خۆی بەکەم دێتە بەرچاو، ئەمەش ناهوشیاری کۆمەڵایەتی کورد دەردەخات، هەروەها زادەی نەبوونی ئەو ململانێ ژیریەیە کە کوردەواری پەی پێ‌نەبردووە، تاکە کەسی کورد شان ناخاتە ژێر چەمکی

لێبوردنو خۆی لێنادات، لێرەشدا نەبوونی دیموکراتی بووەتە هۆی کوشتنی پرۆسەی لێبوردنو ڕێی لەلێبوردنی تێك داوە.
کەسایەتی کورد کەسایەتیەکی تێك شکاوە و دوژمن فێری کردووە کە هەمیشە ملکەچی بێتو بیکاتە داردەستی خۆی، تاکی کوردیش بەدرێژایی ئەم مێژووە شکستە، وای لێهاتووە، تاکێکی ملکەچی لێدروست بێت، بۆ دەرەوەی خۆیو دڵ ڕەقو سەرکێش بێت، بەرامبەر کۆمەڵی خۆی، واتە دژایەتی کردنی کۆمەڵی خۆو نەبوونی لێبوردن بەرامبەر بەخۆ.
(ئیسماعیل بێشکچی) دەڵێ: (کورد لەکاتی داگیرکردنەکاندا لەلایەن دوژمنەوە مەبدەئی ڕازیبوونیان هەبووە بۆ داگیرکەران، بەڵام بۆ پوچەڵ کردنەوەی ئەو داگیرکاریانە هیچیان نەکردووە، بۆئەوەی وڵاتەکەیان بپارێزن، کەواتە سەربەستی تیرەو سەربەستی هەر تاکێکی نێو تیرەیەك پارێزراو بووەو هەروەها داگیرکەران دەستیان نەخستۆتە نێو کاروباری ئەو هۆزانە.. دەبینین کوردان بۆئەوە مل کەچ بوونو سەریان دانەنەواندووە بۆ داگیرکەران کە بەرژەوەندیان پارێزراو بووە، تا وای لێهاتووە، کەسەردانەواندن لەپێناو پاراستنی هۆزێكو کەسانی هۆزێك گەوار (قبول) بووە لەسەرشانی کۆیلە بوونی نەتەوەیەك)(٤).
هۆزی کورد بەهۆی ئەو سەربەستیەی دوژمن پێی داوە، کەبەرامبەر خاکەکەی بووە، لەهەمان کاتدا، ڕقەبەرایەتییەکیشی داوەتێ بۆ

بەرامبەرەکەی واتە بۆ تیرەیەکی‌تر، چونکە بەخشینی سەربەستی لەخۆڕا نی‌یە، بەڵکو مەرجی تێدایە، ئەویش سەربەستی‌و بەرژەوەندی تیرەو مل کەچ کردن‌و دژایەتی‌کردنی تیرەی دی، ئەمەش وای کردووە کە بەدرێژایی مێژوو ئەو رق‌و کینەو دژایەتی‌یە گەورە بێت‌و باری ئاسایی لێبوردن، لەکوردەواریدا بەرپوەنەچێت‌و توندوتیژی بەرامبەر یەکتری هەمیشە جێگەی لێبوردن‌و دیموکراتی بگرێتەوە.

هەنگاوەکانی کورد بۆ پرۆسەی لێبوردن قورس‌و گرانن ئەمەش دەگەرێنەوە بۆ نەبوونی دیموکراتی و لێك تێنەگەیشتن، دوژمن سەربەستی هۆزێکی بەلایەوە گرنگتربوو، چونکە تۆوی ناکۆکی بڵاودەکردەوە، تۆوی رق‌و کینەی بڵاودەکردەوە، هەروەك (ئیسماعیل بێشکچی) دەڵێ: (سەربەستی هۆزێك پیرۆزتر بوو لەسەربەستی گەلێك‌و کۆیلەکردنی، ئەمە رەوشی زۆربەی هۆزەکانی کورد بوو لەلای دوژمن)، کەوابێ لێبوردن و خۆپێکەوە ژیان‌و خۆهەڵگردن‌و خۆگونجاندن کارێکی پیرۆزە بۆ کورد، بۆ پێکهێنانەوەی بەشەکانی کۆمەڵ. ئەم هەلە مێژووییەی ئێستا وا پێویست دەکات، کەلێبوردن‌و تێکەڵاوبوون وەك (جان جاك رۆسۆ) دەڵێ: (هیچ کەس قازانج لەوە ناکات بەرامبەرەکەی بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە)(٥)، کەواتە ئەمە راستی ئەو مرۆڤەیە کە دەبێت لەسەر لێبوردن بژی، تاکو خۆشەویستی بڵاوبکاتەوە، چونکە مرۆڤ لەکۆمەڵدا دەتوانێت بژی کەلێبوردن‌و گفتوگۆی تێدا بێت، ئەم تێروانینەی مارکس لەنێو چەمکی دیموکراسیەتدا باسی لێوەدەکات.

## دەسەڵات

تاکی کورد، بەدرێژایی مێژووەکەی، لەژێر دەسەڵاتە جۆراوجۆرەکاندا چەوساوەتەوە، هەربۆیە بەچاوی‌تر سوتۆقێنەرو داپڵۆسین سەیری دەسەڵات دەکات، ئەمەش وەك گرێیەکی دەروونی لای تاکی کورد دروست بووە،، ئەم رەشبینی‌یە کەتووشی هاتووە بەرامبەر بەدەسەڵاتی کوردی لەچەوساندنەوەی دەسەڵاتی داگیرکەراندا بووە، کوردەواری، لەژێر فشاری ئەو دەسەڵاتانەدا، کۆمەڵێکی داخراوی سەرکوت کراویان لێ‌دەرچووە، کەهەمیشە ترسیان هەبێت بەرامبەر بەدەسەڵات، کورد بۆ خۆشی نەیتوانیوە سیستەمی داگیرکەر بگۆڕێ، چ لەناوەوەو چ لەدەرەوە، لەهەمان کاتدا نەشیتوانیوە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی، خەباتی پێ‌قبوڵ نەبووەو لەهەمان کاتدا، کوردەواری هوشیار نەبووە، تا شۆڕشێکی دی بکات. بێجگە لەشۆڕشی چەکداری درێژخایەن، مەسەلەی دەسەڵاتیش بەشێوەیەکی میکانیکی گواستراوەتەوە بۆ هزری هەر تاکێکی کوردو لەخۆیدا بەرجەستەی کردووە و وەك هەر تاکێك پێ‌ی گەوارەو پیادەی دەکات، ئەمەش وەك کلتورێك لەدوژمنەوە بۆی ماوەتوە، دیارە ئەو دیاردەیە، ترسناکەو زیان بەدەسەڵاتو تاکی کورد دەگەیەنێت، کە لەژێر یەك دەسەڵاتدا کۆنەبنەوە بەڵکو پەرش‌وبڵاوبن بەڵام بەهەمان دەسەڵاتی تاك گەرایی توندرەو دوایش دوورکەوتنەوەی تاکی کورد لەدەسەڵات، واتە دەرکەوتنی هێڵێکی وەهمی لەنێوان تاکی کوردو دەسەڵاتی کورددا،

**دوای راپەڕین دەسەلاتو دوو شێوەی گرتەخۆ:**

**یەکەم:**

بەهۆی راپەڕینەوە، توانرا دەسەلاتێکی کوردی دروست ببێت، ئەو دەسەلاتەی وەك پێویستی مێژوویی توانی جێگای خۆی بگرێت لەنێو دەرەوەدا، بەلام لەنێوخۆدا تووشی لێك دابڕان هات، هەندێ هۆکاری ناوەوەو لەپێناو بەرژەوەندیە تایبەتیەکاندا، ئەمەش وایکرد کە ئەو دەسەلاتە پەرش‌وبلاوبێت‌و لەژێر رەشمالێکدا هەلنەکەن‌و تاکی کوردی بێهیوا کرد لەدەسەلاتی کوردی.

**دووەم:**

تاکی کورد، پێش راپەڕین، لەدەسەلات دەترسا. بەلام دوای راپەڕین، دەسەلاتی کردە دەسەلاتی خۆی. بەهۆی باری نالەباری جوگرافی‌و سیاسی کوردستان، ئەو دەسەلاتەی کە کورد خەونی پێوەدەبینی، ئەو دەسەلاتە نەبوو وەك دەسەلاتی کۆمەلانی خەلك، هەربۆیە ئەو بۆشاییە لەنێوان کوردو دەسەلاتی کورددا دروست بوو کە تاکە کەس لەگۆڕانکاریەکان‌و بەرەو پێشەوچوونی دەسەلاتدا کارنەکات‌و کاریگەری خۆی نەبێت بۆیە لێك ترازانێك دروست بوو لەنێوان تاکی کوردو دەسەلاتی کوردیدا.

چارەسەر بۆ ئەو تەگەرەیە دەتوانین لەدوو خالدا کۆیان بکەینەوە:

أ-دەبێ تاکە کەسی کورد، بکرێتەوە بە بەشێك لەدەسەلات، هەروەها ئەو دەسەلاتە پەرش و بلاوانە بگەڕێنێتـەوە بـۆ دەسـەلاتی خـۆی، واتـە بـۆ حکومەت. ئەوجا دەسەلات بداتەوە بەکۆمەڵ، ئەمیش لەرێگای هوشیاری کۆمـەڵ خۆیـەوە، بۆئـەوەی ئـەو گـرێ دەروونیـە بڕەوێنێتـەوە کـە تاکـە کەسی کورد لای دروست بووە، بەرامبـەر بـە دەسـەلات، کۆمـەڵیش دەبـێ خۆی لەو دەسەلاتەدا بدۆزێتەوە، ئەمەش هەلێکە بۆ کۆمەڵ کە دەسەلاتی خۆی هـەبێت و ئـەوەی پێشـوو لـێ‌ی سـەندراوەتەوە بـۆی بگەڕێتـەوەو ئاشنایەتی دروسـت ببێـت لـەنێوان تـاکی کـوردو دەسـەلاتی کوردیـدا، ئەمەش لەرێ‌ی پێگە ئابووری و کۆمەلایەتی و روناکبیری‌یەکانەوە بەدی دێ.

ب-لەو روانگەیەی سەرەوە تاکی کورد شـەرعیەت بەدەسەلاتی سـەرەوە دەدات و لەهـەمان کاتدا خۆشی تیا دەدۆزێتـەوە کـە تاکێکـە کاریگـەری خۆی هەیەو، قورسـی خـۆی هەیـە، بـۆ بـەرەو پێشـەوەچوونی کۆمـەڵ، لەهـەموو روویەکەوە. بۆیە دەبـێ درێغـی نـەکات لـەو هەلـەی خـۆی کـە دەولـەت یـان دەسـەلاتی سـەرەوە، دەیداتــە دەسـتی، واتـە دەسـەلاتی خۆبۆخۆو لەخزمەت کۆمەڵدا، ئەمەش بەشداری‌کردنە لەدەسەلاتدا. بۆیە پێویسـتە لەسـەر تـاکی کـورد ئـەو هەلـە مێژووییـەی ئـەمرۆ لەبـەرچاو بگـرێ و بچێتـە نێـو ئـەو دەسـەلاتەوەو بەشـداری چالاکانـەش بکـات، لەپێناوی دەسەلاتی خەڵکدا، لەژێر هزی پێشکەوتندا.

بۆئەوەی دیاردەی دەسەلاتی سەرکوتکەر، لەدەروونی مرۆڤی کورددا بڕەوێتەوە، دەبێ تاکی کورد، کۆبکرێتەوە لەژێر رەشماڵێکی کۆمەلایەتیدا، بۆ بەشداریکردنەوەی لەبنیاتنانی ئەوەی خۆی دەیەوێ، واتە دەسەلاتی (خۆ- خەڵك) ئەوەش تاکە کەس دەکاتە مرۆڤ و بەرهەم هێنەرو دواجار ناچار دەبن بەهۆی پەیوەندییە (ئابووری - کۆمەلایەتی)یەکانەوە بێنە ناو دەسەلاتەوە، کە بە بەشێکی خۆیان دەزانن و ئەو ترسە دەرچێ لەدەروونی کورددا، کەدەسەلات دەسەلاتی خەڵکەو سەرکوتکەر نیە واتە دسەلات لەخەڵکەوە بۆ خەڵکە.

توماس ئەکوینی (١٢٢٧-١٢٧٤) (ئەوەی دووپات کردۆتەوە کە کۆمەڵی مرۆڤایەتی لەکۆمەڵە کەسانێك پێك دێت بەرێك‌وپێکی دەژین و ملکەچی کۆمەڵێك یاسای دادپەروەرن و لەپێناو یەك ئامانج و یەك ئامانجی هاوبەشدا، هەوڵدەدەن لەبەرئەوە کۆمەڵ پێویستی بەرێکخستنی کۆمەلایەتی هەیە بەمەبەستی رێکخستنی دەزگاکانی ئەو رێکخستنەش حکومەتە، بۆیە حکومەت بەپێویستی‌یەکی کۆمەلایەتی دەژمێردرێن) (٦). مارکس لەشیکردنەوەی ماددی‌یەکەی خۆیدا بۆ گۆڕانی مێژووی مرۆڤ جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە ئینسانەکان بۆ مانەوەی ماددی و فیزیکی خۆیان و بۆئەوەی وەکو مرۆڤ دووبارە خۆیان بەرهەم بهێننەوە، ناچارن کەبێنە ناو پەیوەندی‌یەکانی بەرهەمهێنانەوە، لەتێڕوانینی ماددی مارکسیدا بۆ شیکردنەوەی هۆیەکانی گۆڕان و ئالوگۆڕی مێژووی

مرۆڤ، لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی کۆمەڵایەتی بەرزترو گەشەکردووتر، کۆمەڵ خراوەتە پێش مەرجی بوونی مرۆڤ.

## شۆڕشی تاك - شۆڕی کۆمەڵ

بۆ گۆڕانی هەر سیستەمێك، یان هەر کۆمەڵێك، لەبارێکەوە بۆ بارێکی‌تر، بەشۆڕشێکی کۆمەڵایەتی دەبێت، ئەمەش بزوێنەری کۆمەڵی مرۆڤایەتی‌یە لەبارێکی وەستاو و دواکەوتوو بۆ بارێکی گەشەکردوو بوژاوە، شۆڕشە کۆمەڵایەتیەکان، لەهەناوی کۆمەڵدا لەدایك دەبن، کەخۆیان بەخواستی خۆیان پێی هەڵدەستن، ئەمەش بەهۆی پەنگ خواردنەوەی قەیرانە ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و فکریەکانەوە سەرهەڵدەدەن، بەهۆی داگیرکردن‌و شێواندنی کوردەواری، لەلایەن داگیرکەرانەوە.

شۆڕشەکانی کورد، شێوەی شۆڕشی کۆمەڵایەتی وەرنەگرتووە، بەڵکو سیمای شۆڕشی نەتەوەیی‌و وەرگرتبوو لەپێناو بەدیهێنانی مافی (خاك)، ئەوە سەدەیەکی تەواوی خایاند، بۆئەوەی کوردیش وەك نەتەوەکانی تری جیهان ببێتە خاوەن خاك، ئەو خاکەی کەلێی زەوت کراوە، بەڵام قەدەرو شانسی مێژوو ئەو هیوایەیەی بۆ کورد نەڕەخساند هەربۆیە شۆڕشەکانی کورد لەچوارچێوەی شۆڕشی کۆمەڵایەتی، نەگیرسایەوە. بەڵکو شۆڕشێکی درێژخایەنی دژ بەداگیرکەربوو، دەتوانین

بڵێین شۆڕشی کۆمەڵایەتی لای کورد نامۆیە، ئەوجا ئەو ململانێ کۆمەڵایەتی و چینایەتی‌یە دروست نەبووە کە کورد یان کۆمەڵانی کورد رۆڵی شۆڕشی کۆمەڵایەتی ببینن، بەڵکو هەر شۆڕشێك بووە دژی دەرەوەی خۆی، ئەمەش کاتی بۆ نەڕەخساندووە کەشۆڕشی کۆمەڵایەتی دروست بکات و لەهەمان کاتدا لەو چەمکە نەگەیشتووە کە شۆڕشی کۆمەڵایەتی، چ کاریگەری‌یەکی هەیە بۆ سەر تاك و کۆمەڵ، هەمیشە شۆڕش بەشێوەیەکی کۆمەڵی عەفەوی و سۆزی رووی‌داوە و کۆمەڵ و تاك، رۆڵی کۆمەڵایەتیان تیادا نەبینیوە. ئەمەش نزیك بوونەوەی نێوان تاك و کۆمەڵی دروست نەکردووە لەنێو بازنەی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتیدا تاکی کورد دوورەپەرێز بووە لەکۆمەاڵ، کۆمەڵیش هەروەها بایەخی بەتاکە کەس نەداوە، ئەمەش واتای نەبوو ی پەیمانی کۆمەڵایەتی لەنێو کوردەواری‌دا، دیارە بوونی کۆمەڵ و هوشیاری رۆڵی گرنگ دەبینێ لەو بوارەدا، گرنگی‌دانی تاك بۆ ناشنابوون و تێگەیشتن لەرەوشتی کۆمەڵایەتی بەشداریکردن بۆ لەئەستۆگرتنی لێپرسراوێتی و چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکان و چاك کردنی بارودۆخی کۆمەڵ، لەهەموو رویەکەوە، کەواتە لەسەر تاکە کەس پێویستەو لەجێگای خۆیەوە هەست بە بەرپرسیارێتی بکات، بەرامبەر کۆمەڵی خۆی، بۆئەوەی ببێتە کۆمەڵ و خۆی تیا بدۆزێتەوە. (دی سانت اکسوبری) دەڵێ (بۆئەوەی ببیتە مرۆڤ هەستی بەرپرسیارێتیت تیادا بێت) لای

هیگل (تاکە کەس، تاکێکی سەربەخۆ دەبێ وەکو (بەش) پاشان دەبێ لەگەڵ کەسانی دیکە پەیمان و پەیوەندی ببەستێ، بەوەش (بەش) لەئاکامی کۆبوونیان لەگەڵ یەکدی، گشت پێکەوە دێنن دوای ئەمە قەوارەی دەوڵەت، دەبێتە بەرجەستەیەکی پێویستی (بەش)و (گشت) دەوڵەت کۆبەندی تاک و گشتە، یاخود یا بڵێین: تاک و گشت بەجیا پێکەوە بنەوبنەمای هەرەمێك پێك دێنن، دەوڵەتیش سەری هەرەمەکەیە.
مرۆڤ کەخۆی دروستکەری ئامێرو ئامرازەکانی بەرهەم هێنان بێت بەخۆی بنچینەی کردەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی یە، لێرەدا مەرج و پێویستی یەکانی کۆمەڵ کردەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی هەڵئەسوڕێنن. گۆڕانی کۆمەڵایەتی پەرەسەندن و پێشکەوتنی کۆمەڵ، کێشەیەکی بابەتەکی یە، پێش ئەوەی حەزو ویستی خۆیەکی بێت. پەیوەندیە کۆمەڵایەتی یەکان لەنێوان خەڵکان لەسەر رێچکەیەك نامێنێتەوە، بەڵکو هەمیشە بەرەو پێشەوە دەچێ، بەڵام لەواقیعدا، هەر رووداوێك کە رودەدات، بۆ گۆڕانی رەوتی مێژوو تاکەکان، دەچنە نێو ئەو رەوتە کۆمەڵایەتی یە مێژووییەوە و رۆڵی خۆیانی تیادا دەگێڕن رێکی دەخەن و چوارچێوەی کۆمەڵێکی بەشەری دروست دەکەن، واتە تایبەتمەندێتی بۆ دروست دەکەن بۆئەوەی ببنە بەشێك لەمێژووی بەشەری لەجیهاندا.
دەتوانین پشت بەپرۆژە تیورە ببەستین بۆ هەنگاوەکان بەمەدەنی بوونی کوردەواری، ئەمش لەرێنماییەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا:

١-پەیمانی تاك - كۆمەڵ

ئەمشە پرۆژەیەكە، بۆ دروستكردنی، كوردەواری لەرێی لێك گەیشتنو گونجاندنو پێكەوژیان، لەو هەلومەرجە تایبەتەدا.

٢-پێویست بوونی دەسەلات

ئەمەش وەك پێویستی ناچاری، بۆ خڕكردنەوەی كۆمەڵ، لەژێر رەشمالی دەسەلاتدا، كە كاریگەری دەكاتە سەر دەروونی تاكە كەسی كورد بۆ ئاشنابوون بەدەسەلاتی كوردو لەوێشەوە هاریكاریكردنی دسەلات (لێرەدا دەولەت رووبەرووی كۆمەلانی خەلكییە، لەبەرئەوەی كۆمەلی مەدەنی پێك نەهاتووە. (هیگل كۆمەلی مەدەنی بەجودا لەگەڵ كۆمەلی سیاسی یان دەولەت بەنوێنەری كۆمەڵ بەتایبەتی مافو ئاقار دەزانێ) (٧). لەدیدی ئەودا كەسەكان لەرێگای كۆمەلی مەدەنییەوە دەگەنە ئاستی هاونیشتمانی واتە ئەندامێتی لەكۆمەلی سیاسیدا، هەروەها (گرامشی) دەولەت بەمانا فراوانەكەیەوە، بەخاوەن دوو لایەنو دوو كاریگەریی دەسەلاتو رێبەری دەزانێ، كەهەردووكیان تەواوكەری یەكترن.

٢-پەیمانی دەسەلات - كۆمەڵ

ئەمەش دەبێتە دروست بوونی دەسەلاتو، لەهەمان كاتدا خڕكردنەوەی كۆمەڵ، لەژێر دەسەلاتدا، كە هوشیاری بەخۆیەوە دەبینێ (توماز هابز كۆمەلی مەدەنی بە بەشێك لەكۆمەلی سیاسی دەولەت دەژمێرێ) (٨).

٤-پەیمانی کۆمەڵ - کۆمەڵ

واتە پەیمانی کۆمەڵایەتی لەنێوان (تاك - كۆ)دایە،. ئەمەش دەستپێکە بۆ خۆبەڕێوەبردن و زاڵ بوون بەسەر خۆدا، لێرەدا هوشیاری کۆمەڵ لەنێو خۆیدا پیشان دەدات و لەژێر چاودێری دەسەڵاتدا کە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی و هوشیاری بەخۆوە دەبینێ. بۆ هێنانەدی دەسەڵاتی کۆمەڵ، واتە هوشیارکدنەوەی خەڵك لەنێو خۆیانداو لەژێر چاودێری دەوڵەتدا دواجار یەکگرتنیان لەپەیمانێکدا بۆ گەڕانەوەی دەسەڵات بۆ خەڵك و خزمەت کردنی کۆمەڵانی خەڵك.

٥-پەیمانی کۆمەڵ - دەوڵەت

دوای شۆڕشی کۆمەڵایەتی و هوشیاری هاوسەنگی دروست دەبێت لەنێوان کۆمەل و دەسەڵات (دەوڵەت)دا، کەئەمەش مەرجی بنەڕەتیە بۆ گەیشتن بەدیموکراسی و پێگەکانی کۆمەڵی مەدەنی.

**سەرچاوەو پەراوێز:**

١)(كردستان مستعمرة دولية ل٢٩٥).

٢) تطور النظرة الواحديةی الی التاريخ، ص ١٠٧- بليخانوف.

٣) گۆڤاری (مەدەنيەت) ژمارە ٢م (١٠٤).

٤)كردستان مستعمرة دولية - اسماعيل بيشكجی ل (٢٩٦).

٥)(گۆڤاری مەدەينەت ژمارە ٢ ل٣٩٢).

٦) گۆڤاری مەدەنيەت ژمارە ٤ م١٠١).

٧) كۆمەڵی مەدەنی - ئەبوبەكر خۆشناو ل ٦٢

٨) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

## خێڵ و سیستەمی خێڵایەتی

خێڵ ڕۆڵێکی کاریگەر دەبینێ لە ژیانی سیستمی خێڵەکیدا خێڵەکان بۆ ئـــەوەی لەناونــەچن و مانـــەوەی خۆیـــان بپـــارێزن هەســـتاوون بـــە دروســتکردنی سیســتمێکی داخــراوی تۆکمــە بــۆ ناوکــەکانی خێــڵ و پاراســتنی نــاوخۆی کۆمــەڵ لــە هەڕەشــەی دەرەوە، ئــەویش بــەهۆی پاراستنی داب و نەریت و کەلتوورو بەرگریکردن و شەڕو شۆڕەوە، کە ببــوە نــەریتی خێڵــەکان، دیــارە پۆلاینــی خێــڵ خــۆی لــە تاکەکەســدا دۆزیوەتەوە، نەك زۆرینــەی ژمــارەی خێــڵ، ئــەویش بــەهۆی لێــهاتوویی کەســێکی پاڵــەوان و جەربــەزە کــە بوەتــە دەم راســت و ریــش ســپی و سـەردارو دوایـش کراوەتـە سـەرەك خێـڵ، دەبوایـە سـەرکردایەتی لـەنێو خێڵدا بێجگە لە سیفەتە خێڵەکییەکەی سیفەتی پاڵـەوانی ئەفسـانەیی هەبوایە کە ئەویش بەو هۆیە پیرۆز دەکرا تـا سـەرکردە وای لێـهاتووە

مردن و ژیان بەدەستی بێت، دەتوانین بڵێین بەرهەمی سەرکردایەتی پاڵەوان و جەربەزە خێڵ بووە، لە چوارچێوەیەکی بوچکدا کە دواجار توانیویەتی ئەو سەرکردایەتییە فراونتر بکات ئەویش بەهۆی دەست بەسەرداگرتنی خێڵەکانی ترو کۆنترۆڵکردنی ناوچەکانی تر لە هەموو روویەکەوە، گەر دسپلین سەرکردەی خێڵ نەبوایە نەدەتوانرا سەرکردایەتی ناوچەیەکی گەورە بگرێتە دەست و بیروباوەڕەکانی بەسەر ناوچەکەدا پەخشبکات، کە بەوەش زۆر جار دەبووە رزگارکەر بۆ گەلانی تر لەژێر چەوساندنەوەی سیستمێکی تردا، دیارە زەبور زەنگ کاریگەری گەورەی کردۆتە سەر مرۆڤی سەرەتایی چونکە هێزو بازوو توانی رێڕەوەکانی قۆناغی مرۆڤایەتی بگۆڕێن کە لە خێڵدا بە بنەمای یەکەم سەیر دەکرا، دەتوانین بڵێین بەهۆی ئەو زەبرو زەنگەوە خێڵەکان یەکتریان گرتووەو لەیەك خێڵی گەورەداو لە سیستمێکی فراوانی دەسەڵات داردا کۆببنەوە و مل کەچی ئەو واقیعەی خۆیا بن و یەك سەرداریان هەبێ ئەمەش رژێمێکی فیدراسیۆنی خێڵایەتی دروستکردو هێنایە بەرهەم، ئەوەیش بەهۆی تواندنوەی خێڵە بێهێزو لاوازەکان لە بۆتەی سیستەمی خێڵێکی گەورەدا، واتە دروستکردنی پێکهاتەی خێڵێکی پتەوو گەورە کەلە دەوڵەتێك سەرەتایدا خۆیدەبینیەوە، دیارە ئەو فراوان بونەو ئەو سیستەمە پێویستی بە دام و دەوگایەکی پتەو هەبوو بۆ بەردەوامبوونی ژیانی خێڵ، هەموو سیفەتەکان یان هەموو ئەو

هێزانە کۆدەکرایەوە لە سەرکردەی خێڵدا بەرجەستە دەکرا بۆ ئەوەی شیرازەی ئەو سیستمکە تێکنەچێت سەرکردەی خێڵیش بەهۆی مل کەچ بوونی ئەندامانی خێڵ و ریشسپیانی خێڵەکانی دی پیرۆزی زیاتر بۆ خۆی مسۆگەر دەکرد، کەوابێ سەرکردەی خێڵ هەم پارێزەری خێڵ بوو هەم پارێزەری کلتوورو داب و نەریتی خێل بوو، لە هەمانکاتدا تاکی خێڵ بووە، ئەویش لە بەرەکانی جەنگدا شانبەشانی ئەندامانی خێڵ دەجەنگاو خێڵی لە شالاوە دەرەکیەکان دەپاراست ئەمەش وایدەکرد کە سەرکردەی خێڵ رۆحی ئەندامانی خێل داگیربکات و ئەندامانی خێڵ زیاتر قوربانیان دەدا و زیاتر لە دەوری خڕدەبوونەوە، دەتوانین بڵێین بەرهەمی ئەو سەرکردەیە خۆی لە خۆیدا کۆمەڵگەیە، کۆمەڵگەش خۆی دەخاتە نێو بازنەی سیستمەکەیەوەو ملی بۆ کەچ دەکات کە دەزانێ دەیپارێزێ و بژێوی بۆ دابیندەکات سەرکردەی بلیمەت ئەو هەلانە دەقۆزنەوەو بەلای خۆیدا رایاندەکێشێ و لەو هێزەوە کە هەیەتی دەکەوێتە بڕیاردانی هەندێ یاسای دی کە لەسەرو یاساکانی خێڵەوەیەو دەیهێنێتە نێو ئەو پێکهاتە خێڵەکییەوەو بەتوێزی دەیسەپێنێ بەسەر ئەندامانی خێڵدا ئەمیش بەهۆی ئەو پەشێویەی کە زۆرجار لەنێو خێڵدا روودەدات بۆ ئەوەی شیرازەی خێڵ و سیستەمی خێڵ تێکنەچێت، چونکە سەرکردەی خێڵ دەزانێ کە شیرازەی خێڵ تێکبچێت شیرازەی سەرکردایەتی تێکدەچێت و لەدەستی دەدات هەر بۆیە ئەو یاسایانە

دەکاتە بەشێك لە داب و نەریتی خێڵ ئەمەش پاڵپشت بە ئەفسانەکانی کۆن و کلتوری باپیرانی خێڵ، خێڵیش لە حاڵەتی پشێویی دەگۆڕی بۆ حاڵەتێکی پێویست بوون و کۆمەڵایەتی بوون واتە لە سیستەمی خێڵایەتییەوە بۆ سیستمێکی فراوانتر ئەمەش هۆکاری ئەو هەل و مەرجانەیە کە رۆژانە لەناو خێڵدا روودەدەن سەرکردەی خێڵ لەو فراوانبوونی خێڵەدا زیاتر پێویستی بە دسپلینی یاساکانەو زیاتر خۆی تێدا تواندەکاتەوە، لێرەوە سەرکردەی کاریزمی خێڵی دروست دەبێت کە دواجار خۆی دەچوێنێ بە کەسێکی جیاواز و ئەفسانەیی و تەنانەت خۆی لە پاڵەوانی ئەفسانەکان بەدیدەکات و بەرجەستەی دەکات و کەسایەتییەکی تر دەدات بە خۆی کە خۆی لە سەروو ئەندامانی ترەوە سەیردەکات ئەوانی تر تەنها گوێڕایەڵ دەردەچن، ئەم جۆرە سەرکردانە دوای مێژوویەکی دوورو درێژی خێڵ سەرهەڵدەدەن، زۆرجار سەرکردەی کاریزمی بەهۆی لووتبەرزی و خۆ بەگەورەزان و خۆبەپاڵەوان و مل هوڕزان شیرازەی خێڵ تێکدەچێت و سەرکردایەتی لەدەستدەدات، ئەویش یان بەهۆی ئەوەی ئەندامانی خێڵ لە زمانی سەرکردەی کاریزمی ناگەن یان سەرکردە، وای لێدێت گوێ بۆ بۆچوون و دابونەریتی خێڵ نەدات، هەربۆیە خێڵ سنووری خۆی دەشکێنێ و بەگژ کاریزمادا دەچێ و سەرکردایەتی لەدەست دەچێ و سیستەمی خێڵ لەناوەوە تێکدەشکێنێ کە یەکگرتنەوەیان زۆر زەحمەتدەبێ.

**خێڵ لای کورد**

کـورد لـە بەرەبـەیانی مێژوویەکەیـەوە لـەنێو سیسـتمێکی داخـراوی خێڵەکیدا دەژی، داخراو بەرامبەر بە بـرای خوێنـی و کـراوە بەرامبـەر، بەرامبەرەکەی، (دوژمنەکەی) واتە هەر کەسێ دژی بەرامبەرەکەی (برای خوێنی) بێ ئەم لەگەڵیدا بووە ئەمەش کاکڵەی فیدراسیۆنی خێڵەکێ تێکشکاندووەو خێڵەکان بە پەرتەوازەیی ماونەتەوەو دوور لە یەکتری، خێڵی کورد زۆر جار خۆی خڕ کردۆتەوە لەژێر سەرکردەیەکی ئاینی ئەمەش هەوڵدان بووە بۆ دروستکردنی قەوارەیەکی گەورەی تر لە خێڵ، بەڵام لەناوچوونی سەرکردەی بزوتنەوەکان و گۆشەگیری هەندێك خێڵ و خیانەتکاری هەندێکیان وایکردۆتەوە کە هەمدیسان خێڵەکان بچنەوە باری گرژی و بەگژ یەکدا بچنەوەو سیستمێکی خێڵایەتی پتەو فراوان دروست نەبێت، زۆرجار بەرژەوەندی کـۆی کردونەتـەوە بـەڵام زۆری نەخایاندووە ئەو بارە تێکچـووە، ئـەویش بـەهۆی بـەرژەوەندی زیـاترو زۆرتـر، دیـارە هۆکـاری یەکنـەگرتن و دروسـت نـەبوونی سیسـتمێکی خێڵایەتی پتەو دەگەڕێتەوە بۆ بەرژەوەندی بنەکاڵەکان و سەرکردەی خێڵەکان ئەوجا مەسەلەی دین و مەزهەبەکان کە هۆکارێکی گرنگ بوون بۆ لێکترازانی بنەماڵەکان و خێڵەکان، کە دەبوایە مەسەلەی دین کارێکی ئیجابی بکردایە بەڵام کارێکی سلبی کردە سەر ڕێکخستنی خێڵەکان، کە

به هۆیانەوە زۆربەی بزووتنەوەکانی کورد توشی پوکانەوەو روخاندن و شکست هاتن، کەوابێت خێڵ لای کورد ئەو سیستەمەیە کە هەر خێڵێك بەرژەوەندیە تایبەتییەکانی خۆی تیادا دەپارێزێت بەهەر نرخێك بێت گەر لە دەستدانی خێڵێکی تریشبێت لێرەوە (ئێمە دژی ئەوانی ترین) بوە یاسای نێو خێڵ و سیاسەتی دەرەکی زیاتر ئەو دژایەتیەی فراوانتر دەکرد چونکە یەکگرتنی خێڵەکان لەناوچونی بەرژەوەندیەکانیان بوو، یەکگرتنی خێڵەکان دروستکردنی سیستمی دەوڵەت بوو، هەر بۆیە سیاسەتی رۆژانەیان و خێڵە کوردەکانیان دژی یەکتر دەگرد، بەهۆی ئەو دەستتێوەردانانە دەرەکییەوە نەتوانراوە بارێکی ئاسایی بۆ کوردو خێڵی کورد بڕەخسێ تا بتوانرێت لە ماوەیەکی مێژوویدا خۆی خڕیکاتەوە، خۆی رێکبخات و خۆی دروستبکات وەك خێڵێکی گەورە دیاربکەوێت، ببێتە جێی مەترسی بۆ دەوروبەر، هەر خێڵێك یان هەر سەرکردەی خێڵێك گەر توانیبێتی کنترۆڵی چەند خێڵێکی تربکات یان چەند ناوچەیەك لەژێر سیستمی خۆیدا بەڕێوە بەرێ بۆ پێکهێنانی ئامانجێکی گەورەتر لەخێڵ، سەیردەکەین دوای ماوەیەکی کەم ئەو سیستمەی رووخاوەو نەماوە، هۆکارەکانیش هەمدەرەکی بووە هەم ناوەکی بووە، بەڵام هۆکاری دەرەکی زیاتر جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە یەکگرتن دروست نەبی لەناو خێڵە کوردەکاندا سەرکردەی خێڵیش کاری دوژمنی ئاسانتر کردووە چونکە هەمیشە بەرژەوەندی

خۆی زیاتر پاراستووه وەك لە بەرژەوەندی هەموو، ئەمەش بووەتە هۆی دروستنەبوونی سەرکردەیەکی خێڵی یان کاریزمایەکی خێڵی کە هەموو خێڵەکان ببات بەڕێوە، بەڵکو ئەو کاریزمایانە بەهۆی جوگرافیاو سیستمی خێڵەوە لێرەو لەوێ دەرکەوتوون ئەویش لەسەر بنەمای خێڵایەتی نەك ئایدیۆلۆژی یان نەتەوەیی یان نیشتمانی.

### خێڵی کوردو سەرکردە

لەبەر لێك ترازان و پەرتەوازەیی سیستمی خێڵ لەناو یەکتریداو بڵاوبوونەوەیان بە پانتایی جوگرافیایەکی گرژدا لێرەو لەوێ سەرکردەی خێڵ شێوەی سەرکردەی کۆلکە کاریزما دروستبووە، کەسایەتی وشك و دەمارگیری بنەماڵەییان ڕێی پینەداون لەگەڵ بەرامبەرەکەیاندا پەیمانێك ببەستن لە پێناو بەرژەوەندی هەمووداً، بەڵکو ئەو کەسایەتییە لەبەر لوتی زیاتر هیچی تری نەدەدی لێرەشەوە (منی بالا) (هەرمن سەرکردەم) وەك یاسای سەرکردایەتی دەرکەوت لەنێو بازنەیەکی تەسکدا کە هەمیشە داخراو و دوور لە گۆڕانکاریەکانی دەوروبەر واتە هەمیشە دووری و هەمیشە دوژمنایەتی، ئەم دوو چەمکە وشکەو بێ بنەمایە ڕێگە خۆشکەر بوو بۆ پیرۆزی سەرکردەی خێڵ لە ناوەوەو سەرکردەش ئەو بارە نائاساییەی قۆزتەوەو خۆی زیاتر پیرۆزکردن ئەویش بەهۆی پاراستنی داب و نەریتی خێڵەوە، لێرەشەوە هەم لای ئەندامی خێڵ و

دەرەوە خۆیان بەدینەکردوەو هەمیشە لە ناوەوەی درۆی خۆیاندا ژیاون که ناکاته هیچ، سەرکردەی خێڵیش لە ڕێگای شەڕوشۆڕو زیاتر لاوازی و ملکەچکردنی بۆ دەرەوەی خۆی (دژە برای خوێنی) توانیویەتی خێڵ زیاتر بپەستێ و بیترسێنێ و لە هەمانکاتدا بۆ پاراستنی خۆشی لە ئەگەرەکانی کوشتن و لەناوبردن، سەرکردەی خێڵەکان نەیانتوانیوە پەتی خێڵایەتی بپچڕن و خۆیان لەو گرژییە رزگاربکەن ، چونکە بەرژەوەندی وای دەخواست کە سەرکردەی خێڵ دەبێ سەرکردە بێت لەنێو خێڵدا لە دەرەوەی خێڵ هیچ بایەخێکی نامێنێ، ئەمە نەك سەرکردەی خێڵی دەگرتەو، بەڵکو ئەندام خێڵیشی دەگرتەوە کە دەرچوون لە سیستمی خێڵ لە دەستدانی قەوارەو ناسنامەی بووە، چونکە ناسنامەی ئەندامی خێڵ بە تۆ کێیت؟ سنووردار نیە بەڵکو بەتۆ کوڕی کێیت، یان سەر بە چ خێڵێکیت؟ سنووردار کراوە بڕوانە (العصبیه و الدوله/ د. محمد عابد الجابری/ لاپەڕە ٢٥٦ بغداد)، نە سەرکردەی خێڵ و نە ئەندامی خێڵ نەیانتوانیوە لە دەرەوەی خۆیاندا بدۆزنەوە و بیریش لەوە نەکراوەتەوە واتە چۆن هاتووەو ئاواش ڕۆیشتووەو بووەتە هۆی خۆخۆری لەنێو ئەندامانی خێڵدا، ئێستاش کۆمەڵگەی کوردی کۆمەڵگەیەکی خێڵەکییەو بنەماڵەییە بەلام کەمێك فراوانە واتە سیستمێکی تری بۆ خۆی پێکهێناوە ئەویش سیستەمی (حزب)ە، کە خێڵ حزبێك بەڕێوەدەبات یان بنەماڵەیەك ئەمەش واتای گۆڕینی بەرگی

خێڵە بۆ نێو بەرگی حزب، لەو سیستەمەدا واتە لە سیستمی حزبدا بۆیە دەبینین زۆر لە خێڵەکان گۆشەگیر بوون و پەیوەندی نابەستن بەو سیستمە نوێیەوە، چونکە دەزانن لەناو دەچن، واتە تێکەڵ دەبن و دەتوێنەوە، لێرەشەوە مانەوەی خێڵ لە دەرەوەی حزب مەترسییە بۆ حزب کە لە چەند خێڵێك یان بنەماڵەیەك پێکهاتوون و سەرەڕای ئەوەش چەند چین و توێژێك لەخۆدەگرێت، سیستمی حزبیش دەزانێت کۆمەڵگەی کورد لە دەرەوەی حزبەکەیدا کۆمەڵگەیەکی خێڵەکییە ئەویش ناچار دەبێت بە زیاتر بوژاندنەوەی خێڵ و خێڵایەتی و لایەنگیرکردنی خێڵ و سەرکردەی خێڵ بۆ ئەوەی ژمارەی حزب (چەندایەتی) زۆر بێت و سنوری حزبەکەی زیاتر فراوان بکات و لە هەمانکاتدا پتەوی بکات، ئەمەش لە پێناو بەرژەوەندی دەسەلات بۆیە زۆرجار دەبینین حزبێك کێشەی خێڵێك چارەسەر دەات بەو بۆنەیەشەوە دەتوانێت رایکێشێت بەلای خۆیداو سنووری خۆی پێ بەهێزبکات، سروشتی خێل ئەوەیە خۆی لە ئەگەرەکانی دەرەوە بپارێزێت، خێڵ لە دەرەوەی سیستمی حزب تا دەتوانێت خۆی دەپارێزێت لەنێو چوونە نێو حزب، بەلام بەهۆی هەندێك شتی لاوەکی و دوژمنایەتی و خوێنڕشتن وایلێدێت خۆی بخزێنێتە ناو سیستمی حزبێکەوە کە هەر هەمان پێکهاتەی خێڵی تێدایە بەلام لە چەند گروپە خوێنێکی جیاواز خڕبوونەتەوە، ئەمیش خوێنی بلاو دەبێتەوەو نامێنێ، واتا لە دەستدانی خێڵایەتی، دەتوانین بڵێین

تواندنەوەی خێڵ لەناو حزبێکدا کارێکی باشە بۆ نەهێشتنی خێڵایەتی و سیستمی خێلایەتی، بەڵام دەبینین زۆر جار حزبەکان لەبەر هۆی شەڕو بەرژەوەندی تایبەتی هەڵدەستن بە بوژاندنەوەی خێڵ، تەنها بۆ ئەوەی حزبێکی تری پێ بڕوخێنێ، ئەمەش واتای یاسای خێڵەکی بەڵام بەشێوەیەکی دی، کەواتە خێڵ لە پشت هەموو شتێکەوە دەبینرێن ئەم بایەخدانەش ئەوە دەگەیەنێ کە سیستمی خێڵ تا ئێستاش هەر لە ئارادایەو بنەبڕ نەکراوە، دەسەڵات و حزبەکان ئەو سیستمە دەپارێزن و زۆرجار بەرگریشی لێدەکەن، کە لاوازی حزبەکان نیشاندەدات، سەرکردایەتیش لای کورد لاوازە، نەیتوانیوە بەسەر خێڵدا زاڵ بێت، یان لەنێو خۆیدا بیتوێنێتەوەو کەسایەتییەکی تری پێبناسێنێت و دەسەڵاتێکی تر بە خێڵ بناسێنێ کە لە سەرو خێڵەوەیە ئەویش دەسەڵاتی حکومەتە، ناچار هەمیشە خێڵ لەبەرچاو دەگیرێت و چین و توێژە رۆشنبیرەکە ناوخوێنێتەوە، هەربۆیە دەتوانین بڵێین خێڵ لە پێشەوەی کۆمەڵگەی کوردی بە ژمارەیەك دێت و حسابێکی وردی بۆ دەکرێت ئەمەش وایکردووە کە کۆمەڵگای کوردی لەنێو ئەو سیستمەدا بێت و بچێت بە شێوەیەك نە ئەوەتا پێشبکەوێت و سیستمی خێڵ بەجێبهێڵێت یان دوابکەوێت و ببێتەوە بەخێڵی بەبەر، تا ئێستاش هەمان سیستمی کۆن پیادەیەو هەمان خێڵ و هەمان سەرکردەی خێڵ دەیبات بەڕێوە بەڵام لە بەرگێکی ترداو لە سیستمێکی تردا.

# کەسایەتی تاکی کورد لەنێوان گرگنێتی و راستەقینەدا

هەندێ کەس هەن وا تێدەگەن کە کەسایەتی ئەوەیە رووکەش بێت و تەنها لەدەرەوەی کەسایەتی ناوەوە ببینرێت و تاوای لێدێت گوزارش لەکەسایەتی ناوەوە دەکات، ئەمەش ئەوجۆرە کەسایەتیەیە کە تاك دووچاری دێت بۆ پڕکردنەوەی کەسایەتی ناوەوەی خۆی، واتە بۆ پینەکردنی ئەوەی نیەتی بەلاَم لەڕاستیدا ئەمە کەسایەتیەکی بۆش و دوور لەواقیعی خۆی نیشان دەدات، ئەمە جۆرە نەخۆشییەکی ساویلکانەیە کە تاکە کەسی بێ کەسایەتی دووچاری دێت و تووشی حاڵەتەکانی گومان و هستیریاو لەخۆبایی و فشەڵ دەبێت و تاوای لێ دێ ئەو کەسە دەبێتە میزەڵدان و زیاتر بۆ رواڵەتەکانی دەرەوە فوو دەکاتە خۆی بۆئەوەی کەسایەتی مت بووی ناوەوەی خۆی یان کەسایەتی لەبیکراوی خۆی پێبدۆزێتەوەو بیکاتە سەنگێك بۆ خۆی وا پیشان بدات کە ئەم کەسایەتیە بووەتە هەمان کەسایەتی ناوەوەی، بەلاَم ئەمە

هەڵخەڵەتاندنی خۆی یان خۆی وا نیشان دەدات‌و زیاتر دووركەوتنەوە لەكەسایەتی خۆی والاّ دەكات، بەزۆر دروست كردنی كەسایەی بۆ تاك كەدەبێتە نالەباری تاك خۆیی‌و وون كردنی خۆ لەكۆمەڵداو دواجار وەك نەخۆشیەكی دەروونی نێو كۆمەڵگا دەردەكەوێت‌و سەرجەم كۆمەڵگا تووشی ئەو پەتایە دەبێت، تاكە كەس بەهۆی شكستی دەروونی‌و قەیرانی كۆمەڵگاوە دووچاری ئەوجۆرە كەسایەتیانە دەبن كەوەك كرگن خۆیان دێتە بەرچاو، ئەمەش بەهۆی زاڵبونی كەسایەتی ناڕاستەقینە بەسەر كەسایەتی راستەقینەدا كە لەدەروونی تاكدا بەدی دەكرێ واتە خۆبەزل بینین‌و خۆبەگەورە بینین لەهەمان كاتدا هیچ لەبار نەبوو كەئەمەش وا دەكات ئەو كەسایەتیە گرگنە هەمیشە وێزەی كەسایەتی راستەقینە بگرێ‌و نەیەڵێ وەك خۆی یان وەك كەسایەتی سەربەخۆ هەڵتۆقێ یان لەدایك ببێ.

هەمیشە زاڵبوونی كەسایەتی گرگنی بەسەر كەسایەتی راستەقینەوە دیارە بۆیە هەمیشە سەیر دەكەین كەسایەتی گرگن لەڕواڵەتیەوە سەیری ناوەوەی دەكات‌و ناوەوەش هەمیشە چەپێندراو دەبێ بەهۆی سەختی‌و زاڵبونی كەسایەتی گرگن بەسەر كەسایەتی راستەقینەدا تاوای لێدێت ئەو كەسایەتیە لەوەهمێكی دەروونی قوڵدا بژی‌و خۆی نەدۆزێتەوە، ئەو كەسایەتیە گرگنە ناوەوەی مرۆڤی كوردی داگیر كردووەو لەگەڵیدا دەژی وەك مڵۆزمی لێهاتووە بۆ پێكهاتەی كەسایەتی كورد كەنایەڵێ خۆی

پێکبهێنێ، وەك ئەوەی پێی بڵێ (نابێ لەمن جودا ببیتەوەو دەبێ تامردن لەگەڵ مندا بژیت)

کەسایەتی راستەقینە وای لێهاتووە کەپەی بەخاڵە لاوازەکانی کەسایەتی گرگن نەکات بۆئەوەی بیدات بەزەویداو خۆی لێ جودا بکاتەوەو خۆی لەو ملۆزمە رزگار کات، چونکە دروستکەری سەرەکی خۆیەتی بۆیە کەسایەتی گرگن گاڵتەجاڕی پێدەکات و دووری دەخاتەوە لەڕاستی خۆیی و بەلایەکی تردا دەیبات و کەسایەتی راستەقینە ناشتوانێ ئەو ململانەیە بکات لەگەڵیدا چونکە چاڵ دەزانێ کوشتنی خۆی تیا دەبینێتەوەو کوردیش یان بڵێین کەسایەتی کورد ئەو ئامادە باشیەی تیا نیە کەخۆی جارێکی‌تر بکوژێت و کۆتایی بەژیانی ئیمپراتۆریای گرگنی خۆی بهێنێ و کەسایەتی راستەقینەی خۆی راگەیەنێت. دیارە یان بۆی ناچێتەسەر یان ناتوانێ، ئەمەش لەحاڵەتەکانی ژیانی رۆژانە دووبارەو سێ‌بارە دەبێتەوە مێژوویەکی درێژیشی خایاندووە کەهەمیشە هەر سەیری دەرەوە کراوەو ناوەوە لەبیر کراوە تەنها لەیەك مەبەست سەیری ناوەوە کراوە ئەویش لەخۆدوان و بەس واتە کەسایەتی گرگن هەمیشە سەیری خۆی کردووەو لەناوەوەی کەسایەتی راستەقینە دوواوەو لەبری ئەویش قسەی کردووەو خۆی والاّ کردووەو نەیهێشتووە کەسایەتی راستەقینە بێتە زمان لەوێشدا مافی نەداوەتێ و ئەو مافەشی لێ‌سەندۆتەوە بواری نەداوە خۆی لەخۆی بدوێ بەڵکو ئەم لەجیاتی ئەو

دواوه واتـه گرگـن لـهجیاتی کهسـایهتی راسـتهقینه دواوه، کهسـایهتی راسـتهقینهش زیـاتر ئـهو دهرگایـهی لهبـهردهم والا کـردووه هـهروهك مهسـهلهکانیتر کـه دهرگـای بـۆ خسـتۆته سـهر پشـت ئاوههـاش ئـهو دهرگایـهی بـۆ خسـتۆته سـهر پشـت کـه لـهجیاتی خـۆی گرگـن بـدویّ، ههربۆیـه کهسـایهتی کـورد لـهکاتی قسـهکردندا لهخۆیـهوه دهسـت پیّدهکاتو زیاتر باسی خۆی دهکات وهك لهوهی لهمهسهلهیهکی گشتی بدویّ، ئهو کهسایهتیه گرگنه چووهته نیّو ههموو کهناڵهکانی ناوهوهی تاکی کوردو داگیری کردووهو کردوویهته کۆڵۆنیهکی خۆی، بهئارهزووی خـۆی دهیبـاتو دهیـهیّنیّ، ئهمـهش لاوازی کهسـایهتی راسـتهقینه دهردهخات بهرامبهر بهکهسایهتی گرگـن کهچـهند لهبـهردهمیدا سستو متو لاوازه، دیاره کهسایهتی راستهقینه رۆرجـار دهبیّتـه مهسخهرهی گرگنو جیّی گاڵتهجاڕی، کهسایهتی گرگن سهرهڕای فشهڵیو لهخۆبایی کهسـایهتیهکی فیّڵبـازه هـهم خـۆی ههڵدهخهڵـهتیّنیّو هـهم دهیـهویّ دهوروبهری خۆی ههڵخهڵهتیّنیّ لهههمان کاتدا لهسهر ژیانی کهسایهتی راسـتهقینه دهژی واتـه مشهخۆریشـه بۆیـه حاڵهتـهکانی رزگـاربوون لهکهسایهتی گرگـن لیّلو نادیـاره، بهوهی کـه کهسـایهتی راسـتهقینه لهکهسایهتی گرگـن تیّناگـاتو نازانـیّ چـی دهویّو بـۆ وای لـیّدهکات بهوهش که کهسایهتی راستهقینه بهگرگن ناویّریّ، بۆیه لهحاڵهتی مت بوونو شڵهژاندا ژیان دهباته سهرو لهپیّکهاتهیدا تیّك شکاوهو لهناخهوه

خۆی دەخواتەوەو هیچیشی پێناکرێ، ئەمەش حاڵەتی (لەچاوەڕوانی گۆدۆ)دا دەبێ کەگۆدۆ نایەتو.. نایەت.. کەچی چاوەڕوانین، ئەم حاڵەتەی کەسایەتی راستەقینە بەدەست خۆیەتیو خۆی دەتوانێ خۆی رزگار بکات لەوەی کەکۆڵۆنی کردووە، ئەویش گەڕانو هەوڵ دانە بۆ دۆزینەوەی خاڵە لاوازەکانی کەسایەتی گرگنو دانی بەزەویداو رزگاربوونی لەو کەسایەتیە درۆزنەی کەخۆی ئازادی پێبەخشیوەو خۆی دروستی کردووەو زیاد لەپێویست گرگنێی پێداوە، بۆیە گەڕانەوە بۆ نێوخۆی، بۆ بیرەوەریو یادەوەریەکانی خۆی، بۆ نێو مێژووی خۆی، بۆ واقیعی خۆی، دەتوانێ هۆو هۆکارەکان بدۆزێتەوەو بەو کەرەستانە کەسایەتی گرگنی خۆی بدات بەزەویداو خۆی لەو مڵۆزمە رووکەشە بۆگەنە فێڵبازە رزگار بکات کەوەك هەشت پێ لەهەموو لایەکەوە تەنگی پێهەڵچنیوەو داگیری کردووە.

# بیناکردنەوەی کەسایەتی کورد
# دوای بەسەرچوونی مێژوو

مێژوو حاڵەتو کردارێکی ئێستایە واتە دروستبوونی بەیانی مێژوو ئێستا دەبێتە دوێنێو دوێنێیش دەبێتە مێژوویەکی دوورو لەیاردەوەرییەکانی کەسایەتیدا دەبێتە مێژوو کە لەگەڵیدا هاوتاو هاوتەبا دەبێتو واتە لەگەڵ هۆشیاری کەسایەتیدا هاوتەریب دەبێت. هەروەك (بلیخانۆف) دەڵێت: هیچ واقیعێکی مێژوویی نییە بۆئەوەی حاڵەتی هۆشیاری لەگەڵدا نەبێت، یان پێبەپێی نەبێت یان پێشی نەکەوتبێت، (بڕوانە العامل الاقتصادي في التاريخ-جورج بليخانوف) هەموو هوشیارییەك کەدەبێتە سایکۆلۆژی کۆمەلایەتی مێژوویەکی هۆشیار دروست دەکاتو ناهوشیاریو نەزانینیش تێنەگەیشتنە لەمێژوو، ئەو سایکۆلۆجییە کۆمەڵایەتییە کەپابەندە بەهۆشیاری ئابوری، هۆشیاری کۆمەڵایەتی، هوشیاری رامیاری، پێگەی خۆی لەسەر

کۆمەڵگای خۆی دروست دەکات، لەوێدا خەڵکان بۆ پێداویستیەکانی خۆیان واتە داواکارییە هۆشیەکان، مێژوو دروستدەکەن کەسروشت سروشتی ئامادەکراو ئەو پێگەیە دابین دەکاتو دواجار لەسەر ژێرخانی ئەو سروشتە مێژوویەك پێکەوە دەنێن کەهاوکێشەیە لەگەڵ هۆشداو کەدواجار دەبێتە بەشێك لەمێژوو و لێیجیانابێتەوە. ئەو پرۆسیسە دەبێتە هۆی گۆڕانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کەدوایش سایکۆلۆژی کۆمەڵایەتی دەگۆڕدرێت بەپێی پێداویستە مێژووییەکان کەخۆیان لەهۆشدا دەبیننەوە، لێرەوەش کۆمەڵ دەبێتە هەڵگری هەندێك ڕێبازو بیروباوەڕی هەست پێکراو، ڕێگەی بیرکردنەوە. کەرەستەی پێداویستی ڕۆژانە، بەڵام ئەگەر هێزی بەرهەمهێن بەهێزتربوو کاری کردە سەر کاکڵەی ژێرخانی کۆمەڵایەتی ئابووری. هەروەها پەیوەندییەکانی چینایەتی لەنێوخۆدا، سایکۆلۆژی ئەو چینەش دەگۆڕدرێت، ڕۆحی سەردەمیش دەگۆڕدرێت، سروشتی نەتەوەیشی دەگۆڕدرێت پێکهاتەی کەسایەتیشی دەگۆڕدرێت، ئەم گۆڕانەش هەندێك بیروباوەڕی نوێ دەهێنێتە کایەوە، یان هەندێك بیروباوەڕی نوێ دەهێنێتە کایەوە. یان هەندێك فەلسەفەی نوێ دەهێنێتە کایەوە. هتد کەوابێت مێژوو ئەوکاتە خۆی لەنێو حاڵەتەکاندا دەبینێتەوە کەبەرەو گۆڕانو پێشکەوتن دەچێتو لەوێوە کاری خۆی دەکات بۆ سەر کەرەستەکانی دەوروبەرو دواجار بوونی خۆی دەسەلمێنێت لەناو ئەواندا، واتە کارتێکردنە سەر

یـەکتری‌و ئـەم بـێ ئـەو مـەحاڵ دەبێـت‌و گەڕانـەوەش بـۆ دواوە مـەحاڵ دەبێت، بەڵکو هەمیشە بەرەو پێشەوەچوون سەنگی مەحەك دەبێت. کەوا بێت کارکردن لەناوەوە کارکردنـە بـۆ دوسـتکردنی نـاوەوە خـۆی واتـە دروستکردنی کەسایەتییەك کەدەرك بکات بەهوشیاری خۆی کەبـەپێی قۆناغەکانی مێژوویی خۆی پێگەیشتووە. ئەم کەسایەتییە کاری بکـەر دروست دەکات‌و خۆی بکـەر دەبێـت چ لـەنێو مێـژوودا‌و چ لـەدەرەوەی مێژوودا بەڵام پێچەوانەی ئەوە واتە خولانەوە لەنێو مێژوودا کاری بکەر لەکەسایەتی دەسێنێتەوەو دەیکاتـە کەسایەتیەکی تەمبـەڵ‌و فشـەڵ‌و بەرکار، کارکردن لەخۆدا بۆ خۆ بیناکردنەوەی خۆ یان کەسایەتی کەس پرسـیارو بـەدواداچوون دەهێنێتـە بەرهـەم کەئەمـەش کەسـایەتی لەتەمەڵی‌و بەرکاری دوورەدەخاتەوەو دەکیاتە کەسایەتیەکی بکەرو لەنێو دەروون‌و هەست و نەستدا کاری خۆی ئەنجام دەدات‌و ڕێگا بۆ خـۆی خۆش دەکات‌و مێشك لەتەمبەڵی ڕزگار دەکات وای لێدەکات کەهەمیشە بیر بکاتـەوەو لەشت بکۆڵێتـەوە بۆ نوێکردنەوەی کەسایەتی‌و ڕاگرتنـی ئەو پێکهاتەیـەی کەهوشـیاری پێـی بەخشـیوە. ڕۆژانـە تـۆ پێویسـتیت بەپرسیارو وەڵام‌و بیرکردنەوە هەیە بۆئەوەی خانەکانی مێشك نـەمرن‌و لەهەمان کاتدا هەست‌و نەست تووشـی نەخۆشـی نـەزۆکی نـەبن، ئەمشە بەهۆی کارکردنە لەنێو هەست‌و نەستی خۆتدا کە گرێدراوی کۆ هەستی مێژوویی لەپشتەوەیە واتا پاککردنەوەی مینتاڵێتی مێشك لەو خڵتانەی

کەهەست قبوڵی ناکاتو مێژووش خستوویەتە بەراوێزی خۆیەوە مرۆڤ گەر بیەوێت پێش بکەوێت دەتوانێت لەسەر خۆی کاربکات، کار لەنێو خودی خۆیدا بۆئەوەی تێك نەشکێت، چونکە دەزانێت بەتێکشکاندنی خۆ دەبێتە دەردەسەریو سەرئێشە بۆ خۆییو بارێکی گرانیش بەسەر کەسانی دیەوە. هەربۆیە کەسەکانی نێو کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان، هەمیشە لێکۆڵینەوە دەکەن لەدەوروبەرو رووداوەکان بەڕاستی لێیان دەدوێنو چارەسەر بۆ کێشەکان دەدۆزنەوە، هەروەها بۆئەوەی بزانن تاچەند دەروون / هوشیاری / کۆمەڵ / تاك / هەست / کاردەکات تا چەند دەتوانێت لەکەسانیتر پێشتر بکەوێت. ئەمەش دەبێتە شوناسی کەسایەتی بۆ خۆیو کۆ هەستی کۆمەلایەتی پێشکەوتوو مۆدێرن دەهێنێتە بەرهەمو لەوێوە کەسایەتیەکی تایبەت دەدات بەخۆو بەدەرەوەی خۆی کەجیاواز بێت لە کەسایەتی کەسانیتری دەوروبەری، زۆرجار ئەوجۆرە کەسایەتیە کاریگەری خۆی دەکاتە سەر کەسایەتیترو دەشتوانێت ئەو کەسایەتیە فشەڵە. هەرەس پێبهێنێتو داگیری بکات، کەوابێت تێگەیشتن لەمێژوو یان هەست پێکردنی خۆی لەخۆیدایە، واتە لەهەستو هوشیاری دەروونی مرۆڤدایە پێش ئەوەی لەدەرەوەدا رەنگ بداتەوە، ئەم هوشیاریە وێنانە سروشتییەکانو دەرەکییەکان بەشێوەیەکی ژیرانە دەهێنێتە ناوەوەی مرۆڤو مرۆڤیش بەپێی هوشیاری خۆی لێکی دەداتەوەو پێگەی کەسایەتی خۆی لەسەر بینا

دەکاتـەوە، یـان دروسـتی دەکاتـەوە، دواکـەوتنی هەسـت لـەمێژوو یـان ئەرکەکانی مێـژوو وا دەکات کە کەسایەتییەکی تێکشکاو پەیدا بێـت و هەمیشـە بـەدوای مێـژوودا رابکـاو نـەیگاتی لەبەرئـەوەی مێژووەکـەی بەسەرچووە ئەم نەزمە وا لەو کەسایەتیە دەکات کە لەدەرەوەی مێـژوو خۆی ببینێتەوەو دۆستایەتی لەنێوانیاندا پەیدا نەبێت. کەسایەتی کورد ئەوەی بۆخۆی لـەلا باشترە واتـە (دەرەوەی مێـژوو) وەك ئـەوەی لـەنێو بازنـەی مێژوویـەکی بازنـەیدا کەهەمیشە دەخولێتـەوە بـەدەوری خۆیـدا، لەهـەردوو حاڵەتەکـەدا چـەمکی تێنەگەیشـتن لـەمێژوو دێنـە ئـاراوە، نـاتوانین مێژوویـەکی بـە سـەرچوو بخەینـەوە گـەڕ لەئێسـتەدا بـەڵکو هەمیشـە ئێسـتا دەخەینەوەگـەڕ بـۆ مێـژووی بـەیانی، چونکـە نـاتوانین مێژوو بگەڕێنینەوە، لەبەرئەوەی سروشتی مێـژوو هەمیشە بۆ پێشـەوە رێدەکات و خۆ نوێدەکاتەوە، ناشتوانرێت مێژوو رابرگین و لەتوانای هیچ هێزێکدا نیە ئەوە بکات بەڵام خیانەتی لێدەکرێت ئەمـەش ئەوکاتە دێتە گۆڕێ کەهوشیاری فڕی بەسەر هیچەوە نەبێت گەڕانەوە بۆ دروستکردنی مێـژووی دوێنـی لـەپێناو مێـژووی بـەیانیدا، ئەمـە مەحاڵـە چونکـە پێشکەوتنەکان ئەوە قبوڵ ناکەن، هەربۆیە ئەو کۆمەڵگایـەی ئـەو هەوڵـە دەدات دواکەوتنی خۆی نیشان دەدات لەرەوتی پێشکەوتنی نەتەوەکانی بـەر لەبەسـەرچوونی مێـژوو کـەوابێت دروسـتکردنەوەی کەسـایەتی لەسایەی مێژووی رابردوو، یـان لەسایەی ئەو مێـژووەی بەسـەرچووە،

دروستکردنەوەی کەسایەتییەکی بەسەرچووە کەلەگەل ئێستا ناکۆکە - ناگونجێت - بیرکردنەوەی لەو تەرزە وای لەمرۆڤی ئێستا کرد تەمەڵ بێت و بەرکاربێت ئەمیش پاڵپشت بەمێژووی بەسەرچوو، وای لێکرد ئێستای لەبیربچێتەوەو دووری بخاتەوە لەبەیانی، کە گەلان ئەو مێژووە شکۆدارەیان تێپەڕاندووەو مێژووی نوێ بۆ خۆیان بنیات دەنێنەوە، بەلام تا ئێستاش تاکی کورد خەونی قوڵی پێوە دەبینێت و خۆی بەو مێژووەوە بەستۆتەوە کەپێشتر خۆی لەگەڵیدا ناتەبا بووەو سەرکێشیی کردووە بەرامبەری، دەتوانین ئەو کەسایەتییە بنیات بنێینەوە، یان دروست بکرێتەوە، ئەویش لەنەست و یادەوەرییەکاندا بۆی بگەڕێن کەمێژووییەکی دووردرێژە مت بووە، سڕبووە، لەقۆزاخەدا خۆی مەڵاس داوە، کە دواجار وای لێهات تووشی نەخۆشی (نەزۆکی لەدایك بوون بێت) ئەو یادەوەریانە لەنەستدا هەن و هوشیاری دەرکیان پێناکات ئەویش لەبەر تەمبەڵی ژیری کورد، کەوابێت دەبێت هەمیشە تاکی کورد خۆی ئاگادار بکاتەوە پێش وەخت و خۆی ئامادە بکات پێش وەخت، بۆئەوەی ئەو گرێ کوێرانەی مێژوو بکرێنەوەو مێژوویەك بەخۆی و بەمێژووەکەی ببەخشێت، لەگەڵ هەنگاوەکانی مێژوودا ڕێبکات، کەوابێت کارکردن بۆ بنیاتکردنەوەی کەسایەتی دوو تەرزی دەوێت، رووخاندنی خۆی (رزیو) لە ناوەوەو دروستکردنەوەی خۆ لەناوەوە، واتە بنیاتنانەنەوەی کەسایەتی تۆکمە دوو ئیشکردن و دووکارکردن کە

هەردووکیان پێویستن بۆ کەسایەتی کورد، بۆئەوەی بێنەوە ناو مێژوو یان تەماهیەك دروست بکەن لەگەڵ مێژوودا، ئەمەش بەکاری کۆهەستیو هەرەومزی هوشیاری پێك دێت، واتە بوونە مرۆڤو لەوێشەوە بوونە کۆمەڵگایەك کە دەتوانن بڵێین (ئێمە کۆمەڵگاین)، یان بڵێین (ئێمە ئامادەییمان تێدایە بۆ بوون بەکۆمەڵگا)، لێرەوە مرۆڤ یان ئەو کەسایەتیە پەتی بەربەریەت دەپچرێنێتو دەبێتە مرۆڤ، واتە هەڵگری مەعریفە ئەمەش نزیکبوونەوەی مرۆڤە لەپێشکەوتنەکان خۆ خستنە نێو کارە قورسەکانە نەك پاڵدانەوەو بێئاگاییو بێباکی، بەڵکو کارکردنو بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوە - لەسەرخۆ- بەرامبەر - خودی- خۆ- دەوربەر- بەم پێیە دەبێت مرۆڤی کورد نەشتەرگەری خۆی بکات لەناوەوەی خۆی، خۆی نەخۆشیەکانی خۆی تیمار بکات لەو کەسایەتیە تێکشکاوە رزگاری ببێو چاوەروانی خوداوەندو ئەفسانەو پێغەمبەر کە مێژوویان بەسەرچوو نەبێت، گەر مرۆڤ بیەوێت مێژوو دروست بکات دەبێت لێی تێبگات لەوێشوە کاری بۆ بکاتو لەگەڵیدا هەنگاو بەهەنگاو بڕوات،. خەڵکان ناتوانن مێژوویەك دروست بکەن کەلێی تێناگەن، خەڵکان ناتوانن بەیانیەك دروست بکەن کەهەنگاویان بۆ نەناوە، ئەمەش وا دەکات کە مێژوو ئەو خەڵکانە دروست بکاتو بەڕێوەیان بەرێ ئیتر هەرچۆنێك بێت ئەو دروستکردنە ئەوا هەڵەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسایەتیەی کە لەو قەدەرە مێژووە دێتو دەچێت، هەربۆیە

دووبارەبوونـەوەی میـژوو بەشـێوەیەکی زۆر زەقانـە بـەدی دەکرێـت کـە ئەمەش راچەنینی هۆشیاری مێژوە بۆ کەسایەتی تەمبەڵو تـەوەزەل بۆ دەرککردنـی بـەو غەدرانـەی کـەمێژوو لێـی دەکات، کـە میـژوو لـێرەدا بەشێوەیەکی غـەدری نایەتـە پێشـەوە بـەڵکو ئەوانـەی لەگەڵیا هـاوجووت نین پێـی دەڵێـن (غـەدری میـژوو)، میـژووش مـافی خۆیـەتی هەسـتێت بەهەرشێوەکارێك بەرامبـەر کەسایەتی تەمبـەڵو تـەوەزەل، ئەمـە وا لـەو نەتەوەیـە دەکـات کـە هەمیشـە بـەدوای رزگارکـەرێك -غەیبانیـەك - پەیامبـەرێك - موعجیزەیـەك - ئەفسـانەیەك - بگـەرێن و لـەو مەینەتیـە رزگاریـان ببێـت، ئـەم بۆچوونـە لـەکاتو سـەردەمی خۆیـدا جێـی خـۆی دەگرتەوە بەڵام دوای بەسەرچوونی ئەو مێژووە قاڵبی خۆی وەرناگرێت بەڵکو مێژوو دەگەرێنێتە دواوە، هەربۆیە کێشەی مێژوو دروستبووە لای کورد وەك کێشەیەکی (میـژوو دژی کـورد - کـورد دژی میـژوو)، کەواتـە نەخۆشیەکە هـەر لـەنێو خوددایـەو هـەر لـەوێوەوە چارەسـەر دەکرێـت، کـەوابێت کێشـەی کـورد کێشـەی خۆیـەتی لەگـەڵ خۆیـدا نـەك لەگـەڵ مێژوودا، گـەر کێشـەی کەسایەتی خـۆی چارەسـەر کـرد ئـەوا دەتوانێـت کێشــەی نێــوان خــۆیو میــژووش چارەســەر بکــات، لــەناوەوەو چ لـەدەرەوەدا، ئەمشـە گێچەڵـە کـەمێژوو پێـت دەفرۆشـێتو لەیەخـەت نابێتەوە، ناشتوانیت خۆتـی لـێلادەی چونکە ئـەوە حەقیقەتـە، هەربۆیـە کورد یان تاکی کورد تووشی حاڵـەتی بێهودەییو رەشبینیو تەمـەڵی

دەبێت لەو مێژووەدا کەخۆی نەیتوانیوە دروستی بکات، ئەم بێهودەییەو بێباکییە لەجێگای خۆیدایە، ئەم تێکشکاندنە لەقاڵبی خۆیدایەو دەبێت ئەو جامە ژەهرە بنۆشین، واتە دان بەو هەڵانەدا بنێین، مرۆڤی کورد دەتوانێت بۆ رزگاربوون لەو حاڵەتە ناشازە رزگاری بێت ئەویش گەڕان بەنێو هەستو نەستداو دۆزینەوەی کەسایەتی راستەقینەو کەسایەتیە گرگنەکەی ناخی خۆی بکوژێتو کەسایەتی خۆی کە بۆ خۆی دەگونجێت، بهێنێتە بەردەمی خۆیو لێیبکۆڵێتەوە بۆئەوەی مرۆیی خۆی لەدەست نەدات، ئەمەش گەڕانە بەنێو خوددا، بۆ بیناکردنەوەی کەسایەتی خۆی دوای بەسەرچوونی مێژوو.

# هەستو نەست لای کورد

لۆژیك بەشێکە لەزمانی هەستی مرۆڤ، لەشی کردنەوەی ژێر بێژەکیدا، لۆژیك ئەوکاتە دەبێتە لۆژیك کە ئەو پەیوەندیە تێکەڵاوەی لەنێوان هەستو نەستدا هەیە دایببڕێتو لێکیان جیا بکاتەوە، واتە هەر بەشە سەربەخۆی خۆی بێت، ئەم کارەش هەروا ئاسان نیە تا مرۆڤ خۆی لەخۆیدا ئەو شیکارە دەروونیانە نەهێنێتەوە سەر ڕێگای خۆی، واتە لەلادانو بەیەکداچوون ڕزگاریان بکات، کە ئاڵۆزی ئەو دوو خەتە پانەی دەروون (هەست - نەست) لێك جیا ببنەوەو خانەکانی بەشی مێشکی مرۆڤ بەئاگادێنەوەو لەو خەونە قوڵە بێدار دەبنەوە کە تا دوێنێو بۆ مێژوویەکی دوور نەست هەستی هەڵخەڵەتاندبوو لەهەمان کاتدا بەکاری دەهێنێ بۆ پتەوکردنو ڕاستکردنەوەی زیاتر هەست کە لەچوارچێوەی لۆژیکدا دایدەڕێژێو پێکهاتەی لۆژیك تۆکمەو بەرجەستە دەبێت، کە ئەو

چوارچێوەیە هەمیشە لەکشاندایە بۆ لۆژیك بوونێكى زانستانەو زیاتر عاقڵانە و دوور لەشێواندن‌و پەرتەوازەیی، نەك ئەویش گۆشەگیر بێت لەچوارچێوەی خۆیدا گەر وا بێت ئەوە هەمان كاری نەست بەڕێوە دەبات‌و دواجار دەخرێتە نێو گەنجینە تاریكەكانی نەستداو لەو تاریكیە خەستەدا وون دەبێت، ئەو كشانە Extraversion گەر بایەخ دان بی لەناوەوەی مرۆڤ بۆ دەرەوەی كارێكی باش‌و چاكە بەڵام زۆرجار ئەو كشانە تاك وا لیدەكات بایەخ بەجیهانی دەرەوەو دیاردە كۆمەڵایەتیەكان نەدات زیاتر بایەخ بەخودی خۆی بدات، لێرەدا ئەو مرۆڤە گۆشەگیرو داخراو دەبێت، گەر لۆژیك چارەسەری واقیع ببینانەی بۆ دابین نەكرێ تووشی شكست‌و گەڕانەوە دەبێت بۆ دواوەو هەمدیسان نەچێتەوە نێو بازنەی گرژی جاران كەنەستەو جارێكی‌تر كپ دەكەوێتەوە، ئەمەش كاریگەری دەكاتە سەر دووبارە بوونەوەی مێژوو، بەتایبەتی لای كۆمەڵگای كورد ئەوە بەدیدەكرێ كەمێژوو بووەتە تراژدیایەك، واتە شكست هێنان بەلۆژیك، لێرەدا لۆژیك تووشی گرژو ئاڵۆزی دەبێت‌و هەمیشە ئازارەكان دەچێژی‌و زمانیش ئەو هەست‌و ئازارانە بەشێوەیەكی تێك دەرانە دەردەبڕێ، هەمیشە هەست لەچاوەڕوانی لۆژیكدا دەبێت كەبیكاتە دەم راستی خۆیی‌و لەنائاگایی ئاگایی خۆی رزگاری بێت، هەوڵدانی نەست بۆ شكست هێنانی هەست بەجۆرە دەسەلاتێكی ناماقوڵانە سەیر دەكرێ لەكۆمەڵگایەكی

پێشکەوتوودا، بەڵام لەکۆمەڵگایەکی دواکەوتوودا ئەوجۆرە دەسەڵاتە ماقوڵ دەبێت و ڕێگاشی بۆ خۆش دەکرێ و ڕێزیشی لای زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵی دواکەوتوو هەیە، وەك کۆمەڵگای کورد کەنەست زۆر بەسەر هەستدا بێ ئەوەی پێ بزانێ، لەنێو ئەو کۆمەڵگایەدا هەست و نەست تووشی سستی و سڕبوون دەبێت، بەڵام توخمە ناکۆکەکان دەیانجوڵێنێت بۆئەوەی ئەو کێشمە کێشمە دروست ببێت و لایەك بەلایەکدا بخرێ، بەڵام بەهۆی لاوازی هەست بۆ درکاندن بەنەست ئەو ململانێیە زۆر دەخایەنێ و هیچ ئاڵوگۆڕێك دروست نابێت، تەنانەت زۆرجار بەزەبری لەدایك بوونیش، چونکە هیچیان پەی بەهیچیان نابەن، کۆمەڵگای کورد تووشی ئەو حاڵەتە بووە کەهیچ ئاڵ و گۆڕێکی بەخۆوە نەدیوە، کەبێ ئاگاداری تاکی کوردە لەهەست و نەست و دواجار پەی نەبردووە بەناکۆکییەکان سەرەڕای زاڵ بوونی نەست بەسەر هەستدا وەك کارێکی دینامیکی هەربۆیە ڕاژەی سەپێنراوەکانی نەست زۆرتر دەبێت وەك لەهەست، سەرەڕای ئەوەشی نەست ناوچەیەکی فراوانی داگیرکردووە لەمێشکدا، ئەمەش وادەکات کەنەست زۆرجار ببێتە لۆژیك و ڕۆژانە کاری پێ بکرێ و ژیان بەڕێوەبەرێ و شێوازەکانی دینامیکی ژیان پێچەوانەتر دەبنەوەو بەڕاستی و واقیعی سەیر دەکرێت، چونکە نەست بەبێ ئاگای هەست فێری کردوون و ڕێنیشاندەریان بووەو جێی و میکانیزم و دینامیکی هەستی گرتۆتەوە، دیارە جێگرتنی نەست

لەجێی هەست مەترسی گەورەی لێدەبێنەوەو ژیان رادەوەستێ و مرۆڤ تووشی سەرلێشواندن دەکات و دەروونی ئالۆز دەکات و تووشی خەمۆکی و چەپاندنی دەکات، (بافلۆف) دەڵێ (هەست رۆڵی پێشڕەوایەتی دەبینێ لەژیانی دەروونی مرۆڤدا نەك نەست)، چونکە هەست رووی ئامێری (جهاز) دەروونیە کەپەیوەندی هەیە بەجیهانی دەرەوە، نەست ئەو پەیوەندیەی پێوە نیە، کەواتە لێرەدا فشار خستنە سەر هەست لەرێگای نەستەوە فشارێکی ناماقوڵ و قورس و گرانە هەربۆیە زۆرجار هەست بەرگەی ناگرێت و لەهەمان کاتیشدا ناتوانێت خۆی بدات بەدەستەوە چونکە دەزانێ لەگەنجینە تاریکەکاندا وون دەبێت و نامێنێ، گەر هەست بەرەنگاری نەبێتەوە تووشی لادانی دەکات و دەیروخێنێ چونکە نەست گەنجینەیەکی هۆکاری عەقلیە لەبۆ رووخاندنی مێشك (الانهيار العصبي) گەر نەخرێتە خزمەت هەستەوە، لێرەدا دەردەکەوێ کەژێرخانی نەست پتەوترە لەژێرخانی هەست بەلام بەهۆی کاری ساویلکانەی ئامرازەکانی دەوروبەر لۆژیك دەبێتە باو.. رۆژانە کادرانی باو هەڵدەستن بۆئەوەی ژێرخانی لۆژیکی باو پتەوبکەن و هەست زیاتر نەست داگیر بکات و بیخاتە خزمەت خۆی، سەرەرای ئەوەی ژێرخانی نەست پتەوە کەچی زۆرجار ژێرخانی پێ لەق دەکات چونکە ئەویش هەر بەزۆر یان بەناتەواوی ئاخێنراوەتە چوارچێوەی خۆی، ئەوانەشی کاری پێدەکەن و کاری بۆ دەکەن لۆژیکی

تەواویان پێ نیە بۆ رەگەزنامەی نەستیان، چونکە نامۆیەو سەر خانەکانی نەستی خۆی نیە، لێرەدا نەك هەر بەتەنها هەست تووشی نەخۆشی دەبێت، یان تووشی نەزۆکی دەبێت، بەڵکو نەست پێش ئەوە تووشی بووە، کەوابێ نەست بێ رزگاربوونی هەست ناتوانێ رزگاری بێت لەو نەخۆشیانە، بەلاَم نازانێ کەرزگاربوونی بەدەستی هەستەو بەدەربڕینی ئامادەبوونی خۆشیەتی گەر بیەوێ لەو نەخۆشیانە رزگاری ببێت، نەك هەستی وەهم کەلوت وشکانە پڕوپاگەندە بۆ خۆی دەکات و فوو بەخۆیدا دەکات، کەوابێ کەهەست نەخۆشبێت ئەو نەخۆشییە نەستیش دەگرێتەوە چونکە لەسەر یەك هێڵی باریکی هوشیاری دێن و دەچن، پێش فرۆید فەلسەفە وای دانا کەنەست تەنها نائامادەیی هەستە واتە رۆڵی خراپە، بەلاَم لەگەڵ (فرۆید)دا نەست بوو بەشتێکی باش و کاریگەری کردە سەر ژیانی مرۆڤ بەهەند ئەوەندەی هەست کاریگەری کرد، واتە رۆڵی خۆی وەك هەست بینی، چونکە زۆرجار لەڕێی نەستەوە هەست و هوشیاری دەدۆزینەوەو دەرك بەشتەکانی ناوەوەو دەرەوە دەکەین، سەرەڕای ئەوەش نەست وەك سندوقێك کۆنی داخراو وایە کەیاداشتە کۆنەکان دەپارێزێ هەروەها جێگای ئەفسانەو دین و سیحرو یادەوەریەکان و شتە خورافەکانی گرتۆتەوە، کە ئیرادە پەی پێ نابات بەڵگەش هەواڵەکانە کە کاریگەری و جێ‌پەنجەی خۆیان دیاری دەکەن لەسەر هەست لەکاتی روودانیاندا هەڵناگیرێن بەڵکو کاری خۆیان دەکەن

بەشێوەیەکی ڕێکوپێك ئەمەش بەواتای کارکردنە سەر سلوکی ئەست
دەلالەتیش بۆ هەڵگرتنی ئەستو کارە هەمەکەییەکانیتر، ئەمەش
لەڕێی هەست کردنی دەروونەوە کە لەکاتی ڕوودانی شتێکدا بانگهێشت
دەکرێ واتە لەکاتی پێویستو کاتی ئارەزووکردن، هەسیتش کاری
خۆی دەکات کاتێ دەزانێ یان دەزانین کەچی ڕوودەدات ئەمەش دوو
بواری لێدەبێتەوە، بواری ناوەکیو خەستی (البؤری والمرکز) دیواری
پەراوێزی کەشان بەشانی وریا بونەوەکان دەجولێت واتە لەحاڵەتی
وریا بوونە کتوپڕ لەناکاوەکاندا، کەوابێ تێکەلاویەکی دەروونی
هەیە لەنێوان ئەستو هەستدا، تا ئەوکاتەی ئەست دەبێتە ئەستو،
هەست دەبێتە هەستو لێك جودا دەکرێتەوەو هەریەکە سەربەخۆیی
خۆی رادەگەیەنێ بەلام بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی کەباسمان
لێوەکرد دەبێت بەزۆری زۆرداری (زەبرو زەنگ) لێك دابڕێت یان
جیابوونەوە دروست ببێت، بۆ بەکارهێنانی زەبووزەنگ کەزۆرجار
پاشەکشە بەلۆژیك دەکات ئەویش بەهۆی بەکارهێنانی هەڵەی زەبرو
زەنگ دەیشێوێنێ وەك (دیاردەی ستالین) لەشۆڕشی بەلشەفیدا، یان
دەیخاتە خزمەت خۆیەوەو پێکهاتەیەکی تەواو دەدات بەلۆژیك، زەبرو
زەنگی نالەبار بۆ کۆمەڵگایەکی نالەبارو دواکەوتوو ناهێڵێ عەقڵو زمانی
پاراوی لۆژیکیانەی خۆی بەکاربهێنێو بۆیە لۆژیك جەستەی خەڵتانی
خوێن دەبێت هۆکارەکەشی ئەوەیە کە:-

١-فشاری دەرەوە (بەجۆرو هێزی کەرەستەکانی خوێن رشتن) وەك پرۆسەیەك بۆ تێك شکاندنی کۆمەڵگا لەبازنەی سیاسەتی تێك دانی کەلتورو قڕکردن خۆی دەبینێتەوەو دەبێتە گەورەترین فشار بۆ تێك دانی کۆمەڵگا لەناوەوە.

٢-کاری ناوەوە (شەلەلی کۆمەڵگا) کاردانەوەیە بەرامبەر فشاری دەرەوە، دیارە ناوەوە بۆئەوەی لەدەرەوەی خۆی رزگاری بێتو خۆی لەژێر ئەو فشارە قورسەدا رزگار کات ئەمیش بەهەمان شێوە زەبرو زەنگ بەکاردەهێنێ دژی دەرەوەی خۆی بەڵام کە گۆڕان روونادات ناچار دەبێ فشار بخاتە ناوەوەی کۆمەڵگاو زەبرو زەنگ بەکاربهێنێ (زەبری لەدایك بوون Birth Trauma) کە لێرەدا ئەو زەبرو زەنگە کۆمەڵگا تووشی شکست هێنان دەبێ چونکە کۆمەڵگا هوشیار نیەو لەو زەبرو زەنگە تێناگات کەخزمەتە بەخۆی، بەڵکو کۆمەڵگا وای سەیر دەکات کە فشارێکیترە واتە کۆمەڵگا لەنێوان چەکوش و دەزگادا دەژیو تووشی تێك شکاندن دێت، بۆیە زۆرجار دژی رادەوەستێ، دیارە کۆمەڵگا لەو نێوەندەدا (چەکوش - دەزگا) تووشی سەرلێشواندنو ناجێگیری دەبێتو دواجار شەڕی ناوخۆی لێدەکەوێتەوەو کۆمەڵگایەکی پەرتەوازەو شەڕخوازی لێدەردەچێ و لۆژیك رەوتی ئاسایی خۆی وەرناگرێ بەڵکو هەمیشە تووشی گرژبوون دەبێ، ئەمەش واتە خوێن رشتن دوور لەزمانی لۆژیکانە لێرەشدا ووشەو تەڕ پێکەوە دەبنە

خۆراكی ئاگرو چەكوش‌و (هەست نەست) تێك دەچێ‌و باری ئاسایی خۆیان لەدەست دەدەن، لەنێوان (چەكوش‌و دەزگادا) كۆمەڵگاش پێكهاتەیەكی ترادسیونال بەخۆیەوە دەبینێ ئەو پێكهاتە لەبەر نەبوونی لۆژیك‌و هوشیاری تووشی گرێ كوێرەی، مێژوویی دەبێت‌و تووشی سەرلێشێواندن دەبێت لەنێوان شكست‌و هەستانەوەدا، لەنێوان (من) و (ئێمە)دا واتە خۆی نادۆزێتەوەو تووشی نامۆیی فكری دەبێت یان نامۆیی مێژوویی كەزۆرجار بەكلۆلترین كۆمەڵگا دەدرێتە قەڵەم، یان بە (هەتیو) دەدرێنە قەڵەم‌و كەس ئاوڕیان لێ‌ناداتەوەو هەمیشە بەر زللەی مێژوو یان زللەی دەرەوەی خۆیان دەكەون، كۆمەڵگای كوردی بەدەر نیە لەو بازنەیەی سەرەوە، یان لەو بۆچوونەی سەرەوە، زیاتر لەسەر نەستی خۆی دەژی‌و زۆرجار وەك مشەخۆرێك بووە بۆ خۆیی‌و سروشتی ئەوی وەرگرتووە لەبەر بەرژەوەندی كەسێك هۆزێك تێك چووە، لەبەر شكستی رابەرێك نەتەوەیەك پەرتەوازە بووە.. شۆڕشێك تێك چووەو پوكاوەتەوە بەواتایەكی‌تر (من) نەبووەتە (من)و نە (ئێمە)ش بووەتە (ئێمە) چونكە لەكاتی قۆناغەكانی (من) و (ئێمە)دا كە لەمێژوودا گۆڕانكاری بەسەرهات هەریەكە جێگەی خۆی گرتووەو چووە قاڵبی تایبەتی‌و پێكهاتەی تایبەتی خۆی دروست كرد، كۆمەڵگای كورد لەدەرەوەی مێژووی خۆی یان لەدەرەوەی ناكۆكییەكان كاری كردووە لەگەڵ هەنگاوەكانی مێژووی هوشیاریدا ناڕێك بوو، بەڵكو زۆرجار دژیشی رادەوەستا، بەڵام

کەهوشیاری نەبوو هەردوو چەمکی (هەست و نەست) شێوەی گلۆڵە دەزوولەیەکی تێك ئاڵاو وەردەگرن‌و سەر لەهوشیاری دەشێوێنن‌و زۆر بەزەحمەت سەری ئەو گلۆڵە دەزوولەیە دەدۆزێتەوە، هۆشیش ناچارە لەدەرەوەی ئەو دوو چەمکە سەرلێشێواوە خۆی بدۆزێتەوەو دوور لەوان بژی کەناتوانرێ بێ‌ئەوان بژی واتە (هەست و نەست) بەڵام لەناچاریدا ژیان دەباتە سەر وەك ئەوەی هیچ وەزیفەیەکی نەبێت وای لێ‌دێت ئەمەش بەوەخت‌و کات ئەو مەودا هوشیاریانەی کەلەلای گەڵاڵە بووە لەیادەکانیدا تووشی سڕینەوەو سووان دەبن‌و دواجار گەر فریاد ڕەسێك نەبێت لەناودەچن.
زۆرینەی شۆڕشە ناسیۆنالیستەکانی کورد ئەوجۆرە ناچاریانەی بەخۆوە دیوە بۆ وەدەست هێنانی مافی نەتەوایەتیان واتە زۆرجار بەناچاری شۆڕش کراوە. گەر فریاد ڕەسی نەبێت ئەوا ئەو کۆمەڵگایە تووشی پەرتەوازەیی دەبێت‌و پۆل پۆل دەبنە ئەندامی خێڵەکانی دەوروبەریان کە لەوێڕا دەتوێنەوە لەنێو شارستانیەتی ئەو خێڵە نوێیەدا، یان دەبنە خزمەتکاری کۆمەڵگایەکی‌تر، وەك خێڵی بەختیاری کەتا ئێستا روون نەکراوەتە کە کوردن یان غەیرە کوردن یان (لوڕ)ەکان کەخۆیان دەڵێن ئێمە (لوڕ)ین بەڵام ڕەگەزمان فارسە، دیارە خزمەت کردنی کۆمەڵگایەکی تر مەرجی تایبەتی تێدایەو واقیعی ئەو کۆمەڵگا نامۆیە وا لەهوشیاری هەڵگری ناهوشیار دەکات کەهەمیشە و بێ‌سڵەمینەوەو بەسەنگێکی

فراوان بچێته پێشەوەو زۆر بەرازی بوون خزمەتکاری کۆمەڵگای دەرەوە بکات تاوای لیٚدێت تیایدا دەتوێتەوە مەرجەکەش گەر کۆمەڵگا دەرەوە بزانێ ئەو هوشیاریە لەسەری دەکەوێ ئەوا دەیخاتە نێو بازنەی فەرمانی نەستی و پیرۆزی دەکات سەرەرای ئەوەشی دان نانرێ بەفاعیلەکەیدا، گەر ئەو هوشیاریە لەسەری نەکەوێ ئەوا دەیخاتە نێو بازنەی سیاسەتی دیماگۆجی و بەماوەی مێژوویەکی دوور فاعیلەکەی تاوانبار دەکات، ئەو پرنسیپە دوو لایەنە دەروونی کوردی هەم نامۆکردوو هەم دژی خۆی کرد واشی لیٚکرد کەرازی بێت بەو نالۆژیکە بێئاگایی‌یەو تائێستاش لەنێو ئەو بازنانەدا دەخولێتەوەو زۆریش. لەئەندامانی کۆمەڵگای کوردی بەهەموو شێوەیەك پیرۆزی دەکەن و بەرگری لیٚدەکەن کەئەوەش جۆرێکە لەهەڵخەڵەتاندن و هەڵفریواندنی خۆ، ئەمەش رێخۆشکەرە بۆ کەسایەتیەکی بۆش دوور لەواقیع و سەربەخۆی خۆی لەدەست بدات و بەئارەزووی خۆی پێشکەشی دەرەوەی خۆی بکات و دەرەوەشی بەئارەزووی خۆی هەڵسورێنێ و لەهەمان کاتدا دەرەوە چاك دەزانێ کە ئەو هوشیاریە بووەتە خاڵی بادانەوە لەمێژووەکەیدا کەچی لەبەرئەوەی سەر بەخێڵی خۆی نیە یان و سەر بەکۆمەڵگای خۆی نیە سەیر دەکەین هەمیشە رەتی دەکاتەوەو دووری دەخاتەوە لەبازنەی کۆمەڵایەتی بوون و کەسایەتی بوون. نایەڵێ هەمان کەسایەتی هەبێ کە خۆی هەیەتی بەڵکو هەمیشە وای تێدەروانێ کەخزمەتکارەو بەس و تەنها بۆ خزمەتکاریش

بەکاردێت، ئەم بۆچوونە بووەتە باوو زیاتر کۆمەڵگای ناهوشیار خۆیان دەخزێننە ئەو بازنەیەوەو زیاتر قوربانی دەدەن بەکۆمەڵگای دەرەوە بەڵام بێهودەیە هەر لەبەرئەوەی تەڵێکی نامۆ دیاردەکەوێ لەنێوان دەروونی ئەوانداو دەروونی ئەماندا، پاساو هێنانەوە بۆ دروستکردنی ئەو پەیوەندیە یان گێلی‌یە یان خیانەتە، مێژووش بایەخ بەوانە نادات، دیارە هوشیاری سەرەڕای دووری لە (هەستو نەست) خەم خۆری ئەو دووریەیە بۆیە زۆرجار ناچار دەبێت زەبرو زەنگی خۆی بەکاربهێنێ بۆ راچەنینی هەردوو (هەستو نەست) کەبێنەوە سەرە رێگاو لەو خەونە قووڵە بەخەبەر بێنەوە، زۆرو کوتەکیش زۆرجار ئەو (هەستو نەست)ە تووشی پشێوی دەکاتو زیاتر دەیرمێنێ لەجیاتی ئەوەی چاکی بکاتەوە، چونکە هەردوو خەسڵەتەکە هوشیار نینو زەمینەی هوشیاریان بۆ ئامادە نەکراوە بۆیە زەبرو زەنگ لێرەدا زیانی هەیە وەك لەوەی سوودی هەبێت هەروەك، (ئەریك فرۆم) دەڵێ (مارکس پێی وابوو کەهێز ناتوانێت هیچ شتێکی ئەوتۆ بخولقێنێت، ئەگەر ئەو زەمینانە لەئارادا نەبنو بۆ گەشەکردنی پرۆسە سایسیو کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگا، جا ئەگەر بەکارهێنانی هێند بووە شتێکی پێویست... ئەوا تەنها ئەگەر وردتر قسەی لەسەر بکەین دەتوانین ئەو پاڵە بداتە پرۆسەی گەشەکردن کەپێشتر لەڕووی کرداریەوە هەبووە، بەڵام دیسانەوە هێز هەر ناتوانێت شتێکی تری نوێی واقیعی بخولقێنێت).

بەلای مارکسەوە (هێنز بریتییە لەتوانستی هەر کۆمەڵگایەکی کۆن کە هەڵگری کۆمەڵگەیەکی نوێ بێت) هێند لای مارکس (لەدوا ئاکامیدا تەنها خاوەن بایەخێکی کاتییەو هەرگیز رۆڵی توخمێکی هەمیشەیی ناگێرێت لەپرۆسەی گۆرینی کۆمەڵگادا) کەواتە کۆمەڵگای کورد ئەو کۆمەڵگا بێ هۆشە بووە کە لەکاتی خۆیدا هێزی خۆی بەکارنەهێناوەو کاتی گونجاوی زێرینی خۆی فەرامۆش کردووەو بەمەش هوشیاری مێژوویی لەدەست داوە، ئەمەش بەهۆی هەڵخەڵەتاندنی هوشیاری کوردەوە بووە لەلایەن داگیرکەران و نەیارانی نەتەوەی کوردەوەو، تاوای لێهاتووە کۆمەڵگای کورد بووەتە دار دەست، مێژوو شاهیدی حاڵەت و رووداوەکانەو ناشتوانرێ پاساوێکی تری بۆ بهێنرێتەوە بێجگە لەوەی کەبڵێین کە کۆمەڵگای کورد زیاتر هەوڵی داوە بۆ دەرەوەی خۆیی و خۆی لەبیرچۆتەوەو هەمیشە بەرامبەری خۆی دەبینێ نەك بەرامبەر خۆی وێنەی واقیعی خۆی ببینێ و ئەمەش بەماوەی مێژوو وای لێهاتووە کەتەنانەت ئەو رووداوانە هەڵبگرێت و لەبیر بچنەوە تا ئەوکاتانەی رووداوێکی دڵتەزێن رووداوێکی جەرگ بڕ روودەدات ئەوجا ویژدانی نەست و (منی بالا) (من) بەخەبەر دەهێنێتەوەو جارێکی تر مێژووی کۆن دێتەوە بەرچاوی (من)ی کوردو بەلام لەبەرئەوەی رووداوەکان زۆر دوورن بۆیە (من) ناتوانێ ئەو پەیوەندیە ببەستێ بەیەکەوە کە لەدوێنێی لێڵ و دوورو ئەمرۆی شڵەژاوادا گرێیان بات هەربۆیە (نەست و منی بالا)

هەمیشە (من‌و نەست)ی کورد دەخەنە ژێر سزایەکی قورس کەوا هەست بەشەرمەزاری بکات زۆرجار ئەو شەرمەزاریە یان خۆ بەکەم زان‌و کلۆڵی‌یە لای کورد دەبێتە هەستێکی نامۆو تاکی کورد خۆزگە بەوە دەخوازێ (کە کورد نەبوایە)، لەبەرئەوەی (منی بالاّ) زۆرجار پەیوەندی بەدەرەوە دەکات‌و ئەوجا بڕیاری خۆی دەدات بەسەر (من)و (منی بالاّدا)، دیارە بۆ ڕاگرتنی کۆڵەکەی کۆمەڵگاو یەکخستنی کۆمەڵگاو ڕزگارکردنی کۆمەڵگا لەپەرتەوازەیی (منی بالاّ) بە گەورەترین ڕۆڵ هەڵدەستێ، چونکە (من) ی کورد هەمیشە بیری لەدژایەتی‌و خراپەکاری‌و خیانەتکاری‌و تۆڵە کردۆتەوە، تەنانەت گەر (من) بیر لەشتێکی خراپ بکاتەوەو کردەوەشی لەگەڵدا نەبێت هەربۆیە (منی بالاّ) وەك پۆلیسێك وایە بۆ تاك‌و کۆمەڵگا، دەتوانین بڵێین کە (منی بالاّ) ئاکامی ژیانی کۆمەلاّیەتی‌و ڕەوڕەوەی نەبینی شارستانیەتە، (من)ی کورد نەك هەر پەیوەندی نێوان (منی بالاّ/ ئەو)ی نەبەستۆتەوە بەڵکو ئەو پەیوەندیە تێك دەدات‌و بەهۆی فووکردنە خۆو خۆبەزل زان ئەو دوو بناغەیە تێك دەشکێنێ‌و دەیخاتە خزمەت خۆی کە ئەمەش پرۆسەیەکی‌دەروونی کوردە بۆ تێکشکاندنی کەسایەتی خۆی یان (من)ی خۆی هەروەك لەپەندە کوردیەکەدا هاتووە دەڵێ (من منم تۆ کێیت؟).

کەواتە لەدەست چوونی کات‌و قۆناغی مێژوویی بووە هۆی شکستی کەسایەتی کورد، هەربۆیە بۆ گەڕانەوە بۆ ئەوکاتە لەبیرچووە زۆر

بەزەحمەت بۆی دەگەڕێتەوە واتە لەسفرەوە دەست پێدەکات کەئەمەش لەناوکی شۆڕشەکاندا خۆیان بەدی دەکەن‌و دەردەکەون لەشکست‌و هەستانەوەی شۆڕش‌و ڕاپەڕینەکاندا، کە دواجار ڕۆدەچێتە دەروونی هەر تاکێکی کوردو وای لێدەکات بێهیواو بێئومێدی لێدێ، دیارە شۆڕشەکانی کورد کەسروشتی سیزیفیانەی پێوە دیار بووە بێئومێدی زیاتردا بەدەروونی کوردو وای لێکرد پاڵ بداتەوە وەك لەوەی هەستێتەوە، کەواتە کارێکی گرانەو زۆر ئاڵۆزەو پرۆسەیەکی دەروونی‌و زەمەنێکی سەقفی دەوێ کەهەست لەنەست جیابکرێتەوە واتە هەست نەست تەلاق بدات، بۆئەوەی هەریەکەیان پێکهاتەیەکی تایبەتی خۆیان وەربگرن‌و سەربەخۆیی خۆیان ڕابگەیەنن (من)یش هەستێ بەرۆڵی تەواوی خۆی، ئەو پێکهاتەیە لەنێوان هەست‌و نەستدا دەگەڕێتەوە بۆ سێ سیستەم (ئەو/ من/ منی باڵا) ، لەکۆمەڵگای کورددا سیستەمەکان بۆ دروستبوونی پێکهاتەی کەسایەتی تێکشکاوە لەچوارچێوەی پێکهاتەی خۆیاندا جێیگرنەبوون، لەهەمان کاتدا هەست‌و نەست تێك شکێنراوەو بەزەحمەت دەناسرێنەوەو لێك جودا دەکرێنەوە، نەست هەمیشە ئامادەیە بۆ لێدانی هەست بۆئەوەی کۆیلەی کات‌و سەربەخۆیی خۆی وەرنەگرێ، چونکە سەربەخۆیی هەست شکاندنی ئەو رادەگەیەنێ (شکستی نەست)، هەربۆیە دەبێتە ڕێگرێك بۆیی‌و وەك ملۆزم لەبەردەمیدا قووت دەبێتەوە، هەرچی هۆشیشە هەمیشە چاوەڕوانی

هەست دەكات كەبیكاتە لۆژیك بۆیە هۆشیش لەجێگای خۆی بیست و لاوازو سیستەمێكی بێدەنگی دروست دەكات و هیچ ناڕەزایی دەرنابڕێ چونكە لاوازە، دیارە تێكەڵاو بوون شتی باش دەدات بەدەستەوە وەك هەر سیستەمێكی نوێ، یان گۆڕانی بارێكی كیمیاوی لەبارێكەوە بۆ بارێكی دی گۆڕانێكی نوێ دەدات بەدەستەوە جاری واش هەیە ئەو تێكەڵاو بوونە لەناوەوەی (ذهن)و خانەكانی هۆشدا زیانی زیاترە وەك لەسوودەكەی و ئەو پێكهاتە پاكژە دروست ناكات، یان قازانجی ئەو پێكهاتە هۆشی یە لەوەدایە كەیەكگرتن ئەمیكانیزمەكاندا بەقازانج دەگەڕێتەوە جاری واش هەیە بەزیان دەگەڕێتەوە بۆ دروست بوونی ئو پێكهاتە بەواتە بارودۆخی دەروونی و میتاسایكۆلۆژی تەنها بەوەسف كردنی دیاردە دەروونیەكان راناوەستێ بەڵكو رازەیان دەكات لەژێر تیۆری چەمكیدا بەشێوەی دینامیكی واتە (ململانێ لەنێوان هێزی دەروونیدا) وە ئابووری لەشێوەی چەندایەتی بۆ ئەو هێزە، هەروەها پاڵنەری غەریزی و پاڵنەری دژە غەریزە) هەروەها تۆپۆگرافی یە یەكتایی كردنی شوێنی رەورەوە دەروونیەكانی هاوشێوەی نەست و هەست) ئەوەش لەهوشیاری دا خۆی دەدۆزێتوە كەتا چەند قازانج كراوە بەڵام كەهوشیاری نەبوو هەردوو چەمكەكە شێوەی گلۆڵە دەزوویەك وەردەگرن و سەر لەهوشیاری دەشێوێنن و زۆر بەزەحمەت سەری ئەو گلۆڵە دەزووە دەدۆزرێنەوە، هوشیاریش لەبەرامبەر (رەمەك)ە (غریزة

Instinct) جیبەجیٚکراوەکاندا هوشیار دەبیٚ و هوشیاری پیٚدەبەخشریٚ بەلاٚم کاتیٚك ئەو رەمەکانە ریٚیان لیٚدەگیریٚ دەروونی مروٚڤ تووشی (چەپاندن - کبت - Repression) دەبیٚ ئەو چەپاندنەش ووزەی مروٚڤ دەمژیٚ و لەپیٚناو مەبەستی نزمدا بەکاری دەهیٚنیٚ ئەمەش وا لەنەست دەکات بەنەستی بمیٚنیٚتەوە، چونکە چەپاندن خوٚی ریٚی پیٚنادات نەست بیٚت بەهەست، ئەمەش لەژیٚر بوٚچوونی میکانیکی دەروونیدا پەخش دەبیٚ، لەبەرئەوەی چەپاندن ری لەهەندیٚ شت دەگریٚ (کەس-تاك) نایبینیٚ کە لەئاستی بینیندا بیٚت یان هەرچی ببینیٚ هەلٚیدەگریٚ، دووجوٚر چەپاندن هەیە:-

١-چەپاندنی سەرەکی نابەجیٚ.

٢-چەپاندنی بەجیٚ.

چەپاندنیٚ سەرەکی نابەجیٚ قەدەغەیە هەلٚبژاردنی بابەتی رەمەکی دەکات کە (هەست)ی نەبووە هەتاکو ببیٚتە هەست، بەلاٚم کەسیٚتی بەجیٚ (من - خود) مامەلٚە بکریٚت لەگەل سەرەتای بیرکردنەوە بوٚ هەرەشەکردن لەلایەن هیٚزە پالٚنەرەکانەوە بوٚ (منی بالاٚ) لەهەلٚسوکەوت یان بوٚ هەست کەدەبیٚتە چەپاندنیٚکی بەجیٚ چەپاندنی بەجیٚ کەبەئاسانی پیٚی دەلیٚن چەپاندن وا لەیادی مەترسیدار دەکات یان بیر دەکات یان دەرك کردنی حسی کە لەدەرەوەی بازنەی هەستدا بیٚت، لەهەمان کاتدا ئاستەمەکانی دادەنیٚ دژی هەر شیٚوە بەرگری بزویٚنەرانە، لەبەرئەوەی (خود - الذات)

ئاراسته دەکرێت بەرەو ووشك کردنەوەو مژینی ووزەکان لەپێناو ئامانجەکانیتردا لەپێناو شتی تردا ئەمەش رامان دەکێشێته نێو بابەتی (گوزارش - چەپاندن- التسامی) کەوابێ تێگەیشتنمان لەنەست ڕێڕەوێکه لەتیۆری چەپاندنەوە سەرچاوەی گرتووە، چەپاندن یەکەم بلۆکه بۆ نەست، دەبێ ئەوەش بزانین کەدوو جۆر لەنەست هەیە، ئەو نەستەی دەبێتە تەواو و لەگەڵ ئەوەی بتوانێ ببێتە هەست ئەو چەپاندنەش کەناتوانێ یان توانای ئەوەی نیە ببێتە هەست، بۆچونیشمان بۆ ئەو دینامیە نەروونیە ئەوەیە، تەنها دەتوانرێ شوێنەوارێك بەجێدەهێڵێ لەلیستی زاراوەکانو پیاهەڵداندا، ئەو شتەی دەبێته نەستی بەمانای پیاهەڵدان نەك بەمانای دینامی، ناوی لێدەنێین (پێش نەست - قیشعور) (قبل الشعور)، (پێش هەست)یش بەڕای ئێمە نزیکترە لەنەست وەك لەهەستەوە، پێش هەست دووشێوەن یان دوو پلەن وەك ئەوەی بڵێی دەروونین، راستیش ئەوەیە که هەموو چەپاندنێك نەستییە، بەلام هەموو نەستێك چەپاندن نیە، هەروەها دەزانین کە(من)یش لەوانەیە ببێتە نەستی لێرەدا نەستی کەسایەتی هەرێمی دراوسێی (من)ی پێك هاتووە لە شارەزاییە هەستییەکانی رابردوو بەلام چەپێدراون یان پشت گوێخراوون یان هەر لەسەرەتادا لاواز بوونەو شوێنەواری خۆیان بەجێهێشتووە رێگای نێوان نەستی کەسایەتیو

بارەگای چەپاندنە لەوانەیە لەژێر فەرمانی (منی بالآ) گاربکات، کاتێك چەپاندن دروست دەبێت، بەڵام کە کاریگەری (منی بالا) فشار دەخاتە سەر دروست کردنی کەسایەتی چەپاندن زیاتر دەبێت ئەو چەپاندنەی کە بەهۆی (منی بالا)وە دەبێت وا دەکات کە گۆڕانی تێکەڵاوی ناوەوە بۆ کەمەن کێشکردنی باوان کە دەسەپێنرێت بەسەر منداڵدا، کاتێکیش چەپاندن رۆدەچێ ووزەی خۆی ئازاد دەکات کەهێزە هێرشکەرەکان بەکاردەهێنێ ئەوا بەرهەم دەدات بەدەستەوە کەوا چەپاندن کاتێك رەمەك مەنفەسێکی سروشتی بۆ خۆی نادۆزێتەوە لەلای تاکە کەس حاڵەتی دڵەڕاوکێ و ئازارو ململانێ دروست دەبێ سروشتیش ئەو ئازارە کەم دەکاتەوە ئەویش بەچەپاندنی پاڵنەری رەمەکیانە بەهۆی لابردنیەوە لەبالای هەستی ژیانی عەقڵیەوە پاڵی پێوە دەنێ بۆ نەست لێرەدا کارکردنی چەپاندن خۆی نەستیە چونکە ئێمە نازانین یان دەرکی پێناکەین چیڕوودەدات لەناو مێشکماندا، کەواتە ئەو رەمەکیانەی کەهەڵگری ووزەن کەپێیان دەژین دەبێ زۆر بەگرنگی بایەخیان پێبدرێ ئەویش لەرێگای نەگرتنی کەناڵەکانی کەپیایدا تێپەڕدەبن ئەگەر وانەبێ ئەوا ئەو هێزەی پاڵنەرە بۆ کەسایەتی مرۆڤ بۆ پێشەوە لاواز دەبێ، بەڵام بەپێشکەوتنی تەواوی کەسایەتی، ئەو رەمەکانە سەربەست دەبن و سەرهەڵدەدەن لەسەر رووی هەستی عەقڵی و کاتێکیش هەڵەکان لەبارنین بۆئەوەی رەمەکیەکان ئاڕاستە بکرێن بۆ گەیشتن بەئامانجیان ئەوکاتە

هەستکردنی دراوسێی کراوەیەو ڕێگای گواستنەوەش هەیە لەنێوانیاندا، ئەمەش بۆچوونی (یونگ)ە.
شتێك چۆن دەبێتە پێش هەست؟ لەم حاڵەتەدا وەلام بەم شێوەیە دەبێت (بە پەیوەندی کردنیەوە بەنمونەیی‌یە زارەکی‌یە لێك چوونەکاندا دەبێ) ئەم نمونە زارەکیانەش کەخۆی پاشماوە یاداشتەکانە، کە لەپێشوودا ئیدراك بوو وەك زۆربەی شتە یاداشتەکانی‌تر وابوون دەتوانرێ لەنوێ وە ببێتە هەست، ناتوانرێ ببێتە هەست گە پێشووتر ئیدراکی هەستی نەبوبێت، هەر شتێکیش لەناوەوە دێت بێجگە لەسۆزەکان دەتوانرێ ببێتە هەست وەك حەتمیەتێك هەوڵ دەدات کەخۆی تەرجومە بکات بۆ ئیدراکە دەرەکیەکان ئەمەش ڕێگادانە بە دەرامەتی پاشماوە یاداشتیەکان، ئەی چۆن چەپێندراو دەبێتە پێش هەستەوە لەڕێگای کاری شیکردنەوەوە لەسەر ئەم بنچینەیە هەست لەجێگای خۆیدا دەمێنێتەوە بەلام بێ‌ئەوەی بگاتە پێش هەست واتە بەرزبوونەوەی بەرامبەرەکی بۆ گەیشتن بەهەست، چەپاندنی دەروونی کاردەکاتە سەر نەك تەنها دەروون بەڵکو کاردەکاتە سەر ڕەمەکی‌یە جیاوازیەکانی مرۆڤ یان تەماهیەکانی مرۆڤ تا ئەوکاتەی ترس لەدەرووندا نامێنێ ئەوجا چەپاندن ڕۆدەچێ و بوونی نامێنێ، چونکە چەپاندن دەبێتە هۆی تێکشکاندنی (من) لەبەرئەوەی زۆرجار تەماهیە جۆراوجۆرەکان لێك جودا دەبنەوە بەهۆی بەرگریەکانەوە ئەو حاڵەتە نهێنی‌یانەی کەپێی

دەڵێن چەندایەتی کەسایەتی یان (هەمە کەسایەتی Multiple Personolity) دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کەتەماهە جیاوازەکان کاریگەر دەبن لەژێر هەستدا و بەسەرە داگیری دەکات، ئەمەش هۆی ئەوەی کە (من) لەسەرەتادا زۆر لاوازە بەزانینی ئەرك و بابەتەکان هیچ لەبەردەمیدا نامێنێ تەنها ئەوە نەبێت کەهەوڵ بدات بۆ ئەوەی خۆی لێدووربخاتەوە ئەمیش بەهۆی بەردەوامی چەپاندنەوە (من)ی هستریاش خۆی دووردەخاتەوە لەدەرك پێکردن بەو ئازارانە کەپێی داوەتێ، کەسەرچاوەی رەخنەیە (منی بالا) بەهەمان ئارەزو کەخۆی بەرگرە لە خۆی دژی ئەرکی بابەتەکی، لێرەدا هەڵدەستێ بەکاری (چەپاندن) لەسەر ئەم بنچینەیە هەست کردن بە (ذنب) نەستیەو لەبێهەستیدایە لەنالوژیکیدایەو دوایی خۆزگە خواردنە بەنەبوونی پەیوەست کردنی بەدەرەوەی خۆی، ئەوەش بۆ (من) دەگەڕێتەوە چونکە (من زۆرجار هەڵدەستێ بەکاری چەپاندن لەخزمەتی (منی بالا) دا دوایش لەخزمەتی خۆیدا، کە لێرەدا (منی بالا) رۆڵی نامێنێ لەشتە دەرەکیەکان و تەنانەت ناوەکیەکان کە (من) یەکێکە لەو شتە ناوەکیانەی مرۆڤ، کەواتە (من) نێوەندی راستی تەنگەتاوە کاتێ مەترسی دێتە سەر لەهەرسێ رووەکەوە لەدووربینی دینامی/ دووربینی تۆپۆگرافی/ دووربینی ئابووری یان چەندایەتی) بەهۆی هۆکاری راکردنەوە خۆی پێش دەخات، (من)ی تێکشکاو وای لێدێت کە بەدوای پلەیەکی تردا بگەڕێن لەسەرو (من)

دەبێت و کەخۆی لەخۆیدا پێگەیشتنی جیاوازیەکانی ناو خۆی (من)ە کە
ئەو پلانە ناو لی‌بنێین (من) یان (منی بالا)، (من)یش ئەوکاتە واز لەخۆی
دەهێنێ کەدەزانێ یان کە هەست دەکات جێی نارەزایی و چەوساوەتەوە
لەلایەن (منی بالا) وە لەجیاتی ئەوەی لای خۆشەویست بێت، چونکە
(من) نەستەو (منی بالا)ش هەستە، تێنەگەیشتنی (من - نەست) بۆ
(منی بالا - هەست) گرژوو رووخانێك روودەدات واتە کارەساتێکی
ترسناك بەرێگاوە دەبێت بۆ تێك شکاندنی هوشیاری تاك لەتاکیشەوە
زۆرجا کۆمەڵ دەگرێتەوە بەتایبەتی لەکۆمەڵە خێڵەکی‌یەکانداو کۆمەڵگا
دواکەوتووەکاندا، ئەو حاڵەتە لای تاکی کورد بەدی دەکرێ چونکە تاکە
کەسی کور (من)ی نەخستۆتە خزمەت (منی بالا)و (منی بالا)ش ئامادە
نیە ببێتە چاودێرێك بەسەر (من)ەوە هەربۆیە گرژی و لولپێچیەك رووی
داوە لەنێو ئەو پێکهاتە ئالۆزەداو کەسایەتیەکی کەللەرەقی لێ‌دروست
کردووەو زیاتر گرژتری کردووەو کاریگەری خەستی کردۆتە سەر
کەسایەتی کورد، کەسایەتیەکی گێل و سەخت دوور لەپێشکەوتنەکان،
بێجگە لەوەش مەترسی دەورووبەری لەسەرە هەمیشە وەك کارێکی
میکانیکی ئەمەش زیاتر لەرێی دەرەوە واتە (تۆپۆگرافی + ئابوری +
دینامی) کە ئەو سێ چەمکە ژیانیەی رۆژانە فشارێکی گەورەن بۆ سەر
(من)ی کرودو (منی بالا)ش ئەوە ناخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوەو تەنانەت
(من)یش ناخاتە نێو دادگای خۆیەوە یان هێڵی سووری لێپرسینەوە

هەربۆیە بووەتە جێی مەترسی و تێکشکاندنی هوشیاری کورد، ئەویش وەك پرۆژەیەك کە لەنێوەوەی خۆیدا بەرامبەر بەخۆی بەکاری دەهێنێ، واتـە (مـن) هەمیشـە تێنەگەیشـتنە لەپاشـەرۆژدا کەسـایەتیەکی (سایکۆپاسـی - ناکۆمەڵایـەتی) دروسـت دەکـات، سـەرەڕای ئـەوەش کەسایەتیەکانی گونجاو نین بۆ چوونە نێو قاڵبی کەسایەتی تەواو بەڵکو بەکوڵەبنە دەمێننەوە (cretinism) کە ئەمانەش چەشنێکن لەچەشنەکانی دواکـەوتنی هۆشـی کـەدواجار تووشـی رووخـاندنی Frustration دەکـات کەبەمـەش تاکـە کـەس گـیر دەخـوات بـۆ گەیشـتن بـەئامانج و هـەروەها دواکـەوتنی لـەڕەوڕەوەی پێشـکەوتن یـان گرتنـی رێگـای گەیشـتنی بەئامانجی هەستی یان نەستی، واتە دروست کردنی کەسایەتی لای تاکە کـەس کەلـەژێر کاریگـەری یـەکتری دروسـت دەبێـت وەك (فرۆیـد) دەڵـێ (کەسایەتی تاك لەسێ پێڕەوی بنەڕەتی دروست بووە (ئەو id من Ego، منی باڵا super Ego)، لێك کارکردنی ئەم سێ پێڕەوە لەیەکتری سنووری رەوشـی دیاری ئەکات) لەپیشەکانی دروستکەری لەدیمانـەی فرۆیـدەوە ئەوەیە مرۆڤ لەسەر جۆری جیاجیای هوشیاری کاردەکات وەك (هەست - پێش هەست - نەست)، (منـی بـاڵا)ش وەك رۆڵـی پۆلیس و ویژدانـی دەبینـێ لەسـەر (من)و (ئەو)ی دەرەوە ئەگـەر (من) رێگـای پـێبدات بـۆ لێـدان لـەدەرگای چـەپاندن و کەئـەویش بـەهۆی شـکاندنی ترسـە لـەدەروونـدا، کۆمـەڵگای کـوردی هـەر لەبەرەبـەیانی مێژوویی‌یـەوە ئـەو

ترسانه چوونەتە نێو دڵی لەنێو دەوروبەریەوە ئەویش بەهۆی کەرەستەکانی زەبرو زەنگ‌و چەوساندنەوە، کە ئەوەش بەپێی رۆژگارو ماوەی مێژوویی کاریگەری کردۆتە سەر دەروونی‌و ترسێکی لا پەیدا کردووە کەهەمیشە بسڵەمێتەوەو هەنگاوی جدیانە نەنێت بۆ شکاندنی کۆتی ترس کەئازادبوونی کەسایەتی خۆی رادەگەیەنێ کەچی ناچار دەبێ کەترس بەترس چارەسەر بکات کە ئەمەش لەکۆمەڵێکی دواکەوتوودا بەمەترسی دادەنرێ بۆ سەر کۆمەڵگاو ئاکامەکەی بەخراپ دەگەڕێتەوە بۆ سەر کەسایەتی کورد وای لێ‌دەکات لەناچاری چارەسەرکردن بۆ کێشە دەروونیەکان ناچار بێت هەستێ بەهەندێ شت کەهەست‌و نەست پێی رازی نەبن‌و لۆژیك قبوڵ نەکات.

وێنەی بیروبۆچوونی فرۆید بۆ کەسایەتی

سەرچاوەكان:

١-علم النفس الجمعي وتحليل الأنا- سيغموند فرويد - ترجمة جورج طرابيشي الطبعة الاولى بيروت ١٩٧

٢-الأناو الهذا- سغموند فريود - ترجمة جورج طرابيشي الطبعة الاولى بيروت ١٩٨٣

٣-مبادئ علم النفس الفرويدى - تأليف كالفن -س- هول/ تعريب دحام الكيال الطبعة الثالثة بغداد ١٩٨٨

٤-علم النفس الاكلينيكي - د. مصطفى فهمي دار مصر للطباعة - بێ مێژوو

٥-بافلوف و فريود - تأليف هاري ويلز - ترجمة شوقي جلال الجزء الاول الهيئة المصرية العامة للكتاب ١٩٧٥

٦-قاموس علم النفس - د.عبدالستار طاهر شريف - الطبعة الاولى ١٩٨٥

٧-مرۆڤ لەڕوانگەی ماركسەوە - ئەریك فرۆم - وەرگێڕانی هەنگاو چاپی یەكەم ١٩٩٩

# پرۆسەی بوون بە مرۆڤ

پێش دروست بوونی کۆمەڵگا مرۆڤ لە حاڵەتی سروشتیدا دەژیا، یەکگرتنێك هەبوو لە نێوان مرۆڤ و سروشتدا، هەروەك مارکس دەڵێ (مرۆڤ ناوکە برە نەبوو بوو لە سروشت)، ئەو مرۆڤەی بە زەبری بازووی خۆی دەژیاو نەگەیشتبووە ململانێ لەگەڵ سروشتدا، سروشت سەرچاوەی یەکەم بوو بۆ مرۆڤی سەرەتایی، بەڵکو زیاتر لەوە ئەم ئەوی تەواو دەکرد، سروشت توانی مرۆڤ لەژێر کاریگەری خۆیدا بهێڵێتەوەو کۆیلەی خۆی بکات و بۆ چەند سەدەیەك توانی هەر بە سەرەتایی و گێلی بیهێڵێتەوە، واتە مرۆڤ لە بەرایی ئەو مێژووەدا کە بە پێش مێژوو ناسرابوو بە شێوەیەکی کوێرانە لەلایەن سروشتەوە کلۆڵ و زەلیل ببوو، وە نەبێ مرۆڤ رازی بوبێ بەو ژیانە، واتە هەوڵی داوە بۆ رزگاربوون لە سروشت و ئەو پەیوەندیە تێك بچێت و داکەوێ لە سروشت، لێرەوە مرۆڤ پەتی خۆی دەپچڕێنێ و سەربەخۆیی خۆی وەك بوونەوەرێکی

جیاواز رادەگەیەنێ و دواتر بەهۆی کارو ژیریی و بیرکردنەوە سروشت بەلای خۆیدا رادەکێشێ بەڵام ئەمجارە دەیخاتە خزمەت خۆیەوە، لەم کارکردنەدا مرۆڤ خۆشی خۆی دەگۆڕی لە بوونەوەرێکی کۆیلەی سروشت و نیمچە ئاژەڵ و دەبێتە ئەو مرۆڤەی خۆ دەناسێ، خۆی بە جیا لە سروشت سەیر دەکات و دەڵێ (من جیام لەوانی دی، من هەست بە سەربەخۆیی و بوونی خۆم دەکەم، کەوابێ من چیم!!؟) بەم پرسیارە مرۆڤ بەدوای ئەو وەڵامەدا دەگەڕێ کە پرسیارەکەی تێر بکات، ئەم بیرکردنەوەیە سەرەتایی دروست بوونی پێکهاتەی کەسێتی مرۆڤە، لای ئەرستۆ مرۆڤ بیرکەرەوەیە،

لە قۆناغێکی دیاری کراوی مێژوودا، مرۆڤ بەهۆی ململانێی نێوان خۆیی و سروشت گەشە دەکات، بەهۆیەوە دەگاتە چارەسەرکردنی ململانێکەو کۆتایی بە مێژووی کۆنی خۆی دەهێنێ و خۆی لەنێو مێژوویەکی تردا بەرجەستە دەکات، کە مێژووی مرۆڤایەتی واتە بوون بە مرۆڤ لە واقیعدا دەست پێ‌دەکات، مێژووی وەهم و خەیاڵات و وێناندن تێ‌دەپەڕێنێ و پێ لەسەر زەوی دادەگرێ، بوونی خۆی دەسەلمێنێ و بەرەنگاری مێژووی کۆنی خۆی دەبێتەوە ئەویش لە رێی بیرکردنەوەو ژیرییەوە نەك بەهێزو بازوو.

# سروشت و مرۆڤ

هەوڵ دان بۆ سەربەخۆیی بوونی مرۆڤ، خۆی لە خۆیدا بە گەورەترین هەوڵدان دەژمێردرێ لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، لە دیالەکتیکی مێژوودا بە گرنگترین پرۆسەی خۆگۆڕین دەژمێردرێ چونکە مرۆڤ نەیویستووە هەمیشە لەژێر کاریگەری سروشت و دەوروبەردا بمێنێتەوەو ئازادی خۆی لەدەست بدات، بەڵکو ویستوویەتی بگات بە خۆیی و ئازادی خۆی، هەر بۆیە مل کەچی قبوڵ نەکردو لە سروشت خۆی جیاکردەوەو خۆی رزگار کرد، ئەمەش لە رێی بیرکردنەوە (سپینۆزا لە ئاستێکی گەشەکردووتردا حسابی بۆ (بیر) کردەوە وەختێك مرۆڤ دەڵێ (نا) ئیدی لێرەوە وەزیفەیەك بە مرۆڤ دەدرێت) (گۆڤاری ژیار ژمارە (٥) ساڵی دووەم ٢٠٠٠ لاپەڕە (١٧)، بەو نارەزایی و دابڕانە گەورەیی خۆی سەلماند، ئەوەش ئەم ئاکامە دەدات بە دەستەوە کە مرۆڤ لە مرۆڤێکی تەمەڵ و کۆن و بەرکارو کەم عەقڵەوە دەگۆڕدرێ بۆ مرۆڤێکی بکەرو

ژیرو ئازاد کە خودی خۆی لە خۆیدا دەدۆزێتەوە و لە هەمان کاتدا سەربەستی دەدات بە خۆیی و لە کۆیلایەتی رزگاری دەبێت، ئەریك فرۆم دەڵێ (مرۆڤ پێش ئەوەی ببێتە خاوەن هوشیاریەکی خودی، واتە، پێش ئەوەی ببێتە مرۆڤ. لە یەکێتی‌یەکدا بوو لەگەڵ سروشتدا (ئادەم و حەوا لە بەهەشتدا) کردەی یەکەم بۆ ئازادی کە درکاندنی وشەی (نەخێر) بوو چاوی ئەوی کردەوە)، (مرۆڤ لە روانگەی مارکسەوە- ئەریك فرۆم- وەرگێڕانی هەنگاو، چاپی یەکەم ۱۹۹۹ لاپەرە (۷۸)، لێرەوە مرۆڤ پەتی خۆی دەپچڕێنێ و دەبێتە گەورەو پیاوی خۆی، (مارکس دەڵێ: مرۆڤ ناتوانێت خۆی بەسەربەخۆ بزانێت، ئەگەر خاوەنی خۆی نەبێت) (هەمان سەرچاوەی پێشو لاپەرە (٥)، مرۆڤ بە ئازادی لەدایك دەبێت، بەڵام سروشت ئەو ئازادیەی لێ کوت دەکات و دەیخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە ئەویش لە وێناکردن و راڤەکردنی کاریگەریە کۆنەکاندا فشار دەخرێتە سەر مرۆڤ بۆ ئەوەی ئازاد نەبێت، واتە لە سروشت جیانەبێتەوە، بەڵام پێداگرتن لەسەر ئازادی مرۆڤ خۆی پێ داگرتنە لەسەر سەربەخۆیی و گەڕانەوە بۆ ئازادی یەکەم، ئەوکاتە بوونەوەر دەبێتە مرۆڤ کە ئەو یەکێتی‌یەی نێوان خۆیی و سروشت تێك بدات و جودای بکاتەوە، واتە خۆی ناوکی خۆی ببڕێ، کە ئەمەش بەهەوڵ و ژیری مرۆڤ خۆی دەبێت تا ئەو کاتەی پێویست بوون بە سروشت کۆتایی دێت و ئەو پەیوەندیە ناچاریە نامێنێ،

**بوون بە مرۆڤ:**

پرۆسەی بوون بە مرۆڤ، پرۆسەیەکی ئاڵۆزو درێژخایەنە لە رووی رەوتی مێژووی مرۆڤایەتیدا، مرۆڤ بۆ ئەوەی خۆی لەدەست نەدات هەمیشە هەوڵی داوە لەژێر فشارە نامۆکاندا دەرچێت و رزگاری ببێت، لە هەمان کاتدا بۆ ئەوەی بوونی خۆی وەك مرۆڤ لەدەست نەدات بەدوای خۆیدا گەڕاوە لەنێو خودی خۆیی و جوڵەی مێژوودا، لە هەمان کاتدا خۆی پاراستووە، تا ئەوکاتەی سروشت و دەوروبەری ناسی و دواجار خۆی ناسی، بۆ جودایی کردنەوەی خۆی لەوانی تر، سروشت و ئاژەڵ، ئەم پرۆسەی بە مرۆڤ بوونە، گەڕانی مرۆڤە بەدوای خۆیداو دروست کردنی پێکهاتەی کەسایەتی مرۆیی‌یە، ئەمەش وای لێکرد کە رۆژ دوای رۆژ گەشە بکات، چ لە رووی ژیریی و چ لە رووی بایۆلۆژی‌یەوە، ئەمەش رێ خۆشکەر بووە بۆ دروست کردنی شوێن و رێگەی خۆی و هەڵهاتن لە سروشت، واتە ژیان بردنەسەر دوور لە سروشت و ئاژەڵ، بۆ پاراستنی هەم خۆی هەم ئازادی خۆی وەك مرۆڤ (مرۆڤ بوونەوەرێکە لە پرۆسەی دروست بوونی کەسێتی‌دا لە بوونەوەرێکی بایۆلۆژیی‌یەوە دەبێتە بوونەوەرێکی مرۆیی کەسێتی (Personality) دواجار دەبێتە بوونەوەرێکی مرۆیی (کۆمەڵایەتی)، (هەمان ژمارەی گۆڤاری ژیاری پێشوو لاپەرە (١٨)، پاراستنی خۆ واتە پاراستنی رەگەزی مرۆڤ، کە

ئەمەش پێویستی حاڵەتی سروشتی مرۆڤە بۆ ئەوەی رەگەزی خۆی بپارێزت و تووشی وێرانکاری نەبێت، لێرەدا مرۆڤ تووشی راگواستنی خۆ دەبێ لە گیروگرفتی حاڵەتە سروشتیەکان بۆ کۆمەڵگا، ئەویش بەهۆی خۆ کۆکردنەوە لە جوگرافیایەکدا لەنێوخۆدا بۆ بەردەوامی رەوتی مرۆیی خۆیان کە ئەمیش هەر بە حاڵەتێکی سەرەتایی سەیردەکرێت کە دەتوانین پێی بڵێین حاڵەتی پاراستنی رەگەزی مرۆڤ لە وێرانکاری. ئەمەش حاڵەتی پێش کۆمەڵگایە، یان پێش دروست بوونی کۆمەڵگا (کۆمەڵگایەکی کۆمەڵایەتی)، کەوابێ بە شێوەیەکی سروشتی مرۆڤ ئەو حاڵەتە پێکەوە ژیانە دروست دەکات، یان دروست دەبێت لەبەر پێویست بوون. بۆ پاراستنی تاك لە هەمووداو هەموو لە هەمواندا،

**مرۆڤی تەواو:**

ئەم حاڵەتەی مرۆڤ بەوە جودا دەکرێتەوە یان پۆلێن دەکرێت کە مرۆڤ دوای جیابوونەوەی لە سروشت و لە حاڵەتی ئاژەڵی و دڕندەیی و ناهوشیاری دەچێتە نێو کۆمەڵێکی دی کە پێی دەڵێن کۆمەڵگای مرۆڤ، کە جێگەیەکی بەجێ بووە بۆ مرۆڤ خۆی وەك پێویست بوون بۆ مانەوەی خۆی و لەدەست نەدانی رەچەڵەکی، لێرەدا مرۆڤ دەبێتە مرۆڤێکی ژیر (homo sapiens) پەیڕەوێکی دی جێبەجێ دەکات لەنێو کۆمەڵگادا، کە لە دەرەوەی هەڵسوکەوتی سروشتی خۆی نەبێت

بەڵكو هەمان سروشتی مرۆڤە بەڵام مرۆڤایەتیەكەی وای لێدەكات كە ببێتە مرۆڤێكی كۆمەڵایەتی لەسەر پەیڕەوێكی پێشكەوتوو هێزە جیهانیەكانی دەرەكی وای لێدەكەن كە بیر بكاتەوەو كاربكات بۆ مانەوەی خۆی، مرۆڤ لێرەدا بۆ ئەوەی پەیوەندیەكانی سەركەتو بێت لەگەڵ كەسانی ترداو لەگەڵ توخمی جیهانی دەوروبەردا كە بە هۆیەوە توانیویەتی شارستانیەتێكی تایبەت بەخۆی دروست بكات كە لە سەرو جیهانی بایەلۆجی و ئاژەڵیەوە بێت، ئەویش جیهانی ئاوەژوو بوونی عەقلانیە، واتە مرۆڤی تەواو و كامڵ، لەنێو ئەو كۆمەڵگایەدا مرۆڤەكان دەكەنە هەڵەیەو ئاروەژوو جارێكی تر پەیوەندیەكانی مرۆڤ تێك دەچن، تێك چوونی شیرازەی كۆمەڵگا (ئەم حاڵەتە پێش كۆمەڵایەتی بوونی كۆمەڵگایە) ئەمجارەیان بە شێوەیەكی تر ئەویش لەنێو كۆمەڵگاداو دوور لە سروشت، لێرەدا بەهۆی سروشتی مرۆڤەوە ئەو پەیوەندیە كە لەسەر بنەمای پێكەوە ژیان و بنەمای دروست كردنی كۆمەڵگا پێك هاتبوو، بەهۆی گۆڕانكاریەكانی ئاوەزی مرۆڤ و خۆویستی مرۆڤ شیرازەی ئەو كۆمەڵگایە تێك دەچێتەوە، (مرۆڤ دەبێتە گورگی مرۆڤ) هەروەك (هۆبز) دەڵێ، داروینی كۆمەڵایەتی و تیۆرەكەی (ململانێ لە پێناو مانەوەدا) یان (مانەوە بۆ باشترو بەهێزترە) وەك یاسایەكی سروشتی نێو ئەو كۆمەڵگایە رۆڵی خۆی دەبینێ، ئەو تیۆرەی داروین لەنێو كۆمەڵگای مرۆڤی تەواودا بە شێوەی هێزی بازوو یاسای گورگ پیادە ناكرێ بەڵكو

بەهۆی ئاوەزەوە دادەکەوێتە خوارەوەو دەبێتە یاسایەك لەنێو کۆمەڵگادا، ئەو کۆمەڵگایەی کە یاسای تێدا نیە، بەڵکو سەرکەوتن بۆ ئەوەی زیاتر توانای هەبێت، ئەو سیستەمە دیاری دەکات کە دەتوانێ چ لە توانایدا هەبی بیبات هەندەی ئەوەی کە دەتوانرێت پارێزگاری لێبکات واتە هەرکەسە بەلای خۆیدا راپێچی دەکات،

لێرەدا هەرکەسێك، ئازادی/ یەکسانی/ ئارەزووی خۆ/ پاراستنی خۆ/ دەسەلات/ ی بۆ خۆی دەوێ، ئەمەش واتای تاکگەرایی دەنوێنێ، سەرەڕای ئەو تاکگەرایی‌یە مرۆڤ ناتوانێ بە تەنهاو دوور لە کۆمەڵگا بژی، دەردی نیچە دەڵێ (راگەیاندنی مردنی خۆیە) ناشتوانێ بگەڕێتەوە دۆخی دواکەوتن و لە کۆمەڵ خۆی جوداکاتەوە، بەڵکو پێکەوەژیان ناچاری و حەتمی دەبێ، لەبەرئەوەی بووەتە پرۆسەی یاسای کۆمەڵایەتی، واتە بە کۆمەڵایەتی بوونی کۆمەڵگا، بەم پێیە دامەزراندنی کۆمەڵگا پێویست بوونی خۆی هەیە، ئەمەش لە پەیمانە کۆمەڵایەتیەکان و رێکەوتن و کۆکبووندا دیاردەکەوێ لەسەر ئەو بنچینە هاوبەشە، لەسەر ئەو بنەما هاوبەشە کۆمەڵگای خۆی حوکمڕانێتی دەکات، بۆیە بیرۆکەی پەیمانی کۆمەڵایەتی "Social Contract" لەسەر ئەو گریمانەیە دامەزرا، واتە لەدەست سەندنەوەی ئارەزووەکانی تاك و گەڕانەوەی بۆ گشت، هەروەها تواندنەوەی تاك لە کۆدا، نەك کۆ لە تاکدا، چونکە تاکەکەس لە زۆر باردا مل کەچ نابێ بۆ تاکێکی دی رەگەزی

خۆی)، بەڵکو مل بۆ هەموو /گشت/ شل دەکات و بەمافی خۆشی سەیری دەکات، ئەمەش دەچێتە خانەی کۆمەڵگایەکی سیاسی یان کۆمارێك کە گشت بەشداریان تیادا کردووە، ناودەبرێ، بەشداربوونیش تیایدا ناوی گەل وەردەگرن و تاکیش بەهاولاتی بانگ دەکرێت، ئەم پرۆسێسە کە مرۆڤ دەیەوێ بیگاتێ و لە حاڵەتی سروشتی بۆ حاڵەتی کۆمەڵگا بچێ و لەوێوە دەچێتە حاڵەتی مەدەنیەت چونکە بێ ئەو دەسەلاتە مرۆڤ گورگی مرۆڤ دەبێت،

**پەیمانی کۆمەلایەتی:**

کۆبوونەوەی مرۆڤەکان لە نێوان خۆیانداو لەنێو کۆمەڵگایەکی هۆشیاردا خۆی لە خۆیدا پێکەیەکە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی هاوبەش، لێرەشەوە پێویست بوونی کۆمەلایەتی لەدایك دەبێت ئەویش پێویست بوونی دیاردەی مرۆڤ خۆیەتی بۆ بوون بە کۆمەلایەتی، کە خۆی وەك هاولاتی تیا دەدۆزێتەوە، ئەو پرۆسێسە نایەتەدی گەر لەژێر پەیمانێکدا نەبێت، ئەویش پەیمانی کۆمەلایەتی‌یە، پەیمانی کۆمەلایەتیش واتە پێکەوە ژیان و پێکەوە هەڵ کردن، کە تاکەکەس لەو پەیمانەدا هەست دەکات کە کەسێکی سەربەخۆیە لەو کۆمەڵەدا دەژی و مل کەچی کۆیە نەك تاك هەروەها خاوەن کۆمەڵێك ماف و ئازادی‌یە، لە هەمان کاتدا بەرامبەر بە کۆمەڵ لێپرسراوێتی هەیە کە خۆشی دەگرێتەوە، ئەو کەسەی کە هەست

بكات كە دەبێ بەشداری بکات لە کۆمەڵگادا بۆ بنیات نانەوەی کەسایەتی خۆی ئەوە حاڵەتی مرۆڤ تێدەپەڕێنێ و دەبێتە هاوڵاتی، (گواستنەوە لە حاڵەتی سروشتی بۆ حاڵەتی مەدەنی گۆڕانێکی بەرچاو لە مرۆدا دروست دەکات ئەمەش بە گۆڕینەوەی غەریزە لە ڕێڕەویدا بە دادوەری و بەتێرکردنی کردارەکانی بە مۆراڵ) (گیروگازی چەمکی کۆمەڵی مەدەنی- د. کەریم ئەبو حەلاوە- وەرگێڕانی بۆ کوردی ئیسماعیل کوردە- ڕەوشت رەشید- نوری بێخاڵی- چاپی یەکەم ٢٠٠٠ لاپەڕە (٣٠))، کەوابێ بۆ ئەوەی بە تەواوی ببینە مرۆڤ دەبێ ببینە هاوڵاتی هەروەها (جان جاك رۆسۆ) دەڵێ (نابینە مرۆڤ تا نەبینە هاوڵاتی) دیارە پەیمانی کۆمەڵایەتی نامەیەکی کۆمەڵایەتیە کە مرۆڤەکان دای دەڕێژن بۆ گەیشتن بە هاوڵاتی لەژێر بیروباوەڕی خۆیاندا، ئەو نامەیە لە کۆمەڵێکی مەدەنیدا دەگاتە ئامانجی خۆی.

**بە هاووڵاتی بوون:**

بە هاووڵاتی بوون، بە مرۆڤ بوونە، واتە کۆمەڵێك ئەرك و بەرپرسیارێتی و کۆمەڵێك ماف و ئازادی، بەرامبەر (خۆ/ کۆمەڵ/ دەوڵەت) کەواتە هاووڵاتی مرۆڤێکە لە کۆمەڵدا کاردەکات، بەم کارانەی خۆی دروست دەکات و خۆشی دەپارێز و دەوڵەتیش دەپارێزێ و ئازادی و مافی خۆشی بەدەست دەهێنێ، ئەو مرۆڤە ئەندامێکە لە کۆمەڵداو هاوڵاتیەکە لە نیتشمانێکدا کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا توخمی دەوڵەت پێك

دەهێنێ، کەواتە بوون بە ئەندام و هاوڵاتی خۆی لە خۆیدا پێکهێنەری شتێکن کە لەسەرو ئەوەوەن، ئەویش کۆمەڵە کە خۆی تیایدا ئەندامێکە و لە خۆی دادەدرێ و دەیدات بە گشت، بە راستیش ئەندامێکی وا شایتسەی هاوڵاتی بوونەو شایستەی دەوڵەتە، دروست بوونی کۆمەڵگاو پێکەوە ژیان و پێکەوە گونجان و بەرەوپێش چوون خۆی لە خۆیدا دەوڵەتە واتە کۆمەڵگا بە دەوڵەت چوێنراوە، وەك ئاشکرایە چەمکی (Polis) هەمیشە لە تەرجومەی زمانی روسیدا مانای زاراوەی (دەوڵەت) دەدات بۆیە باس لەوە نەکراوە کۆمەڵ و دەوڵەت وەك دوو شتی دژبەیەك بەرامبەر یەکتر دابنرێ، بۆیە لە فەلسەفەی یۆنانی کۆن سنوور لە نێوان هەردووکیاندا نەکێشراوە کۆمەڵ و دەوڵەت وەك دروست لەناو یەکتردا توابنەوە وابوو) (گۆڤاری مەدەنیەت ژمارە (٨) تەمووز — ئاب— ساڵی دووەم ٢٠٠٠ لاپەرە (٧١)، دەتوانین کۆمەڵی مەدەنی بە دامەزرێنەری بینای مرۆڤ دابنێین لە پرۆسەی هاوڵاتی بونیدا، ئەمەش جەستەیەکی نوێیە بۆ مرۆڤێکی نوێ و هوشیار کە هەموو ساتێ هەڵگری توخمی نوێگەری و دەوڵەت بێت، دیارە بۆ حاڵەتەکانی دارمانی دەوڵەت کۆمەڵگا جارێکی تر دەوڵەت لەسەرشانی خۆی بینا دەکاتەوە واتە ئەگەر دەوڵەتیش پوکایەوە ئەوا کۆمەڵگا هەیە دەتوانێ جارێکی تر لە منداڵدانی خۆیدا دروستی بکاتەوە، ئەمەش شتێکی سروشتی و ئاساییە کە ئەو سەروەریە بگوازرێتەوە بۆ دەوڵەت ئەو سەروەریە لە کۆمەڵەوە بگوازرێتەوە بۆ دەوڵەت مادامەکی خۆی هەڵگری

توخمەکەی بێت و ئاسایی‌یە مل کەچ کردن بۆی، ئەمەش بۆ لەدەست نەدانی رەگەزی مرۆڤ و کۆمەڵگا، لە هەمان کاتیشدا کە دەوڵەت لەو کۆمەڵە داکەوتووە (ناتوانێ کۆمەڵ قوت بدات) گۆڤاری مەدەنیەت هەمان ژمارەی پێشو لاپەڕە (٧٣)، چونکە ئامانجی دەوڵەت پاراستنی ئەو منداڵدانەیە واتە ئۆرگانیزمی کۆمەڵگا، چونکە کۆمەڵ لەنێو ئەو دەسەڵاتە مەدەنیەتەدا رۆڵی خۆی دەبینێ بۆ گەڕخستنی ئالیەتەکەی و کۆمەڵگاش رێگای جوڵەو گەشەی خۆی دەگرێتەبەر، لێرەدا پێویست بوون بە دەوڵەت پێویست دەبێت، دەوڵەتیش بەپێی یاساو کۆڕانکاریەکانی کۆمەڵ دەسەڵاتی خۆی جێبەجێ دەکات واتە زۆرجار کە رەستەیەو زۆرجار ئامراز، تا کۆمەڵی مەدەنی کامڵ بێت و لەسەر پێی خۆی راوەستێ، کۆمەڵی مەدەنی تا گەشەتر بێت ئەوا کارەکان زیاتر رێك دەخرێن و کۆمەڵ کەمتر پێویستی بە دەوڵەت دەبێت واتە خۆی ژیانی خۆی دەبات بەڕێوە لە هەمان کاتیشدا مەرجەعیەتیش دەدات بە دەوڵەت.

**دەوڵەت:**

دەوڵەت بەپێی پرۆسەو هاوکاری کردنی تاکەکانی کۆمەڵ پێك دێت و خۆیان کۆدەکەنەوە لەژێر ئەو سیستەمەداو ئەرکی دەوڵەتیش داکۆکی کردن لەمافەکانی هەر تاکێك لەو کۆمەڵە، دەوڵەت زۆر جار لەوەش زیاتر دەڕوات خۆی هەڵدەستێ بۆ بەگەڕخستنی ئالیەتی کۆمەڵ و خۆی،

لەکۆمەڵگای دواکەوتوودا دەوڵەت باوکسالاریە تا ئەو کۆمەڵە خۆیان هوشیار دەکەنەوەو ئەگەنە ئەوەی لەدەوڵەتو کاروبارەکان بگەنو دواجار بەشداری دەوڵەت بکەن لە ئەرکەکاندا، لێرەدا دەوڵەت ئامانج دەبێتو ئامرازیش دەبێت بۆ هوشیارکردنەری هاولاتیان.

ویلهێلم ڤۆن هومبۆکت چەندین جار دووبارەی دەکاتەوە کە ئامانجی دەوڵەت لەیەك وشەدا بریتیە لە (ئاسایش) یان (دەستەبەرکردنی ئازادیە سیاسیەکان)، خەڵکان ناتوانن لەنێو خۆیاندا خۆیان رێك بخەن بەو شێوەی کە هەموو دەیەوێ سەرەڕای ئەوەش ناتوانن خۆیان بەڕێوە بەرن، بەلام دەوڵەت دەتوانێ ئەو خەڵکانە رێك بخاتو بەپێی یاسا بیانبات بەڕێوە (هەر بۆیە حکومەتی یاسا لەحکومەتی مرۆڤ باشترە، هەروەك ئەو وتەیەش کە دەڵێ (یاسا پادشا دادەنێ)، بەقسەی لۆك دەوڵەت بریتیە لە جەستەیەکی نوێ بەکۆمەڵێك مافەوە کە لەسەروی مافی ئەو کەسانەن کە پێکهێنەری دەوڵەتن)، (گۆڤاری مەدەنیەت هەمان ژمارەی پێشوو ل٧٣).

**کۆمەڵگای کوردەواری**

کۆمەڵگای کورد، کۆمەڵگایەکی داخراوەو بەپێی سیستەمی خێڵەکی دەڕوات بەڕێوە، ئەو سیستەمە وای لەتاکی کورد کردووە کە بوون بەمرۆڤو بوون بەکۆمەڵ نەبینێ بەخۆیەوە، تاکە کوردیش تاکێکی

ووشك‌و توندە لەژێر باری سیستەمی خێڵەکیدا گۆشەگیرو لول پێچ بووە، واتە یەکەیەکی بکەر نیە لەکۆمەڵێکدا بەڵکو بەکارێکە لە کۆمەڵێکی داخراودا، بەمەش تاکی کورد پرۆسەی پێشکەوتنی ئاوەزوو هوشیاری نەبینیوەو هەر لەنێو بازنەی خێڵدا خۆی بینیوەتەوە، سیستەمی خێڵیش خۆی لەخۆیدا سیستەمێکی دواکەوتووە هەر بۆیە دەتوانین بڵێین کۆمەڵگای کورد بەگشتی بەکۆمەڵگایەکی دواکەوتووی سەرەتایی بدەینە قەڵەم، تاکی کورد نەیتوانیوە بەشداری لەکۆمەڵدا بکات لەهەمان کاتدا هەڵگری توخمی دەوڵەت نەبووە، بەهۆی پابەند بوونی تاکی کورد بەسیستەمی خێڵایەتیەوە واتە پرۆسەی بوون بە دەوڵەتی خۆی لەو سیتسەمەدا دۆزیوەتەوە، واتە لەوێدا بەدی هێناوە نەک لە دەوڵەتدا، سیستەمی خێڵ سیستەمی شەرەف و نەسەب و پاڵەوانێتی و دەمارگیری خێڵی بووە، لەسەر بنەمای خوێن نەبووە، هەربۆیە تاکی کورد بەدەر لەو ئۆرگانە بە تاکێکی نامۆ سەیرکراوەو دابڕاوە لەو ئۆرگانەش کە بەشێك بووە تیایدا، واتە بە نامۆبوونی لە خێڵ و لە هەمان کاتدا لەو ئۆرگانەش بێبەری کراوە، بە (گۆران) سەیرکراوە لەلایەن خێڵەکانی ترەوە، ئەمە نەك هەر تاك دەگرێتەوە بەڵکو (هەموو)ش دەگرێتەوە، کە هەموو لە هەمواندا کۆ نەبوونەتەوەو بە کۆمەڵایەتی بوونی خۆیان پێك نەهێناوە واتە هەموو هەر بە سەرەتایی ماونەتەوە، تاکی کورد نەیتوانیوە لە کۆمەڵگادا جێگیر بێت و ببێتە کۆمەڵگا، دیارە فشارەکانی دەرەوەی

تاکی کورد (فشاری خێڵ) زۆر بەهێز بووەو جەستەو ئاوەزی تاکی داگیرکردووەو وای لێکردووە ببێتە تاکێکی لاواز و بێدەسەڵات و تەمبەڵ. کە ئەمەش پرۆسەی بوون بە مرۆڤ دەکوژێ. بۆیە ئێستاش سەیردەکەین تاکی کورد خۆی بە بچووکی دێتە بەرچاو واتە خۆی بە بچووک دەزانی، ئەمەش بەهۆی کامڵ نەبوونی لایەنی مرۆڤی تاکی کورد خۆیەتی، لە هەمان کاتدا سیستەمی خێڵ نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە پێی بوترێ کۆمەڵگا بەڵکو هەر بە داخراوی ماوەتەوەو لەنێو خۆیدا رەگەزی مرۆڤی یان بوون بە مرۆڤی خۆیانیان رووخاندووە و نەیانپاراستووە، بەڵکو هەر هەرەم پارێزراوە، واتای هەموو خۆیان گەڕاندۆتەوە بۆ تاك و تاکی کوردیش کە هەموو دەگەیەنێ (لێرەدا مەبەست کۆمەڵگای کۆمەڵایەتی نیە) تواونەتەوە لە تاکێکدا ئەمە پێچەوانەی بوون بە کۆڵمەڵگایە خۆی دەبێ تاك لە کۆمەڵدا بتوێتەوە چونکە کۆمەڵ سەرو تاکە هەرەمیش کە دەسەڵاتە سەروو هەموو دەبێ، بەڵام لای تاکی کورد تەنها سەرۆك خێڵە دەسەڵاتە و هەموو شتێکە ئەوانی تر نەمرۆڤن نە هاوڵاتی و نە تاکن بەڵکو یەکەیەکن بەپێی ئارەزوو خواست و ویست سیستەمی خێڵ (سەرۆك خێڵ) بەکاردەهێنرێت، ئەمەش وای کردووە کە هەرکاتێك سەرۆك هۆز نەمێنێ ئەمان نەتوانن سەرۆکێکی تر لە جیاتی ئەو دابنێن بەڵکو کوڕی — نەوەی سەرۆك خێڵ شوێنی گرتۆتەوە، ئەو سیستەمە نوێیە هەر

شێوەیەك بێت دەبێ تاكی كورد قبوڵی بكات، بێدەر لەوە تاكی كورد فێری دراوەتە دەرەوەی ئەو سیستەمە، خێڵەكانی كورد زۆربەیان خێڵی كۆچەرینو جێگیر بوونیان نەدیوە بەخۆیانە، دەتوانین بڵێین سیستەمی خێڵی كورد (كۆچەری – شوانكاری) بووە وەك لەوەی كشتوكاڵی بووبێت، لەبەر ئەوەشە خێڵەكان یەكیان نەگرتووەو نەبوونەتە كۆمەڵگایەك، چونكە گەرمیانو كوێستانیان كردووە، لەبەر ئەو هۆیەشە كە كۆمەڵگای كوردی كۆمەڵگایەكی تەمەڵەو هەوڵی پێشكەوتنی نەداوە بەڵكو ژێرخانو سەرخانی ژیانی لەسەر سروشتی ئامادەكراو بەڕێ كردووە، ئەمەش سیمای ناسینی مرۆڤی كۆنەو میللەتی سەرەتایی‌یە، لێرەشەوە لێك نزیك بوونەوە پێك نەهاتوە چ وەك تاك چ وەك كۆمەڵ چ وەك خێڵ، واتە هەڵگری ئەو توخمە نەبوون كە كۆمەڵ پێك بهێنن، چونكە مەبەستیان نەبووە تەمەڵ بوون بەڵكو مەبەستیان تەنها بژێوی بووە، لەو پرۆسەیەدا تاكی كورد بووەتە تاكێكی بێ خێرو لاواز، ئەمەش وای لێ كردووە وەك بوونەوەرێكی سەرەتایی لێی بڕوانین، كە هەمیشە لەسەر دەرەوەی خۆی بژیو هیچی لەباردا نەبێتو ڕەگەزی خۆی نەپارێزێو هەمیشە بەر لێدان بكەوێ چ لێدانی ناوەوە چ لێدانی دەرەوە، كە هەردووكیان ڕووخاندنی ڕەگەزی مرۆڤی كورد بووە، دەتوانین بڵێن تاكی كورد وەك ڕەگەزیش خۆی، خۆی نەپاراستووە، بۆ مانەوەی خۆی، ئەرستۆ دەڵێ (ئەو كەسەی هیچی لەبار نیە، ببێتە ئەندامی كۆمەڵ،

واهەست بەخۆی دەکات خۆی بۆ خۆی بژێت، پێویستی بەهیچ نەبێت، ئەو ئەو کەسە توخمی پێکهێنەری دەوڵەت نیە، ئەم کەسەش یان دەبێتە بوونەوەرێکی حەیوان یان خودایی)، (گۆڤاری مەدەنیەت هەمان ژمارەی پێشوو لاپەڕە ٨٠)، لەبەر ئەەی تاکی کورد هەڵگری توخمی کۆمەڵ نەبووە، چونکە لەدوای رووخاندنی دەوڵەتی (میـد) دەوڵەتێکی تـری دروست نەکردۆتەوە، هەروەها دوای رمانی کۆماری (مهاباد) کۆمارێکی تری دروست نەکردۆتەوە، هەمیشە بەرەو خوار هاتووەو خـۆی بچوك کردۆتەوەو هەڵکشانی بەخۆوە نەدیوە، کەوابێ سووڕی ژیانی دەوڵـەتی نەدیوە لەکۆرپەیی‌یەوە بۆ گەنج‌و لەوێشەوە بۆ پیری دوایش لەپیری‌یەوە جارێکی تر بۆ منداڵی واتە دروست کردنەوەی دەوڵـەت. لەبەر ئـەوەی کۆمەڵگا خۆی لەخۆیدا دەوڵەتە کاتێك دەبێتە کۆمەڵایـەتی، هـەر بۆیـە زۆرجار بە گوێی کـورددا دراوە کـە نـاتوانن خۆیـان بەڕێوەبـەرن، یـان شایستەی ئەوەبن ببن بە دەوڵەت، ئەمەش زۆر ڕاستە، چونکە هۆکار لە ناوەوەیە بە زۆری نـەك لـە دەرەوە، دیـارە دەرەوەش کاریگـەری خـۆی هەیـە، هـەرکاتێك بوونـەوەر بـووە مـرۆڤ و هـاولاتی و کۆمـەڵگا ئـەوجا شایستەی دەوڵەت دەبێت و خۆی لە خۆیدا دەبێتە هەڵگری ئەو توخمەی دەوڵـەتی پـێ دروسـت دەکرێـت و کۆمـەڵگای دیـش دان بـە بـوون و دەوڵەتیان دەنێن، واتە شایستە دەبێت، مێژوو شاهیدی ئەوەیە کە کورد زۆر هـەوڵیان داوە بچنـە نێـو کۆمـەڵگاکان و بناسـرێن و دان بـە بوونیـا

بنرێت و مافی خۆی پێ بدرێت، بەلاّم تا کۆتایی سەدەی بیست بە (نەخێر) وەلاّمی دراوەتەوە، ئەمەش ئەو کارەیە کە کورد ناتوانێ خۆی دروست بکات و ببێتە کۆمەڵگایەکی کۆمەلاّیەتی، واتە لاوازی کورد خۆیەتی و بێ خێری خۆیەتی دەنا پەنا بردنە بەر دەرەوە بێ هودەیەو خۆ هیلاك کردنە، کۆمەڵگای کورد تا ئێستا کۆمەڵگایەکی سەرەتایی‌یە نەك لەبەر ئەوەی دەوڵەتی نیە، بەڵکو لەبەرئەوەی نەبووەتە مرۆڤێکی تەواو، چونکە پێشتر دەوڵەتی هەبووە (مید-مهاباد) بیار کلاستەر، دەڵێ (کۆمەڵگە سەرەتایی‌یەکان کۆمەڵگەی بێ دەوڵەتن) (بڕوانە چەمکی دەوڵەت و بزوێنەری مێژوو لە کۆمەڵگای کوردی‌دا- عەتا قەرەداغی سلێمانی ١٩٩٩/ ل١٨)، کورد دەوڵەتی هەبوو بەلاّم لەدەستی داوە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کورد بە هیچ شێوەیەك کۆمەڵگایەکی کۆمەلاّیەتی نەبووەو هەمیشە هەڵگری توخمی دەوڵەت نەبووە، هەربۆیە دەتوانین بڵێین تا ئێستاش سەرەتایی‌یە، بەلاّم هەندێ ئیمارەتی دروست کردووە لە جوگرافیایەکی بچوکدا بۆچی!؟ لەبەرئەوەی خۆی لەو شوێنە بچوکەدا دۆزیوەتەوە کە هەر ئەوەندە دەسەلاّتی بەسەردا شکاوە، ئەم خۆ بە بچوك زانینە کە ئیفرازێکی خێڵەکی‌یە وای‌کردووە دەوڵەت لەدەست بدات و نەتوانن دەوڵەت دروست بکەنەوە دوای رووخاندنی هەردوو دەسەلاّتی سەرەوە، بەهەرحاڵ وایان لێهاتووە بەناوچەیەك رازی ببن، (ئەشلی مونتاگیۆ) دەڵێ (گەلانی سەرەتایی ئەوانەن کە نزیکترین گەلن

لـه مرۆڤـی کۆنـەوە) (بڕوانـە هـەمان سەرچاوەی پێشـوو ل ١٨) دیـارە کۆمەڵگای کوردی هەم سەرەتاییی‌یەو هەم نزیکە لە مرۆڤی کۆنەوە من وای بۆ دەچم کە کۆمەڵی کوردی تا ئێستاش لە سەرەتاییی‌دا دەژی و لە پرۆسەی بوون بە مرۆڤی دوور بۆتەوە، یان دواکەوتووە، ئەگەر کورد کۆمەڵگایەکی سەرەتایی بووە ئەدی چۆن دوو جۆر دەوڵەت هەبوو (مید/ مهاباد)؟ ئەگەر دەوڵەت پێناسەیەك بێت، یان ناسنامەیەك بێت بۆ بوون بە کۆمەڵگا، یان بوون بە مرۆڤ! ئەدی بۆ کورد نەبووە بە مرۆڤ نەبووە بە کۆمەڵگا، کەوابێ لێرەدا حاڵەتێکی یان کرۆکێکی یان بازیەکی ون بوو هەیە لە ناوەڕۆکدا، یان هۆکارێك وایکردبێت ئەو دوو حاڵەتەی سەرەوە رووبدات! دەتوانم لەم خاڵانەی خوارەوە پرۆسەی بە نەبوونی کورد بە مرۆڤ روون بکەمەوە:

١-کۆمەڵگای کورد سووڕی ژیانی خۆی بینیوە لە پێش دروست کردنی دەوڵەتی مید (لە جوڵەی مێژوودا)، بەڵام سووڕی ئەو ژیانەی تەواو نەبووە و دەوڵەتی مید لە پیریدا رووخاوە (نەمردووە) واتە نەمردووەو لە هەناویدا توخمێکی تر هەڵگرێ بۆ درەوست کردنەوەی دەوڵەت، لێرەشەوە کۆمەڵگا تووشی نەزۆکی بووەو توخمی دەوڵەتی نوێی پێ نەبووە، واتە نەخۆشی‌یەکە لە مناڵدانیدایە، هەروەها دەروونی تاکی کوردیش بەهۆی ئەو رووخاندنەوە تووشی رووخاندنی دەروونی

هاتووه، بۆیه نەیتوانیوه تا کۆتایی سەدەی بیستەم دەوڵەت دروست بکاتەوە. "بڕوانه لاپەڕه (١٤) سووڕی ژیانی دەوڵەت"

٢-دەوڵەتی (مید) به پیری روخێنرا واته سووڕی ژیانی پیری نەبردە سەر هەر بۆیه دەتوانین ئەو کۆمەڵگایەی لەو ساتەدا تووشی نەزۆکی توخمی دەوڵەت بوو واته لە دوای شکست هێنانی دەوڵەت، نەتوانرا جارێکی تر دەوڵەت دروست بکرێتەوە ئەمەش ئەوە دەردەخات کە رەحمی کۆمەڵگا تووشی نەخۆشی هاتبوو، ئەو نەخۆشی‌یەی کە نەتوانێ کۆرپەلەی دەوڵەتی تر هەڵگرێ، واتە کەمەری شل بووه، یان رەحمی کۆمەڵگای کورد تووشی داکەوتن/ دابەزین بووه، بۆیه زۆرجار کۆرپەلەی لەبار دەچێ وەك ئیمارەتەکان و کۆماری مهاباد.

ئەوەش وای کردووه که سووڕی ژیانی دروست بوونی دەوڵەت لەدەست بدات،

٣-کۆمەڵگای کورد لە دوای (مید)ەوه پەرش و بڵاو بوو بۆ یەکە یەکەو، دوورکەوتنەوە لە یەکتری لەنێو، کۆمەڵگادا سەری‌هەڵدا، ئەمەش دەروونی کوردی تێك شکاندو تووشی رەشبینی و چەپاندن و گرێ کوێرەی مێژوویی کرد.

٤-هەمدیسان تاکی کورد لە دوای ئەو رووخاندنەوه خەسڵەتی مرۆڤی لێ سەندرایەوەو بووەوه بە کۆمەڵگای پێش دروست بوونی دەوڵەتی )مید)

و بووەوە سەرەتایی و ئەمجار لەژێر سیستەمی کۆمەڵی سەرەتایی خێڵدا مایەوە.

٥-بەهۆی تێنەگەیشتن لە مێژوو، بەسەرچوونی پلەی بوون بە نەتەوە لە مێژوویەکی دیاریکراودا وەك گەلانی تر، خۆی وەك نەتەوە دروست نەکردەوە، واتە خەسڵەتی نەتەوەییشی لەدەست دا.

٦-لێرەوەو لەو بۆچوونانەی سەرەوە مرۆڤی کورد خەسڵەتی مرۆڤی لێ سەندرایەوە لەلایەن کۆمەڵگاکانی ترەوە و چووە خانەی گەلە بێ دەوڵەتەکان کە ناسراون بە گەلی سەرەتایی یان ئەو گەلە سەرەتایییانە کە ناتەواویەکیان هەیەو لە مرووڤی کۆنەوە نزیکن. یان دوانەن لەگەڵ مرۆڤی کۆندا.

کەوابێ دوای ئەو رووداوە دەرونیانەو دوای پرۆسەی مێژوویەکی دوورو درێژ چۆن ببینە هاولاتی/ بۆ ئەوەی ببینە مرۆڤ!؟ چۆن حاڵەتەکانی درەندەیی و گورگ و (نایندەرتاڵ)ی بگۆڕین و ببینە مرۆڤ؟! ئەم پرسیارە دەبی هەموومان لە خۆمانی بکەین تا لە حاڵەتی نامرۆڤی و مرۆڤی کۆن دەرچین و ببینە مرۆڤ.

سوڕی ژیانی ئاسایی دەوڵەت دەوڵەت
مردنی دەوڵەت
کۆمەڵگای توخم هەڵگر
لەدایک بوونی دەوڵەت
پیری
کۆرپەلە
لاو
سوڕی ژیانی نائاسایی دەوڵەتی (مید)
روخاندنی دەوڵەتی (مید)
کۆمەڵگای نەزۆك
لەدایک بوونی دەوڵەت
پیری
کۆرپەلە
لاو

## سەرچاوەكان

١-مرۆڤ لە روانگەی ماركسەوە -ئەريك فرۆم- وەرگێڕانی- هەنگاو چاپی يەكەم ١٩٩٩ (ل٥-ل٧٨).

٢-گیروگازی چەمكی كۆمەڵی مەدەنی- نوسینی د. كەريك ئەبوجەلادە وەرگێڕان بۆ كوردی- ئیسماعیل رەشید كوردە، رەوشت رەشید، نوری بێخاڵی، چاپی يەكەم ساڵی ٢٠٠٠ (ل٣٠)

٣-چەمكی دەوڵەت و بزوێنەری مێژوو لە كۆمەڵگای كوردیدا، عەتا قەرەداخی، سلێمانی ١٩٩٩، ل١٨

٤-ليبراليزم و ديموكراسی- نۆربێر تبۆبیۆ- وەرگێڕانی رێباز مستەفا- سلێمانی ٢٠٠٠ (ل٢٠ و ل ٢٨).

٥-گۆڤاری مەدەنیەت ژمارە (٨) ساڵی ٢٠٠٠ تەمووز- ئاب (ل٧٠-ل٧١-ل٧٣).

٦-الانسان و الارتفاء- جونم لويسز نقله عن الوسيه عدنان جاموس، اصدار دار الجماهير- دمشق ١٩٧٠ (ل١٥).

٧-گۆڤاری ژيار ژمارە (٥) ساڵی دووەم ٢٠٠٠ ل ١ذ٧- ل ١٨

# فاکتەرەکانی دروست نەبوونی کەسێتی نەتەوەیی کورد

لێکۆڵینەوە لە کەسێتی نەتەوەیی پابەندە بە هەندێ دیاردەی پێکهاتەیی یان شێوازێك لە دیاردەی ئەو پێکهاتەیە کە کەسێتی نەتەوەیی دەردەبڕێ و دوایش نەتەوە وەك ئەفرازێکی کەسێتی خۆی دەردەخات و خۆی پێ دەنوێنێ، واتە وەك کەسێتی‌یەکی نەتەوەیی هەڵدەتۆقێ، خەسڵەتەکانی کەسێتی نەتەوەیی پابەندی هەندێ هۆکارە، لەوانە شارستانی، کلتوری، مێژوویی، رۆشنبیری، دەروونی، ئایینی.. هتد، ئەمەش واتای سەربەخۆیی لە کەسێتی‌دا و لە کەسێتی نەتەوەیی‌دا دەردەخات، هەر لەو رێی‌یەشەوە دەتوانێ کەسێتی خۆی بەدەرەوە بناسێنێ و دیاردەی خۆ جیاکردنەوە لە نەتەوەکانی تر دێتە ئاراوە، واتە کەسێتی نەتەوەیی پێکهاتەیەکی تایبەتی خۆی هەیە، کە جیاوازە لە کەسێتی نەتەوەکانی تر، کە هەڵگری باری ژیان و داب و نەریت و باری

شارستانێتی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی پێوە دوبارە، ئەو کەسێتی‌یە بەپێی قۆناغی مێژوو و هەروەها دووری مێژوو کاردەکاتە سەر دەرونیان و تێکەڵاو بە لۆژیک و دەرون دەبێت و بەمەش پێکهاتەیەکی تایبەتی بۆ کەسێتی نەتەوەیی لای تاکی نەتەوە پێکدێت،

وێک چوونی شارستانیەت بە کەسێتی تاك لەنێو هەر کۆمەڵێکی بەشەریەتدا (وێنەیەکی بچوکە) یان خشتەیەکی بچوکە (Microcosm) بۆ هەموو کۆمەڵەکەی خۆی، واتە بۆ ئەو شارستانیەتەی کە ئەو کۆمەڵە یان ئەو سیستەمە پێك دەهێنن، شارستانیەت بە هەموو ناوکەکانیەوە کە هاوبەشن لە پێك هێنانیدا لە رێی پەروەردەو پێگەیشتنی کۆمەڵایەتی دەگوازێتەوە بۆ ئاوەزی تاکەکەس و پانتایی‌یەکی گەورەی قوڵ داگیردەکات لە شانەکانی مێشك بە شێوەیەك کە هەریەك لەو شانانە دەبنە کۆی ئەو شانانە کە سیستەمی شارستانێتی پێك دەهێنن کە خۆی لە ئاوەزدا دیاری دەکات ناوك بەناوك، بەو پێیەش کەسێتی تاکەکەس لەنێو کۆمەڵدا دەبێتە نوێنەری کەسێتی شارستانیەتی، لەسەر ئەو بنەمایەی کە کاری پێکراوە کە بە شێوەیەك ئەو سۆزو دەروونە تێکەڵاو هەموو ئەندامانی کۆمەڵ دەبێت، ئەو کەسێتی‌یە بەو شێوەیە دەچێتە دەرەوەی بازنەی خۆیی و خۆی وەك کەسێتی‌یەکی نەتەوەیی دەناسێنێ بە دەرەوە، وەك کەسێتی ئەڵمانی/ ئینگلیزی/ فەرەنسی/ رووسی.. هتد، کە هەر کەسێتی‌یەك سەربەخۆیی خۆی هەیەو شێوە دیاردەیەکی

کۆمەڵایەتی و دەرونی خۆی هەیە، دەتوانێ خۆی بناسێنێ و خۆی پەخش و والا بکات چ لە ناوەوەو چ لە دەرەوە، قۆناغی منداڵێتی بە گرنگترین قۆناغی گەشەکردنی کەسێتی و دروستکردنی کەسێتی دەژمێردرێ ئەویش لە رێی پەروەردەکردنیەوە لە رێی خێزان و کۆمەڵەوە ئەوجا دەوڵەت کە دەتوانرێ لە رێی ئەو سێ پێکهێنەرەوە کەسێتی دەرخواردی منداڵ بدەن، ئاواش بەو شێوەیەو بە ئەزمونی گەورە کە تیایدا تێپەڕیوەو لە خۆیەوە ئەو کەسێتی‌یە دەگوازێتەوە بۆ منداڵ ئەمەش وادەکات کە یەك مەیل و یەك سیفەتی هاوبەشیان هەبێت.
کە سیفەتی بەردەوامی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا دیاری دەکات لە قۆناغەکانی پەروەردەکردن، گەشەی منداڵ بە شێوەیەکی رێك و پێك بایەخێکی زۆری هەیە لەنێو کۆمەڵداو لەوێشەوە بۆ هەڵگرتنی سیفەت و پەروەردەو دواجار کەسێتی ئەو کۆمەڵگایەی کە تیایدا پەروەردە دەکرێت، ئەمە بە یەکەم تێڕوانین سەیر ناکرێت بۆ تێگەیشتن لە کەسێتی لەبەرئەوەی بوار کراوەیە بۆ گریمانەی سەپاندنەکان و جیبەجێکردن و راجیاوازەکان لەسەر تاك و کەسێتی تاك و شارستانیەت ئەمەش لە چوارچێوەی هۆکارو پەیوەندیەکان کە مەیلی تاك دیاری دەکات بۆ دووبارە بوونەوەی ئەو پەیوەندیانەو لەوێشە راسەوخۆ لکاندنەوەی بە کەسێتی نەتەوەیی، ئەو لێکۆڵینەوانەو ئەو شێوازانە دەربارەی کەسێتی نەتەوەیی لە ئەزموونی منداڵیدا یان لە قۆناغی منداڵیدا سیمای سەرەکی

کەسێتی کەسی پێگەیشتوو دیار دەخات واتە یەکێتی شارستانی کە شێوازەکانی پەروەردەکردن دەهێننە کایەوەو لەوێشەوە شێوازێکی نەتەوەیی هاوبەش کە پەیوەستە بە سیمای کەسێتی کۆمەڵ. ستێرکی "هدف" شارستانێتی کۆمەڵگا وا ناسراوە کە کەسێتی بەرجەستە بکات لەسەر ئەندامەکان بە شێوەیەکی ئاسایی هەروەها بەهەکان سۆزیش لەخۆوە بچەسپێ بەسەریاندا واتە بەسەر تاکەکاندا، لەگەڵ بەردەوامی ژیان و رۆژگار ئەم بەهایانە وردە وردە گەشە دەکەن و بەسەر منداڵەکاندا خۆیان دەسەپێنن لەگەڵ کۆتایی هاتن بە قۆناغی منداڵی وادەکات کەسێتییان داگیربکات بە شێوەیەکی نەستی، دەتوانین بڵێین کامڵ بوونی کەسێتی تاکەکەس لەنێو کۆمەڵدا ئاوەژووی کامڵ بوونی شارستانیەتی ئەو کۆمەڵگایەیە کە تاکەکەس تیایدا نەش و نما دەکات، هەروەها نارێکی دەروون و ئاوەز لەنێو خەڵکان پێوەری نارێکی و ناکاملی سیستەمی شارستانی دیاری دەکات، هەروەها گۆرانکاری سێکسی و تەمەن و مێژووی کۆچ کردن و چینایەتی کۆمەڵ وز فێربوون و دووچاربوون بە نەخۆشی‌یە جیاوازەکان هەروەها کێشەی ئابووری و دەروون و دەوروبەر ئەمانەش سەربەخۆ نین و هۆکارن لە شارستانیەت و کاری خۆیان دەکەن لە ناوکی شارستانیەت و پەیوەندیان پێوەی هەیە بەهەر شێوەیەك لە شێوەکان. لە لێکۆڵینەوە بۆ کەسێتی نەتەوەیی بۆ نیشان کردنی جۆری رۆشنبیری لەنێوەندی پێکهاتەی دەروونی نێو

تاکەکاندا راڤـەی رۆشـنبیری و دەرونـی و سـایکۆلۆژی گشـتالت Gestolt Psyhology تێکەڵاو دەبێ. بۆ پێگەیشتنی منداڵ و زانستی دەرونی فرۆیدی لەنێو چوارچێوەی پرۆگرامێکی دەروونی رۆشنبیری نوێدا ئەمەش زیاتر گەیشتنە بە بەرجەسـتەکردنی رۆشـنبیری کۆمـەڵ لـە تـاکدا کـە تیـایدا دەژین. ئەنترۆپۆلۆجیەکان لەنێو کۆمەڵگا ئاڵۆزەکاندا توانیان لێکۆڵینەوە دەربارەی کەسێتی نەتەوەیی (Nation) بکـەن، بـەڵام ئەم لێکۆڵینەوانە هـەر بـە دەسـت نووسـی مانەوە، مامۆسـتا (وسـتمن لابـار) توانـی لێکۆڵینـەوە لەسەر کەسێتی یابانی و کەسێتی چینـی بکـات، (لابـار) دەڵـێ (کەسـێتی یابـانی دووچاری چەند پێکهاتەیـەکی کـەم و کـورِی ئـاڵۆز بـووە) بـەڵام لێکۆڵینەوەکەی (بندکت) دەربارەی کەسێتی یابانی ئەو جۆرە پێکهاتەیە رەت دەکاتــەوەو دەڵــی (متمانەیــەکی بــەرز هەیــە بــە خــۆ لــەنێو یابانیەکانکدا)، هەروەها لەسەر کەسێتی چینی چەند لێکۆڵینەوەیەکی جیاواز هەیە، (دوبوا) لێکۆڵینەوەیەکی کـرد لەسـەر ئەندامانی کەسـێتی تاکەکەس لـە شارسـتانیەتی دوورگـەی (ئـەلۆر–Alor) ئـەو لێکۆڵینـەوەی ئەوەی دەرخست کە هەموو یەك سیفەتی جۆرە کەسێتییان هەیە، واتـە جۆرە کەسێتییەکەی بنەڕەتی هاوبەش، ئـەو جـۆرە لێکۆڵینەوانـە لـەو بۆچوونـەوە دەردەکـەوێ کـە ئـەزموونی منداڵێتـی روخسـاری کەسـێتی مرۆڤی کـامڵ دەردەخـات، هـەروەها یـەکێتی شارسـتانی واتـە نمونـەی شێوازەکانی پەروەردەکردن کە رۆڵی خۆی لە دروست کردنی شێوەیەکی

نەتـەوەیی هاوبـەش دروسـت دەکـات کـە هــەموو دانیشـتوانی کۆمــەڵ هـەڵگری ئـەو جۆرە کەسێتی‌یە دەبن، سـەرەڕای ئــەو بنـەما ژێرخانیانـە زمانیش (اللغە) رۆڵێکـی گرنـگ دەبینـێ لـەو پێکهاتەیـەدا کە سیفەتێکی تــری شارســتانێتی و رۆشـنبیری و لەهــەمان کــاتدا دەرونــی دەدات بــە کەســێتی تاکەکــەس، چونکــە زمــان هۆیەکــە بــۆ گواســتنەوەی راو گواستنەوەی بیرو لێك تێگەیشتن لەنێو تاکەکانی کۆمەڵدا، زمان لەگەڵ پێشــکەوتنی کۆمــەڵ و تــەکنیك و تەکنـەلۆژیا دەگــۆڕی و پێشــکەوتن بەخۆوە دەبینـێ، زمان گـەورەترین ئـامرازی دەربڕینـە لـە لۆژیکـی ئـەو کەسێتی‌یە کە دواجار وای لێ دێ زمان کەسێتی‌یەکی تر دەبەخشـێ بە کەسێتی، کەسێتی تاك/ کەسێتی کۆمــەڵ/ کەسـێتی دەوڵـەت/ ئەمــەش واتــای زمــان لــە چوارچێــوەی دەوڵــەت دەردەچــێ و رەهــەندێکی نێونەتـەوەیی وەردەگـرێ و پێناسـەی دەکـرێ بـە ئاراســتەی کەسـێتی نەتـەوە، وەك زمـانی ئینگلیزی کە بە زمـانی (دیبلۆماسـی) نێودەبـرێ و زمانی رووسی بە زمانی (هێز) و زمانی (فەرەنسی) بە زمانی (رۆمانسی) و زمانی فارسی بە زمـانی (شیعر) نێودەبرێ، واتـە زمـانیش جۆرێك لـە کەســێتی نەتــەوەیی وەردەگــرێ، کــە ئەمــەش دەرهاویشــتەی ئــەو کەســێتی‌یەیە کــە زمــان دەری دەبــڕێ، ئــەویش لــە رێی لۆژیــك و دەروونـەوە، دەتوانین بڵێین زمـان گوزارشـە لـە کەسێتی نەتـەوەیی کـە بەهۆیـەوە دەتوانــێ لــەخۆی بـدوێ و بەرامبەرەکـەی تــێ بگەیــەنێت و

بەرامبەرەکەشی دەزانێ کە ئەو زمانە چ کەسێتی‌یەکی لە پشتەوەیەو لەوێشەوە "پێکهاتەی زمانی Strucureo Language" پێ دەبەخشێ، کەسێتی نەتەوەیی بەهۆی زمانەکەیەوە دەتوانێ لەخۆی بدوێ، لە دەرون و لۆژیکی خۆی بدوێ، دیارە گەشەی شارستانی ڕۆڵێکی تایبەتی گەورە دەبینێ لە پێگەیاندنی ئەو جۆرە کەسێتی‌یە، کامڵ بوونی شارستانیەت کامڵ بوونی کەسێتی‌یەو کەسێتی گوزارش لە شارستانیەت دەکات، وەنەبێ شارستانیەتەکان بێ‌دەربن لە نەخۆشی، لە تێڕوانینی ئەنترۆبۆلۆژیەوە شارستانیەکان دووچاری نەخۆشی دەبن (ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ) بە تایبەتی نەخۆشیە دەروونیەکان وەك (نەخۆشی نوستن) (Sleeping Sickness) کە ئەو نەخۆشی‌یە لەناوچەکانی خوارووی ئەفریقیا بڵاوەو ئەویش لە ڕێگای مێش و مەگەزی (تسی تسی Tse. Tse) نەخۆشەکە تووشی نارێکی عەقڵی دەبێت کە لەگەڵ شیزوفرینا جیاناکرێتەوە، زۆربەی ئەو نەخۆشیانە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی پێداویستی‌یە پزیشکی‌یە پێشکەوتووەکان (تەکنەلۆژیا) ئەم نەخۆشی‌یە وەك نەخۆشیەکانی ناڕاستەوخۆ سەیردەکرێ لەو ناوچەیەدا، ئیتالیەکان دووچاری نەخۆشی (شیزوفرینیا) بوون واتە بە ئاژاوەچی و شەڕانگێز دەناسرێن، بەڵام ئەیرلەندیەکان کە تووشی هەمان نەخۆشی بوون سیفەتی (هێمنی‌و کشانەوە)ن هەندێ لەو نەخۆشیانە لەگەڵ شارستانیەتی نەتەوەکان لەدایك دەبن وەك نەخۆشی (ئەمۆك AMOCK) و

(لاتا Lath) له باكوری رۆژهه‌لاتی ئاسیا، هه‌روه‌ها نه‌خۆشی (بیبلۆكتۆ Piblokto) لای ئه‌سكیمۆكان و نه‌خۆشی (هستریا) له‌نێو خێڵه‌كانی سیبیریادا هه‌یه، ئه‌م نه‌خۆشی‌یه به‌وه دیارده‌كه‌وێ كه ئه‌و كه‌سه تووشی هه‌ڵچوونێكی سۆزدارانه ده‌بێت له‌كاتی پچڕپچڕدا كه ئه‌مه‌ش به زۆری له‌نێو ئافره‌ته‌كانیاندا ده‌رده‌كه‌وێ. ئه‌م نه‌خۆشی‌یه‌ش له‌وه‌وه سه‌رچاوه وه‌رده‌گرێ كه نه‌خۆشه‌كه له دووچاری مردنی مێرده‌كه‌ی یان یه‌كێك له خزمه‌كانی ئه‌و نه‌خۆشی‌یه ده‌گرێ، دیاره پێشكه‌وتنی باری ئابووری و به‌تایبه‌تی ته‌كنه‌لۆژی و تیۆره‌كانی ده‌روونی و چاره‌سه‌ری هه‌ندێ له‌و نه‌خۆشیانه‌یان كردووه، ئێستاش لای شارستانیه‌ته دواكه‌وتووه‌كان، یان ئه‌و خێڵانه‌ی كه له ناوچه‌یه‌كی گۆشه‌گیر ده‌ژین ئه‌و نه‌خۆشیانه‌یان تێداماوه، سروشتی كه‌سێتی گۆڕانكاری ده‌كرێ واته نه‌وه‌یه‌ك تا نه‌وه‌یه‌كی دی ئه‌ویش له‌سه‌ر بنه‌مای مێژوویی به‌و شێوه‌یه‌ی كه هه‌ر ئه‌ندامێك به‌شێكه له‌و نه‌وه‌یه‌ی كه پێی ده‌ڵێن نه‌وه‌و له قۆناغی خۆیدا، واته له منداڵیه‌وه تا پیری، كه‌سێتی رۆشتنێكی هێواشانه‌یه به‌ڕێڕه‌وی كات ده‌گۆڕێ. له‌به‌رئه‌وه‌ی كه‌سێتی كۆمه‌ڵێك به شێوه‌یه‌كی هێواشانه پابه‌نده به گۆڕانی خۆ له‌نێو خۆدا، ئه‌مه‌ش ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ئه‌و شێوازانه‌ی كه كه‌سه‌كان پێی هه‌ڵده‌ستن له په‌روه‌رده‌كردنی منداڵ و كه‌سێتی خۆیاندا، هه‌روه‌ها هه‌موو شارستانیه‌تێك گۆڕانكاری تێدا رووده‌دات ئه‌ویش له‌ژێر كاریگه‌ری رووداوه به‌هێزه‌كاندا كه

شارستانیەت پێیدا تێپەڕوە وەك پەلامارەكانی دەرەوە، یان بومەلەرزە، یـــان نەخۆشـــیـەكی كوشـــندە، ئەمـــەش وا دەكـــات كـــە لـــە رووی مێژوویی‌یەوە شارستانیەت شێوە سیستەمێك پێك بهێنێ لەسەر بنەما مێژوویی كە هەر نەوەیەك سەر بە مێژووی خۆی بێت، زۆرجار ئەو شێوە گۆڕانە لە شارستانیەتدا دەڕوخێ كاتێ رووبەڕووی كەسێتی نەتەوەیی دەبێتەوە، ئەو رووداوانەی كە روو دەدەن لە نەوەیەكەوە بۆ نەوەیەكی تر یـان ئـەو رووداوانـەی لـە شارسـتانیەتدا روودەدات هـەموو لـە رێگـەی گەشەی كۆمەلایەتیەوە روودەدەن. گۆڕانكاریێ ئابووری و تەكنەلۆژیەكان كـە هۆكـارێكی پاڵنـەری عـەقلانین، یـان جـەختی بـارودۆخی دەوروبـەرە گۆڕانكراوەكە كە وا دەكات كە گۆڕان دروست ببێت و كاریگـەری خـۆی دەكات بە تایبەتی لەسەر ئەزمون و قۆنـاغی دوای منداڵی، هـەندێ جـار شارسـتانیەتی كۆمـەڵ جیـاوازە لـە پێكهاتـەیانداو خێرایـە لـە گۆڕانـدا ئەمـەش هەمە كەسێتی پەیدا دەكات، بەلام لە شارستانیەتی هێواشـدا (هێواش گۆڕاندا) و شارستانیەتی تێكەلاو ئەو كەسێتی‌یە یەك چەشن بەخۆوە دەبینێ، واتە كەسێتی خێرا ئەو كەسێتی‌یەیە كە تووشی پەرت بـــوون دەبـــێ بـــە هـــۆی گۆڕانـــی خـــێراو هەمەچەشـــنە لەبەرئـــەوەی كەسێتی‌یەكان خۆیان سازنادەن لەگەڵ دەوروبـەرداو ماوەیـان نیە لەگـەڵ شارستانیەتدا خۆبگونجێنن هـەر بۆیە تووشـی پـەرت بوونـی دەروونـی دەبـــن و تووشـــی دەمارگـــیری و ســـۆزداری دەبـــن دیـــارە نـــەبوونی

شارستانیەت دەبێتە نەبوونی کەسێتی کەسەکان یان کەسێتی نەتەوەیی، چونکە کەسێتی‌یەکان خۆیان لە دەرەوەی بازنەی شارستانیەتدا دەبیننەوە، دوورن لە گەشە شارستانی و کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی‌یەکان، بوونی شارستانیەت بوونی نەتەوەیی دەردەخات و لەهەمان کاتدا سیفەتە کۆمەڵایەتیەکان هەڵدەگرێ، واتە پێك هێنانی شارستانیەتێکی کۆمەڵایەتیەکان هەڵدەگرێ، واتە پێك هێنانی شارستانیەتێکی تەواو کە جیاوازی تێدا نەبێت، بەلام شارستانیەتێك جیاوازی لە ئەندامەکانیدا هەبوو ئەوا کەسێتی ئەو ئەندامانە قاڵبی پاڵ پێوەنەرانەو نائارامی و هەڵچونی سۆزی پێوە دیار دەبێ یان لەخۆ دەگرێ، (بندکت) خێڵی (کواکیوتڵ kWAKIUTL) بە نمونە دەهێنینەوە بۆ ئەو جیاوازیانە کە لەنێوانیاندا هەیە. بە کەسێتی بوون کارێکی گرانەو لە خۆشەوە پەیدا دەبێ، کە دەڵێین گرانە واتە بە پێی قۆناغەکانی مێژوو هەروەها ئەزموونی پەروەردەکردن بەلام کە دەکەوێتە نێو کۆمەڵێکی هوشیارو عەقلانی کارەکە ئاسان دەبێت و لەخۆوە کەس کەسێتی نەتەوەیی /شارستانی/ کۆمەڵایەتی وەردەگرێ کە دەبێتە پێناسە بۆ کەسێتی شارستانی /کەسێتی نەتەوەیی/ کەسێتی کەس/.

**کەسێتی نەتەوەیی کورد**

بەهۆی لەدەستدانی شارستانیەتی (مید) و تێکەڵاوبوونی شارستانیەتەکانی تر لەنێو کورددا بە تایبەتی شارستانیەتی ئیسلام و کلتوری ئیسلام کورد شارستانیەت و کەسێتی /نەتەوەیی/ کلتوری/ دینی/ خۆی لەدەست دا، ئەمە وای کرد کە بە درێژایی مێژوو کورد بی بیناکردنەوەی کەسێتی نەتەوەیی هەمیشە لە جەنگ و شەڕو شۆڕدا بێت و هەروەها بەهۆی زەبروزەنگی نەتەوەکانی تر کەسێتی خۆشی لەبیر بچێتەوەو نامۆ بێ لێی، سەرەڕای ئەوەش بڵاوبوونەوەی هەندی ئاینزای تر وای کرد زیاتر مەسەلەی کەسێتی نەتەوەیی لای کورد ئاڵۆز بێت و زۆر جار ململانێیەکی خوێناوی و توند بەخۆوە ببینێ، ئەم حاڵەتانەش وای لە دەروونی تاکی کورد کردووە کە هەمیشە بە بێدەسەلاتی بمێنێتەوە بەرامبەر دەرەوەی خۆیی و سۆزی بۆ کۆمەڵی خۆی نەبێت بەڵکو تەنها لەژێر کاریگەرێتی شارستانیەتی داگیرکەردا بژی لەژێر سۆزی کلتورو بەتایبەتی کلتوری دیندا بژی دواجار وای کردووە کە کورد لە کەسێتی دینیشی نامۆ بێت و لە کەسێتی نەتەوەیش بێبەری بێ، هەر بۆیە کەسێتی لای کورد پابەندی قۆناغەکانی سەردەمی خۆی نەبووەو جێگیری بەخۆوە نەدیوە، بەڵکو زۆر بە توندی پابەندبووە بەو کلتورەی کە داگیرکەران سەپاندویانە بە سەریاندا، لەژێر ئەو کاریگەرانەدا کەسێتی کورد کەسێتی‌یەکی گێل و خێڵەکی ماوەتەوەو

ئەو جۆرە کەسێتی‌یە وای کردووە زیاتر بەسەر کەسێتی نەتەوەیی‌دا زاڵ بێت و لەو چوارچێوەیەدا هەمیشە تووشی گرژی و ئاڵۆزی بێت، واتە پابەند نەبووە بە گۆڕانی شارستانیەت و بنیات نانەوەی شارستانیەتی (دوای روخاندنی شارستانیەتی خۆی) کە کەسێتی خۆی تێدا بدۆزێتەوە، بۆیە شۆڕشی درێژخایەن لای کورد چ شۆڕشی کلتوری بێت یان رۆشنبیری یان رامیاری شۆڕشێکی خوێناوی درێژخایەنی بەخۆیەوە دیوە، جۆرێکی تراژدیی لەخۆگرتووە، پابەند نەبووە بە قۆناغەکانی گۆڕان و پاراستنی، زیاتر کلتورو شارستانیەتی غەیرە کورد وای کرد کە زیاتر خۆی بە دەستی خۆی کەسێتی خۆی تێك بدات و زیاتر پەرتەوازە بێت، ئەمەش وای کرد کە کورد وەك کەسێتی‌یەکی نەتەوەیی نەناسرێ و سەرهەڵنەدات و زۆرجار لەنێو هەندێ نەتەوەی تردا هەر نەناسرێ، لەبەرئەوەی ناسنامەی کەسێتی نەتەوەیی پێ نیەو خۆشی خۆی ون کردووە لە بۆتەی کەسێتی نەتەوەکانی تردا بەتایبەت نەتەوەکانی سەردەستدا، زۆرجار نەتەوەکان لەژێر کاریگەری کلتورێك یان شارستانیەتێکی تر کەسێتی خۆیان دروست کردووەو خۆیانیان پێ پاراستووە، عەتا قەرەداخی دەڵێ (دەوڵەتی فارس و کلتوری فارسی لە ئەنجامی پرۆسەی فەتحدا دووچاری شکست بوو، بەڵام لە دەوروبەری سەدەی دووەمی کۆچیدا بەخۆیان کەوتن و توانیان شیعەگەریتی بکەنە هۆکاری زیندووکردنەوەی کەسێتی نەتەوەیی/ خۆیان)، پابەندبوونی

کورد بەو کلتورە نامۆیە بە زەرەری خۆی و قازانجی خاوەن کلتور بووە واتە کراوەتە داش، نەتەوەکانی خاوەن کلتوری نامۆ توانیویانە لە ڕێی هەڵگری کلتوری نامۆوە سیستەم/ دەوڵەت/ نەتەوە/ دروست بکەن دواجاریش خۆیان لەو کلتورە نامۆیە جودا کردۆتەوەو لە دەروونندا گەڕاونەتەوە سەر کلتوری خۆیان، کە لێرەشەوە توانیویەتی کەسێتی خۆ/ کەسێتی نەتەوەیی دروست بکات کە گەلانی ترو شارستانیەتی تر پێی ئاشنابن، وەك کەسێتی‌یەکی نەتەوەیی و خاوەن ئاینزاو ئاینێك سەیریان بکەن و ئاماژەیان بۆ بکەن. دراوسێکانی کورد یان ئەو نەتەوانەی لە جوگرافیای کوردستاندا و تێکەڵاویان لەگەڵ کورددا دروست کردووە ئیتر بە هەر هۆیەك بوبێت/ داگیرکردن/ قڕکردن/ کۆچ پێکردن/ بەرژەوەندی تایبەت، وای کردووە کە گەلی کورد زمانی دیالۆگ و پێکەوە ژیان و ناسنامەی کلتوری لەدەست بدات داوای جودابوونەوە بکات و بچێتە حاڵەتی بەرگری کردن و شەڕەوە، چونکە سەرەڕای ئەوەی ئەو نەتەوانە لە ڕێی کوشت و کوشتارەوە ناوچەکەیان داگیرکردووەو بە زۆریش کلتوری خۆیان سەپاندووە بەسەر ناوچەکەداو ڕۆژانە کورد کۆمەڵ کوژ دەکەن، هەر بۆیە زمانی دیالۆگ و پێکەوە گونجان لای کورد خۆی لەدەست داو بە ناچاری زمانی شەڕو بەرگری کردنی هێنایە ئاراوە کە لێرەدا مافی خۆی بووە، ئەم شەڕو پێکدادانە بواری نەداوە بە کورد کە شارستانیەتی/ کەسێتی خۆی/ دروست بکاتەوەو داگیرکەریش

نەیهێشتووە ئەو بووارە بڕەخسێ، بۆ ئەوەی کورد بیر لە سەربەخۆیی/ کەسێتی/ کەسێتی نەتەوەیی/ کلتور/ بکاتەوە، ئەمەش واتە ئەو سیاسەتە بەڕێ چووە، واتە دوژمن زیرەکانە توانیویانە ناوچەکە داگیربکەن و کلتوریشی لێ داگیربکەن ئەمەش خۆ بەدەستەوەدان و نائاگایی کورد دەردەخات بەرامبەر چارەنوسی، ئەو تێك شکاندنە دەرونیە لای کورد وای کرد کە نەبێتە خاوەنی کەسێتی سەربەخۆی خۆی، کە کەسێتی نەتەوەیشی لەگەڵدایە، ئەمەش بێجگە لەو شکستە تووشی چەند نەخۆشییەکی تری کردووە چ راستەوخۆ چ ناڕاستەوخۆ وەك نەخۆشی تەمبەڵی، ئەویش بەهۆی جوگرافیای وشکیەوە کە نەتوانراوە پاڵنەرێکی سروشتی بێت بۆ کارکردنی مەسەلە کشتوکاڵی و ئابووریەکاندا، هەربۆیە کەسێتی کورد کەسێتییەکی تەمبەڵەو هەوڵ نادات گۆڕانکاری لەو جوگرافیا وشکەدا بکات، سەرەڕای ئەوە ئەو جوگرافیایە لەمپەرێك بووە بۆ زیاتر پەرت و تێك شکاندنی کۆمەڵی کوردی، کەچی عەرەبەکان لە نیمچە دوورگەیەکی بیابانی وشکدا توانیان یەك بگرن و پێکەوە بژین و ئازاترین جەنگاوەریان لێ دەربچێ و هەموو خێڵەکان یەك بگرن و دەوڵەت و دەسەلاتیش دروست بکەن و سنووری خۆشیان بەزاندوو دەرەوەی خۆشیان داگیرکرد، نەگەیشتن بە چارەسەری کەسێتی نەتەوەیی وایکرد لەنێو دەروونی هەر تاکێکی کورددا بیر لە تایبەتمەندیەك بکرێتەوە کە وەك نەخۆشی هەڵتۆقین، وەك

/گێلی/ تەمبەڵی/ خۆ بەزل زان/ تامەزرۆی دەسەڵات/ دەبەنگی/ درەنگ تێگەیشتن/ تورەیی، کە مێژوو هەندێ لەو حاڵەتانەمان لەسەر زاری ئەندامانی تیرە یان سەرۆك تیرەو دەرەبەگ و کەسایەتیەکان بۆمان دەگێڕنەوە، نمونەش بۆ ئەوە، (هەستی کوردایەتی لەنێو بابانەکانیشدا زۆر بە گوڕو تین بوو (ریچ) لە زمان یەکێکیانەوە دەیگێڕێتەوە: (بێتو دووبەرەکی و ناکۆکیی بنەماڵەیی لەنێوان سەرۆکەکانمان هەڵگیرێ، نە تورك، نە ئێران، ناتوانن بەسەرماندا زاڵ بن، تورکەکان هەمیشە بە فێل و تەڵەکە توانیویانە بەسەرماندا زاڵبن، لە راستیدا ئێمەی کورد درەنگی تێدەگەین)

ئەوەی سەرەوە نمونەیەکە بۆ درەنگ تێگەیشتن، بگرە دەیەها نمونەی تری وا هەیە لەنێو لاپەڕەکانی مێژووی گەلی کورددا، دیارە ئەو نەخۆشیانە راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ کاریگەریان کردۆتە سەر شارستانیەت و کەسێتی کورد، وای لێکردووە کە کەسێتییەکی تایبەتی نەبێت چ لە رووی کەسێتی تاکەکەسەوە چ لە رووی کەسێتی نەتەوەییەوە، دەتوانین ئەو فاکتەرانە دەست نیشان بکەن کە بوونەتە هۆی دروست نەبوونی کەسێتی نەتەوەیی کورد.

١-فاکتەری شارستانیەت

٢-فاکتەری ئایینی

٣-فاکتەری نەتەوەیی

٤-فاكتەری سۆزی نیشتمانی

٥-فاكتەری دەروونی

٦-فاكتەری تاكی كورد

٧-فاكتەری سەركردە

٨-فاكتەری دەرەوە

٩-فاكتەری پەروەردەكردن

**١-فاكتەری شارستانیەت**

دیارە كورد خاوەنی گەورەترین شارستانیەت بووە لە مێژوودا ئەویش شارستانیەتی (میدیا)، سەرەڕای ئەوەش خاوەنی كلتورو ئایینی خۆی بووە، بەڵام بەهۆی شكست هێنانی دەوڵەتی میدیا لەلایەن ئەخمینییەكان و دواجار لەلایەن لەشكری ئیسلامەوە بۆ سەر دەوڵەتی ساسانی (چونكە كوردستان بەشێك بووە لە دەوڵەتی ساسانی)، كورد ئەو شارستانیەتەی لەدەست داو وردە وردە كلتورەكەشی تێك شكاو لە بۆتەی نەتەوەكانی تردا
(فارس- تورك- عەرەب) تووایەوە، تاوای لێهات لە شارستانیەتی خۆی نامۆ بێت، ئەم نامۆبونەش كاری كردە سەر دەروونی كوردو وای لێكرد هەمیشە هەوڵ بدات بۆ ئەوەی لەدەستی چووە، بەڵام دیارە كلتوری داگیركەر زیاتر خۆی سەپاندووە بەسەر ئاوەزی كورداو كوردیش

باوەشی بۆ ئەو کلتورە کردۆتەوەو پێی رازی بووە، بۆیە نەیتوانیوە ئەو شارستانیەتەی لەدەستی داوە جارێکی تر بیژێنێتەوەو رۆحی بکاتەوە بەبەردا، ئەم کارەش زیاتر رێی بە نەتەوەکانی تر داوە کە بە ئارەزووی خۆیان کلتوری کورد بکەنە موڵکی خۆیان و درزەکانی شارستانیەتی خۆیانی پێ پڕ بکەنەوەو کەسێتی خۆیانی پێ دروست بکەن و دواجار ببنە خاوەن شارستانیەت و کورد بێبەری بێ لە شارستانیەتی خۆی، ئەم پرۆسەیە بە درێژایی مێژوو چووەتە سەر تا ئەمڕۆو گەشتۆتە ئەوەی داگیرکەر ببنە خاوەن مێژوو/ کلتور/ شارستانیەتی تایبەت، بەڵام کورد بێ شارستانیەت لە قەڵەم بدەن و بێ کلتوری بهێڵنەوە بۆ ئەوەی لەبەردەمی شارستانیەتی (تورک-فارس- عەرەب) رانەوەستێ کەواتە پرۆژەی روخاندنی شارستانیەتی کورد پرۆژەیەك بووە کە نەتەوەکانی تر پلانیان بۆ داڕشتووە، لەوانەش هۆی ئەمە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زانیویانە گەلی کورد نەتەوەیەکی ئازاو بە جەرگە ئەمەش بووەتە جێی مەترسی بۆ سێ کلتور بۆیە بە یەکگرتنی ئەو شارستانیەتە کارێکی بەرژەوەندی بووە بۆ بنیات نانی کلتوری خۆیان و داڕمانی شارستانیەتی کورد، ئەم پرۆژەیە کاریگەری کردۆتە سەر دەروونی تاکی کورد و وای لێ کردووە کە بە زەحمەت بتوانێ هەڵبسێتەوەو نەتوانێ، یان لە باریدا نەبێ شارستانیەتی خۆی بنیات بنێتەوە.

## ٢-فاکتەری ئایینی

لە دوای ئەفسانەو سیحر ئایین گەورەترین هۆکار بووە بۆ دروست کردنی شارستانیەتی و بەرگری کردن لێی، زۆربەی شارستانیەتەکان لە کۆنکرێتی ئایین بنیات نراون و بوژاونەتەوە، بگەرە پێگەکانی ئایین رەوکاری شارستانیەتی پێوە دیار بووەو ئاینەکان چ ئاسمانی چ زەوی باسیان لە شارستانیەت کردووە، بەتایبەتی روکنی ئەفسانەو سیحرو رووداوەکان، دەتوانین بڵێین بێ دەقێکی ئایینی شارستانیەت هیچی نەگەیاندووەو بێ شارستانیەت ئایین خۆی لەدەست دەدات، زۆربەی شەڕو شۆڕەکان لە مێژووی بەشەریەتدا روویان داوە لە پێناو بەرگری کردن بووە لە شارستانیەت و ئایین، ئایین ئەو هێزە بووە بووەتە هۆی راگری بیناکانی شارستانیەت ئەویش بەهۆی زاڵ بوونی بەسەر رۆحی تاکە کەسەکانداو لەوێشەوە پاراستنی شارستانیەت و ئاینیش، کەواتە دەتوانین بڵێین ئایین بەشێکە لە شارستانیەت کە کەسەکان، نەتەوەکان، پارێگاریان لێکردووە، هەم وەك نەتەوە هەم وەك تاکەکەش کە لەوێوە خەسڵەتێکی تایبەتی پێ بەخشیوە و وەك کلتورێك و رۆحێك روانیویەتە ئایین، لەژێر هێزی ئاییندا و رۆحی ئاییندا نەتەوەکان توانیویانە خۆیان بپارێزن و خۆیان لە شەڕی دەرەوە بپارێزن لە هەمان کاتدا توانیویانە دیالۆگی شارستانیەتانەی پێبکەن و تایبەتمەندیەکی خۆی هەبێت، لەنێو دەروونی تاکەکاندا ئەم هەست کردن بە ئایین بوونە، هەست

کردنێکی رۆحی بووەو لەوێوە تاکی ئیماندار هەڵگری دین دەتوانێ گوزارش لە خۆیی و ئایین و شارستانیەت و کلتورو تەنانەت نەتەوەی خۆی بکات، هەر نەتەوە خاوەن ئایینی خۆی بووەو پابەندی هێزە رۆحیەکەی بووە، کە کردویەتیە سەرمەشقی خۆیی و نەتەوەکەی، کلتورەکەی، شارستانیەتەکەی، مێژووەکەی، لەهەمان کاتدا ئەو چەمکانەشی پاراستووە لە رێگای ئایینیەوە، پەڕاوەکان ئاماژە بە نەتەوایەتی بوونی خۆیان و نەتەوایەتی بوونی پەڕاوەکانیان دەکەن، کەواتە ئایین توانیویەتی لەژێر کاریگەری هێزی خۆیدا نەتەوە/ خێڵ/ خێزان/ خربکاتەوەو لەژێر رەشماڵی رۆحدا گرێیان بداتەوەو لە پەرتەوازەیی و تێك شکان و پەرت پەرت بوون رزگاریان بکات، دواجار کەسێتی‌یەکی دینی و نەتەوەیی یان پێ ببەخشێ، بگرە زیاتر زۆر جار ئایین سنووری نەتەوەیی و جوگرافیایی و دەروونی بڕیوەو کاریگەری کردۆتە سەرنەتەوەکانی ترو ئەو نەتەوە تازانەی هەڵگری بیروباوەڕو ئاینزاو ئاینێکی تر بوون و ببنە دەروێشی ئاینی تازەو ئەو رۆحە نوێیە بکەنە سەرمەشقی خۆیان. دیارە کوردستان پێش ئیسلام شوێنی چەند ئایین و پەرستنێکی جۆراو جۆر بووە وەکو زەردەشتی/ مەسیحیەت/ جوولەکەیی.. هتد، واتە پێش ئیسلام کوردستان دۆخێکی فرە ئایینی هەبووە (Polycon Fess ionalis) واتە ئاینێکی پوخت و زاڵ نەبووە کە کورد هەڵگری بوبێ، ئەو ئاینانەی سەرەوە یەك کاریگەری کردۆتە سەر ئەوی

تـرو توخمەکانیان تێکەڵاو بەیەکتری بووە، کوردەکان بەزۆری هـەڵگری ئـاینی زەردەشـتی بـوون، ئـەوجا بوونـە هـەڵگری ئـاینی ئیسـلام، زەردەشتیەت دەبوایە ببوایە بە تاکە ئاینی باو و دەسەڵاتداری میدیا، بـەڵام زەردەشـتیەت نـەبووە بنـەمای دەوڵـەتی میدیـاو نـەبووە دینـی دەوڵەت، لەبەرئەوەی فەمرانڕەوایانی میدیا دواتریش هی تەخمینی هەوا خوای زەردەشتی نەبوون و جارجار ئەم ئاینە تووشی تەنگوچەڵەمـەو هێرش‌و هەڕەشە دەهات‌و ئایینە کۆنەکانیش پێش بڕکێی زەردەشـتیان دەکردو هەروەها ئاینی زەردەشتی لەناو خەڵکی نیشتەجێ و شارستانی و پیشە کشتوکاڵی‌دا بڵاوبووەوەو دۆگماکانیشی بـەجۆرێکی سـەرکی ڕەچـاوی بـەرژەوەندیی کۆمەڵگایـەکی لـەم بابەتـەی دەکـرد بۆیـەش میللـەتانی تـری ئێران ئەڕانەی چیایی و شـوانکارو پیشـە مـەڕو مـاڵات بەخێوکەر بوون، لەوە دەچێ کوردیش یەکێك لەمانە بووبێ بایەخێکیان بەم ئایینە تازەیە نەداو لەسەر ژیانی جارانی خۆیان بەردەوام بوون و بۆ خواوەندەکانی خۆیـان کـە هـێزو دیـاردە سروشـتیەکان بـوون، هـەر بـە دڵسۆزی مانەوە، زەردەشتی پەیامبەر ئەمانەی ناونا (دە ئیڤە یەسنا) بە مانای دێوپەرست بەرای هـەندێ لێکۆڵینەوەی کـورد (دە ئیڤـە یەسـنا) ئێستاش لەناو بەشێکی کورددا ماوەتەوە، بەڵام بە تـۆزێ گۆڕانکاریـەوە ئەویش نـاوی (داسنی)یە کـە نـاوێکی کۆنـی ئێزیدیەکانـە، ئـەخمینی، مینای مادەکان لە کاتێکدا دانیان بە ئاینی زەردەشتی نـا کـەچی هـەر

نەیانکردە ئاینی رەسمی دەوڵـەت، ئەوسـاکە دەوڵـەت بـۆ چەسـپاندنی
دەسـەڵات و مل کەچ کردنـی دانیشـتوانەکەی پـەنای تەنـها بردۆتـە بـەر
هێزی جەنگی و لایەنی رۆحـی بایـەخی پێنـەدراوە، کـاتێك شـاپووری
دووەم (۳۰۹-۳۷۹) زەردەشـتی رامیـاری هۆشمەندانەشـی لەگەڵدا بـوو،
دەوڵـەت ئـاینی زەردەشـتی ناچـار کـرد گۆڕانکارییـەك لـەناو دۆگمـاو
پرەنسیپەکانیدا ئەنجام بدات بەوە کە ئایین و پەرسـتنە کۆنـەکانی تـر
بگرێتە خۆ، ئیتر دینی زەردەشتی بووە دینێکی لاوازو بەپێی رۆژگارو
بـارو دۆخ گۆڕانـی بەسـەردا هـات تـاوای لێهـات زیـاتر بـە مەزیەسـنا
(مـەزدایزم) دەناسـرا (مـەزددایزم) دوای ئـەم دەسـتوبردە ئـاینی و
رامیاریەیە لەناو میللەتە جیاوازەکانی ئێرانداو بە تایەتیش لەناو کورددا
بڵاوبووەو جێ پێی خۆی گرت. سەرکردەی فارس (کۆرش) کە نازناوی
(کەیخوسرەو) کوڕی کەیکاوس بوو (۵۵۸-۵۳۰) دوای ئەوەی توانی کە
میرنشینێکی بچکۆلە دابمـەزرێنێت توانـی فارسـەکان یـەك بخـات و بـۆ
هێرش کردنـە سـەر میدیەکان و پایتەختەکـەیان (ئـەکباتان) و دەوڵـەتی
میدیـای شـکاندو پاشاکەیانی (ئەسـتیاغ)یـان بـەدیل گـرت و بەدەسـت
بەسەری کێشیان کرد بۆ فارس، و فارسەکان لـە جێگای دەوڵەتی مید
دەوڵەتی ئەخمانیشنییان دروست کرد، ئاینی زەردەشتی لەکاتی خۆیدا
ناوچەیـەکی جوگرافـی فراوانـی گرتـەوەو بـووە ئـاییی رەسمـی لـە
سەردەمی ساسانیەکانداو هەتا غەزو داگیرکەری ئیسلامی بەردەوام بوو

بەتایبەتی (مەلیك ئەردەشێری پاپكانی یەكەم (ئەرتەخشەر- ٢٢٦-٢٤١ی ز) خۆی بەمیراتگری ئەخیمنیەكان و ئالأهەڵگری شكۆی رەسەنی فارسان دادەنا بە تایبەتی سەروەری و شانازیەكانی مەلیك داریوش هەروا داوای گەرانەوەی سنووری دەوڵەتی ئەخمینی دەكردو پاشان فەرمانیدا كە ئاتەشكەرەكان لە سەرانسەری ئیمپراتۆریادا ئاوەدان و كتێبە پیرۆزەكەی وەك (زەند، ئاڤێستا) و هی دیكەش بەشێوەیەكی رێك و پێك و بە تەواوی كۆبكرێتەوەو بیروباوەڕەكانی ئاینی زەردەشتی نوێ بكەنەوەو بۆ یەكەمین جار لە مێژووی گەلانی ئێراندا زەردەشتیەت كرا بە ئاینی رەسمی دەوڵەت، بەهۆی هاتنی لەشكری ئیسلامەوە بۆ ناوچەی ئێران، دینی زەردەشتی بە جارێ هەرەسی پێهات و كلتورەكەی رۆژ بە رۆژ لەنێو شارستانیەتەكانی تردا توانەوە دەتوانین هۆی رووخاندانی ئاینی زەردەشتی بۆ ئەم خالأنەی خوارەوە نیشان بكەین:

أ-كوردستانی كۆن ناوچەیەكی نیگافراوانی ئاینی بوو (التسامح الدینی). ئەمەش رێ خۆشكەربوو بۆ دینەكانی تر بۆ چوونە نێو رۆحی دینی زەردەشتیەت و ناوەڕۆكەكەی لاواز بكەن.

ب-ئاینی زەردە شتیەت لە ریزی ئاینەكانی ئاسمانی دانەنراوە لەلایەن ئاینەكانی ترەوەو پەیامبەر زەردەشت ناوی نەهاتووە لەپەڕاوەكاندا.

ج-ئاینی زەردەشتی ئاینێکی کراوە بووە لەڕووی پێکهاتەو ناوەڕۆکەوە و زەردەشتیش کەسایەتیەکە کراوە بووەو بڕوای وابووە کە هەموو کەس وەکو خۆی لێبێت.

د-ئاینەکە سەر بە چینێکی ئورستوکراتیانە بووەو چینی خوارەوە بێبەش بووە لە یاساکانی، هەر بۆیە ئەو چینە واتە چینی خوارەوە خۆیان بە ئاینە کۆنەکانی ترەوە بەستۆتەوەو جیانەبوونەتەوە لێی.

هـ-تاوی لێ هاتووە ئاینی زەردەشتیەت گۆڕانی بەسەردا هاتووەو لە کۆنەستی کورددا جێی خۆی نەگرتەوەو لەگەل ڕۆحی تاکی کورددا تێکەڵاو نەبووەن هەر بۆیە دینی ئیسلام ئەو بۆشایی‌یەی ڕۆحی تاکی کوردی پەی پێ بردووەو داگیری کردووە، بەمەش ئیسلام دیوارێکی کۆنکرێتی دروست کرد لەنێوان ڕۆحی کوردو ئاینی زەردەشتیەتدا تا وای لێهات کورد نامۆ بێ بەرامبەر دینەکەی.

دیارە بە گەیشتنی ئیسلام لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خەلیفە عومەری کورشی خەتاب بۆ کوردستان دینی ئیسلام جێگای زەردەشتیەتی گرتەوەو بووە پەیامێکی ڕۆحی بۆ کورد، ئەم پرۆسەی بە ئیسلام بوونە مێژوویەکی درێژی بەخۆوە بینی دواجار ئیسلام هەرەمی ڕۆحی زەردەشتیەتی تێك دا لەژێر ناوی (ئاگرپەرست و شەیتنا پەرست) و لە جیاتی ئەوە هەرەمی دینی ئیسلامی سەپاند بەسەر کوردەکاندا، بە تێك شکاندنی ئاینی زەردەشت بۆشایی‌یەکی گەورەی ڕۆحی دروست بوو

لای مرۆڤی کورد ئەم هەستەش پێویستی بە پڕکردنەوەی دەروونی و ڕۆحی بووە بۆیە کوردەکان ئاینی ئیسلامیان گرتە خۆو لە پرۆژەیەکی مێژوویەکی دوورو درێژداو تا ئەمڕۆ کوردەکان ئاینی ئیسلامیان تێکەڵ بە ڕۆحیان کردووەو، بەراستیش لە مێژوودا کورد هەزاران قوربانی بۆ داوەو هەزاران غەزویان کردووە لە پێناو فراوان بوونی جوگرافیای بیری ئیسلامداو هیچ نامۆیی‌یەك نابینیٚ لە نێوان ڕۆحی و دینی ئیسلامدا، و وەك ئەوەی ئەو ئاینە تایبەت بۆ کورد بووە وا بووە، یان کورد خۆیان بەو قەومەزانیبیٚ کە خودا ئاینەکە لە )عەرەبی مونافیق) بسەنێتەوەو بیدات بە قەومێکی تر (کورد)، بەڵام کورد پەی بەو نامۆیی‌یە نەبردووە کە بووەتە هۆی نامۆیی ئاینی لە کەسێتی ئاینیداو لەهەمان کاتدا لە کەسێتی نەتەوەیی‌دا، واتە لە هەردوو کە سێتی کەوتووە چ ئاینی و چ نەتەوەیی، بەڵام ڕوودا‌وەکانی مێژوو زەبور زەنگی نەتەوەی (تورك- عەرەب- فارس) وای لە کورد کردووە کە جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ کۆنەستی خۆیی و بە شوێن ئاینەکەیدا بگەڕێتەوە بە تایبەتی لە پرۆسەی بە نەتەوە بوون و کەسێتی نەتەوەیی‌دا بۆی دەگەڕیٚ، لەبەرئەوەی چەند قوربانی داوە ئەوەندە مافەکانی وەك مرۆڤ، پێشێل کراوەو هەمیشە غەدری لیٚ کراوە، بەناوی دینیشەوە، ئەمانە وایان کرد کە کەسێتی دینی و کەسێتنی نەتەوەیی لای کورد دروست نەبێت و کەوردیش وای لیٚهات هەست بە لاوازی دەروونی بکات و نەتوانیٚ

دینەکەی خۆی بژێنێتەوەو نەشیتوانیوە لەژێر کاریگەری دینەکانی تردا خۆی بپارێزێت یان پارێزراو بێت،
بەهۆی پێکەوە ژیانی نەتەوەکان لە کوردستاندا ئەوە بەرچاو دەکەوێت کە ئەم نەتەوانە جێگای دروست بوونی هەندێ ئاینی ترو رێبازی تربن، واتە دۆخێکی هاوبەشی ئاینی لە کوردستان هەبووە ئەمەش پرۆسەی بوون بە نەوەی و بە ئاینی دواخستوەو تێکیشی داوە، (د. عبدالرحمن قاسملو) دەڵێ (هاوبەشی ئاینی یەکێك لەو هۆیانە بووە کە پێگەیشتنی نەتـەوەی کـوردی وەدواخسـتوە چونکـە ئیسـلام وەك ئـاینی هاوبەشـی موسـوڵمان کراوەتـە پەردەیەك بـۆ داپۆشـینی زوڵـم و زۆری نەتەوایـەتی خەلیفەکانی بەغداو پاشان سوڵتانەکانی عوسمانی کە ئەوانیش نەخشی خەلیفـەیان دیـاری کـردووە)، هـەروەها جگـە لـەو توخمـە هاوبەشـانەی زەردەشتی و ئاینە کوردیەکانی تر وەکو ئیزیدی/ ئەهلی حەق/ عەلەوی/ کاکـەیی/ واتـە جێگای ئەوانەشـی تیا بووەتـەوە هـەروەها بڵاوبوونـەوەی ئاینی مەسیحیەت و جولەکە کە پەیرەوکـەرانی هـەبوو لـە کوردسـتاندا ئەمانە بە رۆح بوونی زەردەشتیەتی کوشت لە کۆنەستی کورددا، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە کورد خاوەن دینێکی پوخـی و دیـاری کـراو نـەبووەو بـەڵام دوای روخـانی دەوڵـەتی مـاد شکسـتی زەردەشـتیەت نغـرۆی دینەکانی تر بووە ئیتر بەهەر رێگایەك بووبێ. زۆر جار ئەو ئاینانـەی کە کورد هـەڵی گرتـووە ئاینێکی رێك نەبووەو رێکخراوێکی ئاینی بـەهێزو

ڕێك و پێك نەبووەو نەیانتوانیوە سەرکردایەتی هەموو لق و گروپەکانی تر بکەن بە تایبەتی (ئەهلی هەق)، سەرەڕای ئەو لاوازیەش کوردەکان دژی ئاینی ئیسلام ڕاوەستان لەکاتی داگیرکاریدا و بەرهەڵستیان کردووە لەگەڵ شوێندا موسڵمانەکان ناچار پەیمانیان لەگەڵدا بەستوون، ئاینەکانی وەك ئیسلام یەهودیەت هەموو سەنگ و قورساییەك دەخەنە سەر بە هێزکردنی هوشیاری ئاینی و هوشیاری نەتەوەیش بۆ غەیرە (عەرەب و جولەکە) تا بکرێ لاوازو کز دەکات، ئەمەش بووە کە هوشیاری نەتەوەیی لای کورد لاواز بێت سەرەڕای هوشیاری ئاینشیان، کورد هەمیشە لەژێر کاریگەری دینی تردا بۆ نەتەوەیەکی تر قوربانی داوەو خۆشی لەبیر کردووە کە دواڕۆژ چۆن دەبێ و چی لێ بەسەردێ لێرەوە پرۆسەی نامۆبوون و خۆ بزرکردن لە دیندا دەستی پێکردووە، هەستی دین لای کورد زۆر بەهێز بووە بەتایبەتی دینەکانی داگیرکەر ئەم هەستە رۆحیەتێکی تایبەتی لای تاکی کورد دروست کردووەو زۆر بە توندی وەری گرتووە، زۆرجار ئەو هەستە دینیە بووەتە هۆی روخاندنی ئیمارەتێك یان خێڵێك یان ئاینزایەکی تر، بگرە زۆرجار ئەو هەستە شەڕی خوێناوی خۆکوژی دروست کردووە، زۆرجار شێوە ئاینێکی تر لای کورد دروست بووە وەك ئاینی تێکەڵە (سنکریتیك) کە لە توخمی جۆراو جۆری ئاینەکانی تری کۆن و نوێ پێکهاتووە، وەك (ئیزیدی) کە پسپۆڕو نوسەران ئاماژەی پێدەکەن و بە ئاینێکی تێکەڵە سەیری

دەکەن، زۆربەی ئاینەکانی تری کورد لەژێر کاریگەری ئیسلامدا تووشی شێوان و تێك شکاندن هاتوون، بەڵام ئیسلام نەیتوانیوە ئیزیدی لەناوبەرێ، بارو دۆخێکی وا لە کوردستان هەبووە کە ببێتە هۆی پەیدابوونی عەقیدە ئاینیە سینکریتیەکان و کەسێتی دینی کورد پەرت پەرت ببێت لەو رێگایانەوە. هەروەها چالاکی و دەوری دیاری کورد لە بزوتنەوەی ئاینی و سیاسیەکانی رۆژگاری خەلیفایەتیدا بووە هۆی بڵاوبوونەوەی رێبازی تەریقەی جیاواز لە کوردستاندا وەك لە سەرەوە ناومان هێناون، سەرەڕای نیگافراوانی دینی زەردەشتیەت و زەردەشت کە ئەمەش مەترسییەك بووە، ئاینی کوردی نەڕەخساند (ئازاد مستەفا) دەڵێ (بوونی چەند ئاین و مەزهەبێکی جیاجیا پێشکەوتن و سەقام گیری ئەو نەتەوە دوا دەخات و هەتا دەشیخاتە بەر مەترسی پەرت پەرت بوون و لێك ترازان وەکو (هیندستان/ پاسکات،/ بەنگلادیش))، دەتوانین بڵێین دین لای کورد بەتایبەتی دینە کۆنەکان جێگای خۆیان نەکردۆتەوە لە دەروون و رۆحی کۆنەستی کورددا و نەشیانتوانی کارێکی وا بکەن کە کەسێتییەکی ئاینی بۆ خۆیان دروست بکەن بەڵکو هەر بە چەپێندراوی مایەوە، ئەمەش لەدوای روخاندنی میدیاوە دەستی پێکرد کە لەگەڵیدا هەستی نەتەوەیی و هەستی کەسێتی ئاینیشی پێوە رووخاو زەردەشتیش نەیتوانی رۆحی مرۆڤی کورد داگیربکات، بەڵکو دینێکی کراوە بووە کە ئەمەش رێگە خۆشکەر بوو بۆ دینەکانی تر کە

تێکەڵاوی ببن و لەدوایدا هەرەسی پێ بهێنن، بۆیە زەردەشتیەت وەك ئیسلام نەیتوانی لەسەر بنەما هێزە رۆحی و یاسا رۆحی و دینیەکەی شارستانیەتەکەی بپارێزێ، هەر بۆیە کورد لە رێگای هەستی نەتەوەییەوە دەڕوانێتە ئاینی زەردەشتی و لە حاڵەتی نەماندا بۆی دەگەڕێتەوە، کە ئەمەش واتە گەڕانەوە بۆ ئاینی کۆن پرۆسەیەکی دورو درێژی مێژوویی دەروونی هەڵدەگرێ بۆ یادەوەریەکان و کۆنەست و ئاینی رۆحی زەردەشتیەت هەم بۆ دروست کردنەوەی پرۆژەی کەسێتی دینی هەم بۆ دروست کردنەوەی کەسێتی نەتەوەیی کورد.

<u>٣-فاکتەری نەتەوەیی</u>

پرۆسەی بە نەتەوەبوون کارێکی زۆر ئاڵۆزە، نەتەوەکان بۆ هێنانەدی مافی نەتەوەیی و بە نەتەوە بونیان چەندەها پرۆسەی گۆڕانی مێژوویییان بەخۆوە دیوە، هەر نەتەوەو خەسڵەتێکی تایبەتی خۆی هەیە کە بووەتە پێناسەو ناسنامەی نەتەوایەتی، سەرەڕای ماکەکانی نەتەوەبوون وەك خاك/ زمان/ مێژوو، کە ئەوسێ ماکە دەبێتە هۆی دروست بوونی نەتەوەو واشی لێدەکات جیابێت لە نەتەوەکانی تر، نەتەوەکان بەهۆی بوونی رەگەزەکانی ئەفسانەو کلتورو شارستانیەتەوە دەتوانن خۆیان پێناسە بکەن و گوزارش لە کەسێتی نەتەوایەتیان بکەن، نەتەوە بوون کارێکی کۆمەڵایەتی و پرۆسەیەکی دەروونیە لەنێو

تاکـەکانی کۆمـەڵدا بـەهۆی پەیوەندیەکانــەوە /ئـابووری/ هەســتی نەتەوایـەتی/ کۆمەڵایـەتی/ میـژوو/ زمـان/ پێـك دێـت، کـەوابێ (نەتـەوە پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتیە کە تاکەکانی کۆمـەڵ پێکـەوە دەبەسـتێت لـە حاڵەتی گەلێك پابەندی دەوڵەت بێت. یان نەتەوەیەك لە حاڵەتی پابەندی بـۆ کۆمـەڵێك) دەتوانـین نەتەوایـەتی بـە حاڵـەتێکی سـۆز دابنێـین بـۆ نەتەوەیەك یان کۆمەڵێك، بەهۆی رووخاندنی دەوڵەتی (میدیا) و هەروەها هەڵگرتنی ئاینی ئیسلام کورد مەسەلەی نەتەوەیی و کەسێتی نەتەوەیی لە بیرکردوو کەسێتی تری گرتەخۆ کە دوور بوو لە کەسێتی راستەقینەی خـۆی، لـەژێر بـەرگی دین و کاریگـەری دینـدا بەتایبـەتی دینـی ئیسـلام مەسەلەی نەتەوەو نەتەوایەتی لای کورد لاواز بوو، دین وای لە کورد کرد لە جیاتی ئەوەی توندو تۆڵی و رێکی بخات بەڵام لاوازو پەرت و پـەرت و بـڵاوەی پـێکرد، ئەمـەش پرۆسـەی مێژوویـی گـەورەی بـەخۆوە بینـی وایکـرد مـرۆڤ کـورد وەك نەتـەوەو وەك مـرۆڤ تێـك شـکێت کـەوابێ پرۆسەی تواندنەوە لـە دینـدا وای کـردووە پرۆسـەی بوون بـە نەتـەوە لـە یادکرێ و هەمیشە کورد هەوڵ بدات بۆ مەسەلە دینی‌یەکان و مەسـەلەی نەتەوە پشت گوێ بخات، لێرەشەوە هەستی دینی زیاتر زاڵ بووە بەسەر هەستی نەتـەوەو نەتەوایـەتیدا، بـەڵام کـورد دوای ئـەوەی زانـی غـەدری لێکراوەو غەدری لێدەکرێ لەلایەن پەیڕەوکەرانی دینـەوە کە کوردیـان بـۆ مەبەستی سیاسی بەکارهێناوە و هیچ مافێکیان نەدراوەتێ، بەڵام درەنگ

ئەم هەستە واتە ئەم هەست بە نەتەوەبوونە لای کورد سەری‌هەڵدا واتە دوای پرۆسەی نەتەوەکان و بەنەتەوەبوون دەتوانین هەندێ هۆکار دیار بکەین کە بووەتە هۆی ئەوەی کورد نەبێتە نەتەوەو ئەو هەستە لەیاد بکات:

ا-کورد هەوڵی نەداوە ببێتە نەتەوە لە مێژوویەکی دیاری کراودا واتە مێژووی دروست بوونی نەتەوەکان. بەڵکو زیاتر هەوڵ دراوە بۆ دروست بوونی نەتەوەکانی ترو خۆی لەبیرکردووە.

ب-کورد زیاتر هەوڵی بۆ مەسەلە دینی‌یەکان داوە وەك لە مەسەلەی نەتەوە.

ج-هەستی دینی زیاتر بووە وەك لە هەستی نەتەوەیی.

د-تێنەگەیشتن لە قۆناغە گرنگەکانی مێژور و هەلی مێژوویی.

هـ-یەك نەگرتنی کورد لەنێو خۆدا بۆ پێك هێنانی کەسێتی‌یەکی نەتەوەیی.

و-هەڵخەڵەتاندنی کورد لەلایەن نەتەوەکانی دەوروبەرەوە بە هۆی پەیمان و بەڵێنەکانەوە.

س-سڕینەوەی کلتوری کورد لەلایەن نەتەوەکانی ترەوەو هەروەها کوردیش خۆی دەستی تێدا بووە لەو سڕینەوەیەدا ئەویش بەهۆی هەڵگرتنی زمانەکانی ترو پیرۆزکردنی کلتوری بێگانە.

ح-سەرکردایەتیەکی نەتەوەیی دروست نەبووە کە هێمای نەتەوەیی پێوە دیاربێت و سیمای کەسێتی نەتەوەیی کوردی هەڵگرتبێ و توانیبێتی رۆحی کورد داگیربکات و کەسێتی‌یەکی نەتەوەیی پێ ببەخشێ.

ط-کورد داردەستی نەتەوەکانی تر بووەو هەمیشە لە قۆناغەکانی مێژووی زێڕینیدا کاری بۆ خۆی نەکردووەو بێئاگا بووە لەو رووداوانە کە دەبنە هۆی دروست بوونی مەسەلەی نەتەوەیی.

ی-کورد پەرتەوازەیی و دووری لە یەکتر بەخۆوە بینیوە، وەك لەوەی کۆمەڵ بوونێکی کۆمەڵایەتی بەخۆوە ببینێ ئەمەش مەسەلەی نەتەوەیی بوونی زیاتر دواخستووە.

ق-نەتەوەکانی دەوروبەر نکوڵیان لە بوونی نەتەوەی کورد کردووەو سەیری کوردیان وەك نەتەوەو مرۆڤ نەکردووە بەڵکو وەك خێڵ و بنەماڵەو شەڕخواز سەیریان کردووە

ل-کەم دەرکەوتووە سەرکردەیەکی کورد هەوڵ بدات بۆ یەکگرتنی کوردو مەسەلەی نەتەوەی گەلی کورد.

لەو خاڵانەی سەرەوە وا دەردەکەوێ کە کورد خۆی زیاتر کەمتەرخەمی کردووە بەرامبەر بەخۆی بۆیە هەمیشە هەوڵ دراوە کورد پرۆسەی بەتەوەبوونی خۆی بسەلمێنێ و شۆڕشەکان هەمیشە خۆیان لە چوارچێوەی جوداخوازی‌دا بینی‌وەتەوە لە نەتەوەکانی تر، وەك ئەوەی

کوردیش نەتەوەیەکی جیایە لە نەتەوەکانی دەوروبەر کە کورد درەنگ بەوەی زانی ئەمەش واتای گەڕانەوە بووە بۆ پرۆسەی دروست بوونی نەتەوە بەلام لەدوای بەسەرچوونی پرۆسەی دروست بوونی نەتەوەکان کە ئەم کارەش هەمیشە شکست و هەستانەوەی بەخۆوە بینیوەو مێژوویەکی تراژیدی و خوێناوی بەخۆوە دیوە.

## ٤-فاکتەری سۆزی نیشتمانی

سۆزی نیشتمانی بەهێزترین خالی بە کەسێتی بوونە لە پرۆسەی کەسێتی نەتەوەییدا، چونکە بەهۆی سۆزی نیشتمانیەوە سۆزی نەتەوەیی دروست دەبێ لە دەروونی تاکەکەسداو لەوێشەوە پێکهاتەیەکی پوخت لە کەسێتی نەتەوەیی دروست دەبێت، ئەو سۆزە بەری چەندەها سالەی مێژووە کە لەلایەن مرۆڤەکانەوە لە دەروونىدا هەلدەگیرێن و پابەندی نیشتمان و نەتەوە دەبێ و کەسەکان قوربانی بۆ دەدەن. دەتوانین بلێین سۆز فاکتەرێکی دەروونی زۆر گرنگە بۆ مەسەلەکانی وەك ئەفسانە/ دین/ نەتەوە/ کە کەسایەتیەکان لە کۆنەستدا هەلیدەگرن و بە هۆی هەستەوە پیادەی دەکەن و گوزاری لێدەکەن ئەویش لە رێگای سۆزەوە یان بەسەر ئەو هێلە پان و بەرینەی ناوەوەی مرۆڤ تێدەپەڕی و لەوێوە هەست کاری خۆی دەکات و یادە کۆنەکان و مێژووە کۆنەکانی تاکەکەسی وەبیر مرۆڤ دەهێنێتەوە کە ئەمیش

نیشتمانێکی هەیە/ نەتەوەیە/ کەسێکە/ مرۆڤێکە/ مێژووی خۆی هەیە/ کلتوری خۆی هەیە/ لێرەوە هەستی نیشتمانی و سۆزی نیشتمانی دروست دەبێت کە بەمێژوویەکی دوورو درێژی هەزاران ساڵدا تێدەپەڕێ. ئەو سۆزە بەخاك و مێژوو و کلتورەوە گرێ دەدرێ و لە نەتەوەو نیشتماندا خۆیان دەبیننەوە، ئەم پرۆسەیە گەورەترین پرۆسەی پێگەیاندنی کەسێتی نەتەوەیی دەردەخات هەر لە منداڵیەوە تاکو پیری و لەوێوە بۆ نەوەیەکی ترو هەروەها، هەموویان بەهۆی پێکەوەژیان و کاریگەری کردنە سەر یەکتری بەهۆی ئەو پرۆسە مێژوویی‌یانە ئەو هەستە دەمێنێتەوە لە کۆنەستی نەتەوەدا لەکاتی پێویستیدا دەوروژێتەوە بۆ مانەوەی نەتەوەو نیشتمان و ئەو مێژووەی لەسەری بنیات نراوە واتە پاراستنی ئەوەی بووەو هەیەو دەبێ. ئەمەش هێزێکی تری خۆشەویستی دەدات بە مرۆڤ چ بەرامبەر کەسەکانی دی، و چ بەرامبەر دەوروبەر، ئەویش لە رێگای پەروەردەکردنی مرۆڤەوە هەر لە منداڵیەوە پەیدا دەبێ وایان لێ دەکات یەك کەسێتی‌یان پێ ببەخشێ بۆ کەسێتی‌یەکی نەتەوەیی، لە مێژوودا هەزاران قوربانی دراوە لە پێناو نیشتماندا لەلایەن مرۆڤەکانەوە، ئەمەش هۆکاری سۆزی نیشتمانیە، واتە هەستی دەروونی خۆ بە (نەتەوە) زانین بڕبڕەی بوونی نەتەوایەتی دەردەبڕن کورد بە هۆی دابڕانیان لە یەکتریەوە و هەروەها هۆی جوگرافیاکەی ئەو هەست و سۆزە لای دروست نەبووە کە بتوانن لە هەر

دۆخ و مێژوویەکدا گوزارشی لێبکەن، گەڕان بە شوێن بژێوی و کاری شوانکاری و مەڕومالات و کۆچ پێکردن و کۆچەری لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر وای کردووە تاکەکانی کۆمەڵگای کوردی پەیوەست و پابەند نەبێت بە خاکەوەو سۆزی بەرامبەر خاك و نیشتمان نەبێت لەوانەیە هەندێ جار ئەو سۆزە وروژابێت لەبەر شالاوی دەرەوە بۆ کوردستان بەلام ئەو سۆزە زۆری نەخایاندووەو لە زەمەنێکی کەمدا رۆچووەو نەماوە، کورد سۆزی نیشتمانی بەلاوە گرنگ نەبووە، تەنها سۆزی دین و خێڵ و بنەماڵەی بە خاڵی یەکەم و لەسەرو هەموو شتێکەوە دایناوە، خۆی قوربانی دین و خێڵ و بنەماڵە کردووە، واتە ئەم هەستە توندتر بووە وەك لە هەستی سۆزی نیشتمانی، لێرەوە دابڕانێکی دەرونی لە نەستی کورددا بەدی دەکرێ لە نێوان سۆزی نیشتمانی و کەسێتی کورد، واتە نەیزانیوە چۆن نیشتمانی خۆش بوێت، کە رەنگەکانی نەخشەی کوردستان قوڵ نەبۆتەوە بۆ ئەوەی ئەو وێنەی نەخشەیە کاریگەری خۆی بکاتە سەر سۆزو دەروون، زۆرجار دەربڕینی ئەو سۆزە لەژێر دەمامکی ناسیۆنالیزمدا دەری بڕیوە ئەو دەربڕینەش ناچاری بووە، زیاتر توێکڵی شۆڤێنیتی پێوە دیاربووەو وایکردووە زەرەر لە مەسەلە نیشتمانی و نەتەوەیییەکان بدات، واتە ئەو سۆزە نەزانراوە لە رێگای ناسیۆنالیزمانەشەوە دەیبرێ، کە دەبوایە ئەو شۆڤێنێتییە دوای مەسەلە سۆزی نیشتمانیەکە بوایە کە زۆربەی

نەتەوەکان لە ناوەڕۆکدا هەڵیان گرتبوو تا ئەو کاتەی نەتەوەی خۆیان دروست کرد دواجار ئەو شۆڤێنیی‌یەتە بووە دیاردەیەکی کلاسیك و نەما، کورد نەیزانیوە گوزارش لە نەخشەی وڵاتەکەی بکات چ جۆرە وێنەیەکی وەرگرتووە بۆ ئەوەی ئەو قوڵ بونەوەیە لە سۆزدا تێکەڵاو بێت و ببێتە خاڵێکی تری کاریگەر بۆ مەسەلەی سۆزی نیشتمانی، زۆر لە نەتەوەکان لە ڕێگای وێنەو شێوەی پێکهاتەی نەخشەی وڵاتەکەیان گوزارش لە سۆزی نیشتمانیان دەکەن. بۆ نمونە فارسەکان نەخشەی وڵاتەکەیان بەچاوی پشیلە دەشوبهێنن، وڵاتە عەرەبییەکان بە هێمای (هەڵۆ) گوزارش لە نەخشەی وڵاتەکەیان دەکەن، زۆرجار شێوازێکی ڕەگەزو مێژوویانە لەخۆدەگرێ بۆ گوزارش کردن لە نەخشەی وڵات، بەڵام کورد بە شێوەیەکی میکانیکی گوزارش لە نەخشەی وڵاتەکەی دەکات کە گوزارشێکی ترس و تۆقێنەرەو جێگای بێ متمانەیی و تەقینەوەیە ئەویش بە (دەمانچەیەك) گوزارشی لێدەکات، ئەم گوزارشە وا لە تاکی کورد دەکات کە بێ بایەخانە بڕوانێتە نەخشەی وڵاتەکەی و لە هەمان کاتدا سۆزی نیشتمانی لادروست نەکات، یان لای دروست نابێ، ئەم وردەکاریانە وادەکەن کەسێتی نەتەوەیی دروست نەبێت لەبەر ئەوەی سۆزی نیشتمانی لاوازە و گرێ نەدراوە بە نیشتمانەوەو ئەو سۆزە بەهۆی تێك شکانە مێژوویی‌یەکانەوە جێگیر نەبێت و ئەو توێژاڵە سۆزیە دروست نەکات بۆ پاراستنی کەسێتی نەتەوەیی، لەهەمان کاتدا

مەسەلەی کەسێتی نەتەوەیی بەو دیوارە ژێری‌یە نەپارێزێت بەڵکو هەر وا بمێنێتەوە و مەسەلەی لاوازی بەرامبەر نیشتمانی کۆسمۆپۆلەتیك بهێنێتە بەرهەم، کە ئەمەش بۆ مەسەلەی نیشتمان و نەتەوە مەترسیەکی گەورەیەو زۆرجار دەبێتە نەخۆشی‌یەکی کوشندەی ژەهراوی.

## ٥-فاکتەری دەروونی

فاکتەری دەروونی ئەو فاکتەرە گرنگەیە کە دەبێتە فاکتەرێکی کۆنکرێتی بۆ دروست کردنی کەسێتی تاکەکەسی و هەم کەسێتی نەتەوەیی دەتوانرێ بەهۆی سۆزەوە هەستە دەروونیەکانەوە کاری بە کۆمەڵ بوون و دوایش بە نەتەوەبوونی لێ پەیدا دەبێت کە دواجار گوزارش دەکات بۆ کەسێتی نەتەوەیی، کاری دەروونی بە هۆی پەروەردەیی کەسەکان لەژێر کاریگەری کلتورو رۆشنبیری نەتەوەیدا دێتە بەرهەم ئەویش بەهۆی پێکەوە ژیان و لەیەك گەیشتن و لەسەر کایەیەکی بەهێزی فاکتەرە کلتوریەکان دێتە بەرهەم، پێکەوە ژیان و پێکەوە کارکردن لەسەر یەك خاکداو گونجاندن و خەبات کردن ئەو هەستە دەرونیە پەیدا دەکات کە هەموو لە پێناو هەمووداً بن و هەموو لە پێناو نەتەوەداین و یەك هزرو یەك بۆچوون، ئەم کۆدەروونیە دواجار دەبێتە یەك دەروون بۆ کەسێتی نەتەوەیی واتە وەك رۆح، ئەو رۆحەی پابەندە بە بنەما شارستانی‌و کلتوری‌یەکان ئەو رۆحەی تەماهی دەکەن لە نێوان خۆیانداو دواجار

رۆحی گەورە پێك دەهێنن کە گوزارشە لە هەموو، کاری دەروونی بە کۆمەڵی بوونی کۆمەڵگای لێدەکەوێتەوە، ئەم بەکۆمەڵ بوونە بە هێڵەکانی دەروونندا دەخولێننەوەو هەمیشە لە گەڕاندایە بۆ پاراستن و پێکهێنانی کەسێتی دەروونی و وێك چوونی کەسێتی تاکەکەسی کە تیایدا بەرژەوەندی کەسێتی نەتەوەیی دروست دەکات و دەیپارێزێ و بە رۆشنبیری دەکات و شارستانیەتی پێ دەبەخشێ و گەشە بە نەتەوە دەدات و دەروونێکی تایبەتی پێدەبەخشێ نەك هەمە دەروون، دیارە لای کورد کاری دەروونی کاری پێ نەکراوەو هەستی پێنەکراوە ئەم بە رۆژگارێکی دوورو درێژ بووەتە هۆی لاوازی دەروونی کورد بەرامبەر کەسێتی خۆی، کورد بەهۆی دابڕانی لە یەکتری و شپرزەی کۆمەڵگاکەی دەروونی تووشی ئەو نائارامیە بووەو جێگری بەخۆوە نەدیوە، واتە دەروونی کورد لە هەل و مەرجی تایبەتدا نەژیاوە بۆ ئەوەی لە قۆزاخەی پاراستن و گەشەدا بژی و پێبگات، هەروەها بەهۆی شکستە مێژوویی‌یەکانەوە کورد دووچاری نەخۆشی دەروونی و گرێ کوێرەی دەروونی هاتووە، کە ئەمەش پەیوەستە بەو واقعەی کورد تیایدا ژیاوە، لێرەشەوە سەیر نیە گەر دەروونی کورد کاری خۆی نەکردبێ، بەڵکو ئەوە واقیع بووەو تاکی کورد لە دەروونیەوە دوور بووە و ئاشنایەتی پەیدا نەکردووە، واتە دابڕانێکی دەروونی هەبووە لە نێوان تاکی کوردو دەروونیکورددا، ئەم لێك دابڕانە بەهۆی فاکتەری مێژوویی بووە کە

بووەتە نەخۆشیەك و تاكی كوردی هیلاك كردووەو زۆرجار رەشبینی كردووە و هەمیشە بە بێزاری دەبینرێ. دەروونی كورد پاڵەپەستۆی سۆزی كرچ و كاڵی بەسەرەوەیە زیاتر وەك كاری پراكتیكی لۆژیك واتە زیاتر شتەكان لە كۆنەستدا كۆبوونەتەوە و لە هەمان كاتدا چەپێندراون، واتە ئەو هۆكارە وردانە كە زۆر گرنگن وای كردووە كورد لەنێوخۆدا ( (تاك-تاك) و (كۆمەڵ- كۆمەڵ) جیابن و دووربن لە یەكتری‌یەوەو دەروونیان پەرت پەرت بێت و بۆ یەكگرتنی كەسێتی نەتەوەیی خەم خۆر نەبن.

## ٦-فاكتەری تاكی كورد

درووست بوونی كەسێتی نەتەوەیی پابەندبوونە بە یەكە یەكەی كۆمەڵ، واتە كۆبوونەوەی تاكەكان لەنێوان خۆیاندا بۆ پێك هێنانی كەسێتی سەربەخۆ، واتە پەیمانێكی دەروونی و كۆمەڵایەتی و ئابووری كە لەسەر بنچینەی هەموو لە پێناو هەموودا بۆ پێك هێنانی بە كۆمەڵ بوون ئەمیش لە راڕاوەكانی تاكەوە دەست پێ‌دەكات تا دەگاتە لوتكەی كۆمەڵ واتە هەرەم، تاكی كورد تاكێكی نەخۆشە لە رووی دەروونیەوە سەرەڕای لاوازی و پابەند نەبوونی بە نەتەوەوە خۆشی كۆنەكردۆتەوە، نەیتوانیوە خۆی بكاتە كۆمەڵ و لەوێشەوە لەنێو، چوارچێوەی كۆمەڵگادا/ نەتەوەدا/ خۆی بتوێنێتەوە، یان بێتە كۆمەڵ و لە نەتەوەدا خۆی

خڕبکاتەوە، تاکی کورد تاکێکی تەمەڵە بەرامبەر بە خۆیی بەرامبەر نەتەوەکەی ئەمەش وایکردووە دووریەك هەبێت لەنێوان تاکەکاندا، ئەمەش پەرت پەرتی کۆمەڵگای کورد دەردەخات و تاکەکانیش نەیانتوانیوە ئەو کۆمەڵە بپارێزن و خۆشیان واتە تاکەکان رووبەڕووی یەکتری بوونەتەوە خۆیان لەنێوخۆدا یەك ناگرن و دژی یەکترن و هەرکەسە خۆی بە هەرەمێك سەیردەکات، هەر لە خۆی دەڕوانێ و لە نەخۆشی بەرزتر یان بالاتر نابینێ، ئەم تێڕوانینە وای لە تاکی کورد کردووە کە تاکێکی فووداری لێدەرچێت بایەخ و حساب بۆ بەرامبەرەکەی نەکات لێرەوە هەڵوەشاندنەوەی ئەوەی پێی دەگوترێ خێزان/ کۆمەڵ/ کۆمەڵگا/ نەتەوە/ دەسەلات/ کەوتۆتە بەرنامەوە، تاکی کورد خۆی نەدۆزیوەتەوەو لەوەهمی هەرەمدا دەژی، زۆرجار حاڵ گەیشتۆتە ئەوەی کە تاکی کرودو خۆزگە بە کورد نەبوونی یان بە مرۆڤی نەبوونی بخوازێ، ئەمە وەك نەخۆشەیك سەری هەڵدا دوای ئەوەی مێژووی بە مرۆڤ بوون و بەنەتەوە بوون تێپەڕی و بەسەرچوو، دوای ئەو مێژووە تاکی کورد کەوتە وڕێنەو هەردەم لەخۆی دەدوێ، واتە تەنها لە تاکایەتی خۆی دەدوێ و کۆمەڵی لە بیرچۆتەوە ئەم دابڕانە پرۆسەی بوون بە کۆمەڵ دەکەوژێ و لەنێو کورددا کوشتویەتی و تێکی شکاندووە لەنێو خۆدا، تاکی کورد تاکێکی یەکجار ئاڵۆزو لول پێچەو بەسەر خۆیدا شکاوەتەوە لەژێر باری گرانی رووداوەکانی مێژوو، وای لێکردووە

متمانه نەکات بە هیچ و حساب بۆ بەرامبەرەکەی نەکات یان هەستی پێنەکات ئەمەش کارێکی زۆر مەترسیە کە کوشتنی کۆمەڵ و نەتەوەو سۆزی نیشتمانی لێ دەکەوێتەوە، لە کۆمەڵگای کوردیدا خۆشەویستی‌یەك/ پەیمانێك/ سۆزێك/ هاوکاریەك/ نیە لە نێوان تاکەکاندا، ئەوەی هەیە هەموو رق و کینەو تۆڵە سەندنەوەیە ئەمەش بنەمای پێکەوە ژیان و گونجاندن و بوون بە کەسێتی دەڕمێنێ، بایەخ نادرێ بە مرۆڤ و بەهاکانی، ئەوەی بایەخی پێدەدرێ تێك شکاندنەو بەس، دروست کردنەوەو بیناکردنەوە بیری لێنەکراوەتەوە، چ تاکی کورد چ کۆمەڵی کورد بەرهەم هێن نیە، زۆرجار هەندێ بەرژەوەندی تایبەتی کۆیان دەکاتەوە بەڵام کە لە بەرژەوەندی بدرێ ئەوجا کۆمەڵێك لەری دەردەچێ/ پەرتەوازە دەبن/ دژی یەکتر دەبن/ دەبنە داردەستی دوژمن/ و بیر لە دواڕۆژ ناکەنەوەو بایەخی پێنادەن/ شەرەفخانی بەدلیسی دەڵێ (کوردەکان پێیان وایە ئەگەر بیر لە دواڕۆژی خۆیان بکەنەوە ترسەنۆك دەبن بۆیە قەت بیر لە دواڕۆژیان ناکەنەوە)، سەرکردەیەك خێڵێك تەنها خۆی بە شایستە دەزانێ و ئەوانی تر بە کۆیلە، دەستەیەك تەنها خۆیان بەراست دەزانن و ئەوانی تر بە نەزانن و خائن دەدەنە قەڵەم/ ئەمە ئەو پێناسەیە کە کۆمەڵگای کوردی هەڵی گرتووە، واتە هەرکەسە بۆ خۆیی و لە پێناو خۆیدا، کەس کاغەزی کەس ناخوێنێتەوە، (شەرەفخانی بەدلیسی) سەبارەت بە ناکۆکی و ناتەبایی کوردانیش راست و رەوان

ئامانجەکە دەپێکێ و دەنووسێ (هەرکەس بیر لە سەربەرزی خۆی دەکاتەوە؟ بە تێکڕایی بیر لە سەربەرزی تێکڕایی ناکەن و پشتی یەکتری ناگرن و نابنە یەك).

## ٧-فاکتەری سەرکردە

ستراتیژو کەسێتی سەرکردە هەرەمە پێکهێنەرەکانی کەسێتی نەتەوەیی دەردەخەن لە هەموو روویەکەوە، سەرکردە ئەو کەسایەتیەیە کە نەتەوە کەسێتی خۆی تیا بەدی دەکات و گوزارش لە کەسێتی تاکەکانی کۆمەڵ دەکات، واتە چ کۆمەڵ چ تاك خۆیان لە کەسێتی سەرکردەدا دەبیننەوە، سەرکردە نابێتە ئەو کەسایەتیەی کە نەتەوە دەیەوێ تا ئەوکاتە لەگەڵ هەست و رۆحیانەدا تێکەڵ نەبێت و ئامانج و خواستەکانیان نەهێنێتە دی و نەبێتە فریادرەسیان، دەتوانین بڵێین سەرکردە گەورەترین رۆڵ دەبینێ لە کۆمەڵگادا بۆ راگرتنی پایەکانی مەسەلە نەتەوەیی و نیشتمانیەکان، کە لەوێوە دەتوانێ کاریگەری خۆی بکاتە سەر تاکەکانی کۆمەڵ، یان نەتەوەو لەیەك خاڵدا کۆیان بکاتەوە، واتە هەم سەرکردە بێت هەم حاڵەتێکی گوزارش بێت لە دەروونی تاکەکانی کۆمەڵ، لێرەوە سەرکردەی ئازاو بلیمەت و راستەقینە هەڵدەکەوێ کە بتوانێ کۆمەڵ/ نەتەوە/ لە حاڵەتەکانی ون بوون و خلیسکان و لەناوچون رزگار بکات، واتە ئەو سەرکردەیە دەبێتە پارێزەری ماکەکانی نەتەوە بەهەموو

فەرهەنگەكانیەوە، تا دەگاتە ئەوەی وەك ئەفسانە سەیر بكرێ، (الفارابی) دەڵی (سەركردە لە كۆمەڵدا، وەك دڵ وایە بۆ لەش، ئەگەر سەركردە چاك بێت ئەوا كۆمەڵگا هەموو چاكە)، كۆمەڵیش بە هۆی بلیمەتی سەركردەوە زیاتر لە دەوری خڕدەبنەوەو دواجار دەیكەنە سەركردەی نەتەوەیی خۆیان و جڵەوی كەسێتی‌یان دەبەخشنە سەركردە، لەلای نەتەوە ژێردەستەكان و دواكەوتووەكان تا ئێستاش سەركردە گەورەترین ڕۆڵ دەبینێ واتە بە پلەیەك دێت لە گۆڕانكاریە كۆمەڵایەتیەكان، ئەمەش بایەخدانی كۆمەڵە بە تاكە كەس و زیاتر سەیری تاكەكەس دەكرێ وەك كۆمەڵ، كۆمەڵی نەتەوە دواكەوتووەكان ڕۆڵی خۆیان نابینن لە گۆڕانكاریەكاندا بێ‌ئاگایی دێن و دەچن زۆرجار ڕۆڵی خۆیان هەیە بەلام پێ‌نازانن لێرەوە سەركردەی بستەبالا ئەو بێ‌ئاگایی‌یە دەقۆزێتەوەو سەركردایەتی ئەو كۆمەڵە دەگرێتە دەست، هەر بۆیە سەركردە دەبێتە هەموو شتێك لای ئەو كۆمەڵگایە، ئەمەش ناهوشیاری كۆمەڵ دەردەخات بەرامبەر خۆیی بەهاكانی، كەواتە سەركردە لەو حاڵەتەدا ڕۆڵی (شوان دەبینێ بۆ مێگەل)، لێرەدا كۆمەڵگا دەچێتە حاڵەتی ئەوەی بێ سەركردە ژیانی مەحاڵ دەبێ‌و بێ سەركردە هەڵناكات، سەرەڕای حاڵەتی باشی ئەو جۆرە میكانیزمە، حاڵەتی مەترسیشی هەیە بگرە حاڵە مەترسیەكەی لە حاڵەتە باشەكەی ترسناكترە چونكە چەند سەركردەی نەتەوەیی حاڵەتەكانی كۆمەڵ ڕادەگرێ و لە گۆڕانكاریەكاندا (دەستی هەیەو

نایەڵی نەتەوە تیا بچێت، ئەوەندەش مەترسی هەیە واتە ئەو ساتانەی کە سەرکردە تیا دەچێ یان تووشی حاڵەتێکی پەشێوی و دژوار دەبێت، کۆمەڵگا سەری لێ دەشێوێ وەك ئەوەی بڵێی (مەڕی بێ شوان گورگ دەیخوات)، یان ئیتر ژیانی ئەو کۆمەڵە مەحاڵ دەبێت و حاڵەتێکی شکست پێهێنان لەنێو کۆمەڵدا روودەدات زۆرجار ئەو حاڵەتە دەگاتە لەدەست دانی خێڵێك/ نەتەوەیەك/ بنەماڵەیەك/، ئەمەش حاڵەتی شپرزەیی و تێك شکانی کۆمەڵ/ نەتەوە/ دیاردەخات کە لێرەوە دەتوانین بڵێین کەسێتی و هەرەمی نەتەوە ئەو رۆڵەی لەدەستدا ئەوا کۆمەڵگاش ئەو کەسێتی‌یە نەتەوەیی‌یە لەدەست دەدات بەهۆی ئەو تێك شکاندنەوە لە کەسێتی سەرکردەدا روودەدات واتە (گورگ مەڕەکان دەخۆن) ئیستاش کۆمەڵگای کوردی کۆمەڵگەیەکی سەرکردە پەرستە، سەرەڕای ئەوە کۆمەڵ سەرکردایەتی نەکردۆتە حاڵەتەکانی رۆح/ باوك/ فریادڕەس/ بەڵکو هەر لە دەرەوەی ئەو سێ چەمکەوە دەیپەرستێ، سەرکردایەتی لە کۆمەڵگای کوردیدا پابەندی جوگرافیایەکی تەسك و ناوچەیەکی بچوکی هەیە لەوێشدا هەڵتۆقیوە، واتە سەرکردایەتیەکی نەتەوەیی کە کەسێتی نەتەوەی کوردی تیادا بەرجەستە کرابێت لای کورد دروست نەبووە، کۆمەڵگای کوردی تاك پەرست و سەرکردەپەرستە تا ئەو کاتەی سەرکردە لە هەرەمی سەرکدایەتیدایە بەلام کە بزانن سەرکردە شکست دەهێنێ ئەوا بەجێی دەهێڵن و رووی لێوەردەگەڕێنن

و ریزی لیّ ناگرن، کاتیّك هەرە هیّنان رووی لە شۆڕشی (سمکۆ- سمایل خانی شکاك ١٨٧٥-١٩٣٠) کرد هیّزی کۆنفیدراسیۆنی عەشایەریش خۆی رانەگرت و بلاوبووەوە، (سمکۆ) بە (ئەحمەجد تەقی) دەلیّ: (لە هەموو کەس زیاتر کورد بۆ خۆی لەگەلّ خۆی خراپە، فیّری نۆکەری بوە، پشت بەخۆی نابەستیّ باوەڕی بە خۆی نیە، پشتی یەك ناگرن گەورەیی یەکتری قبوولّ ناکەن، چاوتان لیّیە کە من ئیّستا لەم دیّیە کەوتووم، چونکە وەك جاران دەستم ناڕوا، بزانە هیچ کوردیّك مەرحەباییم لیّدەکات و یارمەتیم دەدات؟ کوردی ئەم ناوچەیە هەموو برسی بوون بە هۆی جوولانەوەی منەوە لە ئیّراندا هەمووی بووژانەوە بیّگانەکان و تەورکەکانیش باشمان تیّگەیشتوون بۆیە گویّمان نادەنیّ)، لە وەزعیّکی وادا ئەوەی بۆ سمایل ئاغا (سمکۆ) مابۆوە تەنیا ناوو ناوبانگەکەی بوو، دواجار پاش چەند رۆژیّك وەزعییەتەکەی گۆڕا کاتیّك بۆ شاری (وان) دەعوەت کرا فەرماندەی سپاو هەموو ئەفسەرو کاربەدەستانی حکومەت بە پیّشوازی سمایل ئاغاوە چوون مەسەلەکە کوت و پڕ گۆڕا. سمایل ئاغا دەتگوت هەنگەو شەلغەی داوە، ئەوانەی تخوونی نەدەکەوتن سەرلەنویّ بایان داوەو لە دەوروبەوری ئالان و کڕنوشیان بۆ برد سمایل ئاغایش بە واق وڕماوی یەوە بە (ئەحمەد تەقی) گوت (چاوت لیّیە چلۆن دەوریان داوم، بلّیّین چی ئیّمەش تووشی ئەم نەتەوە بەدبەختە بووین ناچارین بەو وەزعەش هەردەبیّ لەگەلّیان هەلّ بکەین)، کورد تاك پەرست

بووه لە هەرەمە بچووکەکاندا نەك لە هەرەمی گەورەی نەتەوەدا، واتە هەر خێڵێك و سەرکردەیەك، هەر کۆمەڵەو سەرکردەیەك هەر دەستەو سەرکردەیەك، لە هەمان کاتیشدا، تاکی کورد و زۆر تامەزۆری سەرکردایەتی بووەو حەزی لە دەسەڵات بووە، بەمەش مەسەلەی سەرکردایەتی دابەش کراوەو لە هەمان کاتدا قان دراوە بەبێ ئاگاکان، هەوڵ نەدراوە سەرکردایەتی لەژێر رەشماڵی سەرکردایەتیەکی یەکگرتوودا یان سەرکردایەتیەکی نەتەوەییدا کۆبکرێتەوە ئەویش بەهۆی لوت بەرزی و خۆبەزل زانی تاکەکانی کۆمەڵ و سەرکردە خێڵ و بنەماڵەکان، تەنانەت سەرکردەی بزوتنەوەکان زۆرجار بێ بەرنامە بوون هەر بۆیە وەڵامیان نەبووە بەرامبەر بە رەوشی نەتەوەی کورد کە ئەمەش جێی مەترسی بووە (مستەفا پاشای یامولکی) کە (سمکۆ)ی پرسیبوو: تۆ کە لەو خاکەی بەدەستتەوەیە دەتەوێ حکومەت دامەزرێنی و سەربەخۆیی، ئەی ئالات بۆ هەڵ نەکردووە؟ (سمکۆ) چونکە وەك خۆی هیچ بەرنامەیکی بۆ دامەزراندنی حکومەت نەبوە وەڵامی داوەتەوە (لە حاڵی حازردا هیچ بەرنامەیەکمان بەرێوە نەبردوە. من مرۆڤێکم کوردم وەرە ئەو وڵاتەی رزگارکەین، ئەوە گرنگ نیە کێ دەبێتە حاکم و رێبەر، من لەم وڵاتەدا ئەو پیاوە نیم مەقام پەرەست و لەخۆرازی بم)، راستە (سمکۆ) لە خۆبایی نەبووە، بەڵام سەرکردەیەك بتوانێ شۆڕشێك هەڵیگرسێنێ گەر لە رێی سۆزی نەتەوەیشەوە بێ دەبێ ئەوەش بۆ

خۆی قبول بکات کە ببێتە سەرکردە، خۆشی بە شایستە بزانێ دەنا تووشی تێك شکاندن دەبێ، چونکە ئەو کۆمەڵگایەی کە (سمکۆ) بەڕێوەی دەبرد کۆمەڵگایەك بوو لە دووی (سمکۆ) دەڕۆیشتن بەڵام بێ بەرنامەیی سمکۆ هەم شۆڕشی شکاندو هەم خۆشی و هەم کۆمەڵەکەشی، لە لاپەڕەکانی مێژووی کورد بڕوانین دەبینین سەرکردەکانی کورد خۆیان بە شایستە نەزانیوە بۆ سەرکردایەتی نمونەی گەورەش بۆ ئەوە کەریم خانی زەندە (بڕوانە پێکهاتەی کۆمەڵگاو چەمکی دەسەڵات- رەحیم سابیر)، ئەمەش حاڵەتێکی نەخۆشی دەردەخات، یان لاوازی سەرکردەی کورد دەردەخات لە ترۆپکی هەرەمدا، کاتێك دەگاتە دەسەڵات دەسڵەمێتەوە لێی، دیارە ئەو نەخۆشییە تاکەکانی کوردیشی گرتۆتەوە، کە هەم داوای دەسەڵات دەکەن و هەمیش ناتوانن بیبەن بەڕێوەو بواریش نادەن بە کەسانی ترو تاکەکانی تر دەسەڵات بگرنە دەست یان سەرکردایەتی بگرنە دەست، کەسیش رێ نادات بە کەس سەرکردایەتیان بکات، واتە کەس کاغەزی کەس ناخوێنێتەوەو هەرکەسە ئاغایەکە بۆ خۆی، ئەمە پەرت بوونی کۆمەڵگایەو تێك شکاندنی سەرکردایەتیە لە کۆمەڵدا بڕوانە مێژووی ئیمارەت و خێڵەکان و کۆماری کوردستان کە چۆن تاکی کورد هەوڵی داوە بۆ ئەوەی بگاتە سەرکردایەتی یان پلەو دەسەڵات بگرێتە دەست لەناو ئەرتەشی کورددا (احمد خانی) نەزەری شەرەفخان سەبارەت بە

کەللە رەقی و خۆ بەزل زانینی کوردەکان دەسەلمێنێ ئەمەش بابەتێکی سەرەکی و ناتەبایی و نایەکگرتوویی داوەتێ کە تەنیا بێگانە سوودی لێوەردەگرێ.

(هندی ژ شە جاعەتی غەیورن

ئەو چەند ژمیننەتی نەفورن

ئەڤ غیرەت و ئەڤ علۆوی هیممەت

بۆ مانعێ حەملی باری میننەت

لەو پێکڤە هەمیشە بێ تفاقن

دایم ب تەمەروودو شیقاقن)

دیارە درنك بێ نەکردنی سەرکردایەتی لای کۆمەڵ مەترسیەکی گەورەی دەرخست بۆ نەتەوەی کورد، بەڵام لای هەندێك وەك شاعیران و نووسەران مەسەلەیەکی گرنگ بووەو بە چاوێکی بەرزەوە سەیری سەرکردایەتیان کردووەو خەڵکیشیان بۆ ئەوە هوشیار کردۆتەوە ئەوەتا (سیف القضات)ی شاعیری نیشتمانبەروەرو ناوداری ئەو سەردەمەی (سمکۆ) هەستی خۆشەویستی خۆی سەبارەت بە (سمکۆ) اوا دەردەبڕێ.

(سمکۆ کە خودا داویە بە مەساحیب و رئیس

شوکری بکەین بەزارو زبان و ددان و لێو

مەقسوودی وی ئەمە، کە هەقی مە بداتە مە

تەکلیفی مەش وەهایە فیدای بین بەنێرو مێ)

دیار بوو سەرکردە پێویستی‌یەکی مێژوویی بووە لە پێناو مەسەلە نەتەوەیی و نیشتمانیەکاندا، لەو بۆچوونەوە ئەوە دەردەخەین کە کورد نەیتوانیوە کەسێتی‌یەك نەتەوەیی دروست بکات چ بۆ سەرکردە چ بۆ کۆمەڵەکەی و سەرکردەش ئەو هەرەمە بەهێزە نەبووە کە بتوانێ تا سەر هەڵگری کەسێتی نەتەوەیی بێت و دوژمنیش ئەو هەلەی نەداوە کە کەسێتی نەتەوەیی لای کورد دروست بێت، چونکە جێی مەترسی بووە بۆی هەر بۆیە دوژمن ئەو پەردەی رووخاندووە کە کەسێتی نەتەوەیی بەسەریدا تێپەڕێ لە نێوان تاکە کەسی کوردو سەرکردەدا، ئەمەش بە لەناوبردن و ناوزڕاندن و لە سێدارەدان و ئاوارەکردنی سەرکردەکانەوە پیادەی کردووە، لەو درزەوە توانیویەتی ئەو هەرەمە بشکێنێ کە پێی دەڵێن هەرەمی کەسێتی نەتەوەیی، هەروەها توانیویەتی کەسێتی نەتەوەیی تێك بشکێنێ، تاکی کورد دوو سەرکردەی کورد هەرەمیان لە دەستداوە بۆ مەسەلەی کەسێتی‌یان و پرۆژەی کەسێتی نەتەوەیی‌یان لەدەست داوە. مێژوو بە وێنەو قسەو بەڵگە حاڵەتەکانی تێك شکاندنی کەسایەتیە کوردەکانمان بۆ دەگێڕنەوە کە چۆن کەسێتی‌یان شکاوە لەلایەن دوژمنانەوە. تاکی کورد دەتوانێ بگەڕێنەوە بۆ ئەو وێنانەی کە دوژمن لەکاتی تێك شکاندنی سەرکردەی بزوتنەوە کوردەکان دەری‌خستووە وەك وێنەی شێخ سەعیدی پیران و سمکۆو قازی محمد و شێخ محمود.. هتد، ئەو حاڵەتی وێنانە کە سەرکردە کوردیەکانی تیا

بەدی دەکرێ کە کەسێتی‌یان تێك شکاوە کاریگە، ی زۆری کردۆتە سەر دەروونی کوردو وای لێکردووە گە لە رێی ئەو وێنانەوە دەروونی کورد بشکێ و کەسێتی نەتەوەیی پێ بڕوخێ.

## ٨-فاکتەری دەرەوە

لەم بەشەدا بە پێویست نازانم زۆر بگەڕێمەوە دواوەو مێژوویەکی دوورو درێژی نەتەوەی کورد لەگەڵ هاوسێکانیدا باس بکەم، بەڵام دەتواتنم لە دوو بازنەی دیار کراودا باسیان لێوە بکەم:

أ-نەتەوەی کوردلە نێوان هەردوو ئیمپراتۆریای عوسمانی و سەفەویدا.

ب-سەرهەڵدانی ئیمپریالیزمە گەورەکان و پێگەیشتنی ناسیۆنالیزمی داگیرکەر.

ا-لەگەڵ سەرەتای سەدەی شانزەهەم تەرازووی سیاسی لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەراست گۆڕا شا سمایلی سەفەوی (١٤٨٥-١٥٢٤) دامەزرێنەری بناغەی دەوڵەتی سەفەوی دارِشت و توانی فارس لەژێر سەرکردایەتی یەکگرتوو کۆبکاتەوە، مەزهەبی شیعەگەریی کرد بە بنەمای حوکمڕانیەکەی بەرامبەر ترادسیۆنی مەزهەبی سوننی ئیمپراتۆریای عوسمانیدا، شا سمایل لە ساڵی ١٥٠١ بۆ فراوانخوازی حوکمڕانیەکەی پەلی هاویشت و کەوتە هەڵپەی داگیرکردنی کوردستان، سیاسەتی فەناتیزمی مەزهەبی شا سمایلی سەفەوی ناکۆکی قووڵی

خستە نێوان پەیوەندیەکانی کوردو ئازەرو تۆوی ناکۆکیەکەی قووڵی مەزنهەبی شیعە- سوننی و ناکۆکیەکی قووڵی نەتەوەی کورد- عەجەمی‌ی چاند، ئەم دەرکەوتنەی ئیمپراتۆریای سەفەوی شیعە دابڕانێکی تەواوی دەرخست لە بلۆکی ئیمپراتۆریای عوسمانی سوننی. بۆ فراوانخوازی هەردوو ئیمپراتۆر کوردستان هاوکێشەی ئەو ململانێ سیاسی- عەسکەرییەی عوسمانی سەفەوی بوو هەردوولا لەشکر کێشەکانیان بەناو خاکی کوردستان تێپەڕ دەبوون، بە قسەی سوڵتان سلێمانی قانوونی (دیوارێکی گۆشت و خوێن لە نێوان سەفەوی و عوسمانی‌دا لە کوردەکان دروست کرابوو)، ئەمە وای کرد کوردستان بکرێتە دوو پارچە بە تایبەتی لە شەڕی چاڵدێران ١٥١٤/٨/٢٣ کوردستانی بە عوسمانی و کوردستانی ئێرانی دەناسران، کوردستان بووە کەلاوەو جێگای شەرشو پێکدادان هەردوو ئیمپراتۆر دوای ئەوەی کوردەکان هەر دەستەیەك لایەنێکی ئیمپراتۆریای دەگرت دژ لایەنێکی دی لەوێدا کوردەکات یەکتریان قڕدەکرد بەوەی لە پێش لەشکرەکانی هەردوو ئیمپراتۆریای شەڕکەردا بوون، بە شکستی ئیمپراتۆریای سەفەوی لە جەنگی چاڵدێران بەشی زۆری کوردستانی خستە ناو قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریای عوسمانیەوە لەدوای ئەو شەڕە سوڵتان سەلیم لە پاداشتی چاکەی کوردەکان ئەو هەلەی بۆ پێدانی کورد رەخساند بە یارمەتی مەولانا ئیدریسی بتلیسی کوردستانێکی یەکدەست و

یەککگرتوو لە بەرامبەر دەوڵەتی سەفەویدا قوت بکاتەوە، لێرەوە شەڕی میرایەتی و ئیمارەتە کوردەکان دەستی پێ کردو زۆرجار میرە کوردەکان سنووری راگیریان لە سەلاتینی عوسمانی و پاشاکانی ئێران دەپساندو سەربەخۆیی خۆیان رادەگەیاند، شەرەفخانی بەدلیسی لەزاری مەلا سەعدەدین کە فێرکاری سوڵتان موراد خانی خوالێخۆشبوو بووە لەناو مێژووە ترکیەکەیدا کە بۆ عوسمانیان دایناوە لەمەڕ کوردیشەوە دواوەو دەڵێ (میرو پاشا کوردەکان هەریەکەیان لەلایەکەوە بۆ خۆ ئالاّی سەربەخۆیی هەڵکردبوو لەسەر دوندو ترۆپکی کەژو کێوان دەژیان لە خوا بەیەك زانین بەولاوە هیچ جۆرە یەکێتیەکیان نەبوو) شەڕو پێکدادان لەلایەن میرەکانەوە هەردەم لە ئارادا بوو ئەمەش بارێکی تری نالەباری بۆ عوسمانی و سەفەویەکان خولقاندو سەرەڕای ئەوەش دژایەتی کردنی مەزهەبی سوننی و شیعە لە هەردوو ئیمپراتۆر وای کرد لەژێر پەردەی سوننی شیعەدا دژی میرە کوردەکان بجەنگن. دوای نزیکەی نیو سەدە لە ململانێی جەنگی خوێناوی بۆ یەکەمجار هەردوو زلهێز لە پەیماننامەی (ئاماسیە)دا ١٥٥٥ لەسەر چەند خاڵێك ئاشتیەکی کاتیان دروست کرد، ئەمە بە یەکەمین پەیماننامە دادەنرێ لە نێوان دوو دەوڵەتی موسڵمانی ناکۆك لە رۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا، ئەم پەیماننامەیە زەنگێکی ترسناکی لە بەرامبەر میرە کوردەکان لێدەدا، لە سەدەی نۆزدەدا لاوازی ئێران و عوسمانی وایکرد کێشەی ئاینی لەبیر چوونەوە بەرژەوەندی بەریتانیاو

رووسیا ئەوەبوو ئێران و عوسمانی چی دی بەگژ یەکتردا نەچن و ئاشتی لە نێوانیان بەرقەرار بێت سەرەنجام هەردوو دەوڵەت بەو ئاکامە گەیشتن کە دەستی کوردەکان کورت بکەنەوە، دوایی پەیماننامەی زەهاو کە لە رووی شـــێوەو بابەتـــەوە مەرجـــە یاســـاییەکانی پەیماننامـــەی نێودەوڵەتیەکانی تێدابوو ئەمەش بۆ دیاری کردنی کێشەکانی سنوور، ئەو پەیماننامەیە بەتەواوی کوردستانی لەنێوان هەردوو ئیمپراتۆریای عوسمانی و سەفەویدا دابەش کرد تەنانەت هەردوو ئیمپۆراتۆر هۆزە کوردەکانیشیان لە نێوان خۆیاندا دابەش کرد، بە مۆرکردن پەیماننامەی (زەهاو– ١٦٣٩) بۆ نزیکەی هەشتا ساڵ جەنگ شەڕی ئۆفیسالی هەردوو ئیمپراتۆر راگرات، دوابەدوای ئەوە پەیماننامەی هەمەدان بەسترا، دوای ئەوە پەیماننامەی (ئەحەد پاشا١٧٣١) و پەیماننامەی (شێرواندا١٧٣٦) کە پەیوەندی بە کوردەوە هەبوو دوای ئەوەش پەیماننامەی (کوردان ١٧٤٦)دا گەیشتنە پەیماننەمەیەکی ئاشتی، پەیماننامەی یەکەمی (ئەرزەڕۆم١٨٢٣) بە رەزامەندی روس و ئینگلیز لە نێوانیاندا بەستراو هەڵیان کوتایە سەر میرە کوردەکان ئەو پەیماننامەیە نەیتوانی کێشەکانی سنووری عوسمانی و فارس چارەسەر بکات دواجار هەردوو حکومەتی روسی و بەریتانی بە توندی فشاریان خستنە سەر هەردوو دەوڵەت بۆ مۆرکردنی پەیماننامەی (دووەمی ئەرزەڕۆم ٣١/ ئایار/ ١٨٤٧)دا بە چاودێری دەوڵەتی روس و بەریتانیا مۆرکرا کۆتایی

هێنا بە دەسەڵاتدارێتی ناوەخۆی کورد. بەوەش دوا ئیمارەتی بابانیش سەری تێداچوو، دیاروبو هەواو گۆڕینی هۆزە کوردەکان گێچەڵی زۆری لە بارەی پێوەندیەکانی عوسمانی-فارسی دروستکردبوو چونکە هۆزە کوردەکان هەردوو دیوی سنووریان بە یەك نیشتمانی خۆیان دەزانی و ئەم دیو ئەو دیویان دەکرد، دەتوانین بڵێین هۆی پەیماننامەکانی هەردوو دەوڵەتی ئێرانی و عوسمانی و کە لەو ڕێگەیەوە ڕێ نەدرا بە کورد وەك نەتەوەیەك خۆیان بناسێنن و کەسێتی‌یەکی سەربەخۆی خۆیان هەبێت، لە ساڵی ١٨٤٩ بەدواوە ناوچەی شارەزوور ڕاستەوخۆ بەسترایەوە بە ئەستەمبوڵەوە دوای جەنگی جیهانی یەکەم و تا ئەمڕۆ وەکو پراتیکی ناڕەوا بۆ دەوڵەتی ناسیۆنالی عێراق ماوەتەوە، بەریتانیاو رووس بە تەواوی دەستیان خستبووە ناو کاروبارەکانی ئیمپراتۆریای عوسمانی و فارسی بە شێوەیەك هەردوو دەوڵەت بوو بوون بە نیمچە کۆلۆنی. سەدەی هەژدەهەم بەتایبەتی لە نیوەی دووەمدا هێزەکانی ئەوروپی بە گەرمی لەسەر ڕۆژهەڵات لە ململانێیەکی تەواودا بوون. بە تایبەت رووس و ئینگلیز ئەمانە هەندێ پەیوەندیان لێ بووەوەو لێدروست بوو بە تایبەتی پەیوەندی بەرژەوەندیان لەگەڵ عوسمانی و فارسیدا.

دەست تێوەردانی کۆلۆنیالیزمە گەورەکان وای‌کرد لە کوردستان و میرە کوردەکان گرنگی تایبەتیان هەبێ بۆ بەرژەوەندی ئینگلیز لێرەوە پرسی کورد پابەندبوو بە سیاسەتی کۆلۆنیالیزمی ئەوروپییەوە بەم چەشنە بە

درێـژی سـەدەی نۆزدەهـەم و سـەرەتای سـەدەی بیسـتەم پرسـی کـورد مەسـەلەی گەورەی سیاسـەتی بەریتانی و رووسـی بـوو، کوردسـتان لـە نێوان ئەم سیاسـەتەدا هـەموو بنکەو هێزی بەرهەمهێنی لێـوە تێکـدراو سـەرەنجام هیـچ گەشـەو پەرەسـەندنێکی ئـابووری بەخۆیـەوە نـەبینی تێکشکان و ئیفلیج بووی هێزی ئابووری کوردستان لەگەڵ خۆیـدا بـە پێویستەوە تێکشکانی کولتورو رۆحی کەسێتی نەتـەوەیی لەگەڵ خۆی هێنـا، مەسـەلەی کـورد لـە رووی جیهانیـەوە دوو رەهـەندی سـەرکی بەخۆوە گرت:

١-رەهەندی ناوچەیی بە عوسمانیکردن و بە فارسیکردنی مەسەلەکە.

٢-رەهـەندی نێونەتـەوەیی واتـە دەستبەسـەراگرتنی ناڕاسـتەوخۆی مەسەلەکە لەلایەن هێنزە کۆڵۆنیالەکانەوە بۆ فشارو فشاری سیاسی بۆ سـەر هـەردوو ئیمپراتۆریـان هـەموو مێـژووی سیاسـی کوردسـتان لـە سەدەی نۆزدەهەمـەوە تا کۆتـایی جـەنگی یەکـەمی جیـهانیش لـەم دوو خاڵە کۆبوونەوە.

ب-سـەرهەڵدانی ئیمپریالیزمـە گەورەکان و پێگەیشـتنی ناسـیۆنالیزمی داگیرکـەر رەقابـەتی فەرەنسـاو ئینگلیزو رووسیا بۆ بەدەسـتەوە گرتنـی بـازاڕی مەڵبـەندی رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت لـە سـاڵی ١٧٩٨دا دەسـتی پـێکرد، بەریتانیا ئەو ناوچانەی گرتـە ژێـر دەسـتی خـۆی و بـە یەکـەم دەوڵـەتی کۆڵۆنـی دەژمـێردرا لـەو ناوچەیـەدا پانتـایی ئیمـپراتۆری

بەریتانیا لە هیندستانەوە تا رووباری فورات خۆی راکێشابوو، لە سەدەی نۆزدەو نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا تا کۆتایی شەڕی دووهەمی جیهانی دەوڵەتی ئینگلیز لە مەڵبەندی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بەهێزترین دەوڵەتی بێگانە بوو سەرانسەری خاکی کوردستانیش بووە بەشێك لەو مەڵبەندە تەماح کاریە، رووسیای تەزاری لە دوو شەڕدا فەتحعەلیشای شکست دابوو بەسەر قەفقازدا حاکمیەتی هەبوو لە باکووری ئێران رووس کوێخای وڵات بوو لە خاکی کوردستان تەنیا ناوچەی قوتوور لە باکووری کوردستانی ئێران بەهۆی نزیك بوونی لە قەفقاز بەگرنگترین شوێنی ستراتیژێکی رووسەکان دەژمێرردرا بۆیە ئەو ناوچەیە هەمیشە لەژێر چاوەدێریدا راگرتبوو، رووس و ئینگلیز لە تاران و ئەستەمبوڵ رۆڵی سیاسی و بازاڕی هەردوو وڵاتیان بەدەست بوو ئەو پەیوەندیە نالەبارەو بەرژەوەندیە کاریگەریەکی زۆری هەبوو بەسەر ناوچەکانی کوردنشینەوە لەو نێوەدا خەبات و شۆڕشی رزگاریخوازانەی کورد هۆکاری تێکدانی ئەو رۆڵ و نەزمە ستراتیژیيە بوو کە رووس و ئینگلیز لە وڵاتی ئێران و ئیمپراتۆری عوسمانیدا بەڕێوەیان دەبرد، ئینگلیز بە توندی و رووسەکان بە شلتر ئەو نەزمەیان بەڕێوە دەبرد لە ناوچەکانی کوردستان هەر بۆیە هەر شۆڕشێك هەڵگیرسایە بەدەستی رووسی یان بەریتانی تێك دەشکا چونکە هەردوولا خوازیاری ئەوە نەبوون قەوارەیەکی سیاسی بۆ کوردستان

پەیدا ببێ یان کوردەکان داوای سەربەخۆیی بکەن بۆیە هەمیشە ئەم ناوچەیە لە شەڕو پێکدادانداا بووە، هەروەها تێك شکاندنی شۆرشەکانی کوردو سەرکردەی بزوتنەوەکان، دەرکەوتنی ئەو زلهێزانە لە کوردستان بۆ ئەوکاتە دەگەڕێتەوە کە شتومەکی دەوڵەتە پیشەسازیەکانی ئەو سەردەمەی ئەوروپی گەیشتە بازاڕەکانی کوردستان.

دیارە هەریەکە لەو دەوڵەتانە دەیانویست لە ڕێگای سەرف کردنی کاڵاکانیان سەرنجی خەڵکەکانی ناوچەکە بۆ شارەزایی و دەست رەنگینی وڵاتەکەیان رابکێشن هەرواش بووە، ئەم کارە لە ڕێی بازرگانیەوە دەکراو بەهۆی دروست کردنی کۆمپانیاکان تا بازاڕیان ببەستن بە بازاڕی جیهانەوە، وەك دامەزراندنی کۆمپانیای (هیندی-بەریتانی) لە عێراقدا لە سەدەی حەڤدەهەمدا، کوردستانیش بەو سیفەتەی ناوچەیەکی دەوڵەمەندی دابەشکرابوو لە رووی کەرەسەی خاوو بازاڕو ستراتیژی شوێنەکەی وای کردبوو دەوڵەتە گەورەکان هەموو توانای خۆیان بخەنەگەڕ بۆ شوێن پێکردنەوەیان لەم ناوچەیەدا، دوو دەوڵەتی کۆلۆنیالیستی ئینگلیزی و فەرەنسی بەتایبەتی لەسەر پێکەوەنانی دوو وڵاتی موستەعمەرەی شام و عێراق و مانەوەی قەوارەیەکی سەربەخۆ بەناوی کۆماری تورکیا چارەنووسی سیاسی کوردستانیان تووشی دواڕۆژێکی رەش و پڕ مەینەت کرد تەنانەت حازر نەبوون کوردستان لە پلەی وڵاتێکی موستەعمەرەشدا بهێڵنەوە واتە موستەفمەرەیی کوردستان ناڕاستەوخۆ بوو بۆ ئەوەی هەمیشە

کوردستان بە کۆلۆنی و ژێردەستەیی بمێنێتەوە و لەژێر چاودێری ناسیۆنالیزمە تازە لەدایك بووەکانی (عەرەب-تورك-فارس) بمێنێتەوەو سەربەخۆیی وەرنەگرن، دوای ئەم کارەساتە سەرانسەری خاکی کوردستانیان کردە تەواوکەری کیانی سیاسی چوار دەوڵەتی تورکیا/ عێراق/ سوریا/ ئێران، سەرەتای سەدەی بیستەم و بەرپابوونی جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤-١٩١٨) لە نێوان دەوڵەتە زلهێزەکان ئەو شەڕەی گەلی کوردیشی دووچاری مەینەتی کردو لەوێدا کوردستان بە تەواوی دابەش کراو کرایە چوار پارچە و هەر پارچەیەك بەدەوڵەتێکی ناسیۆنالیزمی رەگەزپەرستی‌یەوە لکێنراو ناسنامەی نەتەوەیی و کلتورو مێژووی لێ سەندرایەوە، تا ئێستاش کورد وەك نەتەوەیەك سەیر ناکرێ و ئاماژەی پێ ناکرێ لەنێو دەوڵەتاندا، بە کشانەوەی دەوڵەتە زلهێزەکان و دابەش کردنی کوردستان بەسەر دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکاندا کوردستان کرایە کەلاوەو مێژوویەکی تراژیدی بەخۆوە دەبینێ لە کۆمەڵ کوشتن و جینۆسایدو دەربەدەرکردن و سڕینەوەی شوێنەوارەکان و دواجار سڕینەوەی مەسەلەی نەتەوایەتی و ناسنامەی نەتەوایەتی کە ئەمەش کاریگەری کردە سەر کۆمەڵگای کوردو شۆڕشێکی درێژخایەنی بەخۆوە دیوەو مێژوویەکی تراژیدی بەخۆوە دیوە بۆ بەدەست هێنانی، مافە نەتەوەیی و نیشتمانیەکان و کەسێتی نەتەوەیی و ئێستاش ئەم هەوڵە بەردەوامە.

## ٩-فاكتەری پەروەردەكردن

پەروەردەكردنی منداڵ لە ڕێی خێزانەوە دەست پێدەكات و لە كۆمەڵدا خۆی دەدۆزێتەوە تا دەگاتە دەوڵەت لەدوای پلەی پەروەردەو فێركردنە، تاكەكەس لە كۆمەڵدا بەشێكی گرنگ پێك دەهێنێ ئەویش بەهۆی پێكەوە ژیان و پێكەوە كاركردن لە پێناو ئامانجە گشتییەكاندا و هەروەها لە پێناو بەرژەوەندییە گشتییەكاندا. لەگەڵ گەشەی شارستانێتیدا منداڵیش گەشەی خۆی دەكات و دەبێتە هەڵگری ئەو كەسایەتیەی نەتەوە گوزارش لە شارستانیەتی خۆی دەكات، ئەو كەسێتییە لە دەروونی تاكەكەسدا چەكەرە دەكات هەر لە منداڵیەوە و لەگەڵیدا گەورە دەبێت ئەویش بە هۆی كاریگەری تاكەكانی خێزان/ كۆمەڵ/ نەتەوە/ دەوڵەت/ هەروەها ئەو فەرهەنگە ڕۆشنبیرییەی كە ئەو تاكەكەسە پێی گۆش دەكرێ، ئەمەش لە ڕێگای گواستنەوەی فەرهەنگی كلتوری لە گەورە بۆ منداڵ لە ناوەڕۆكیدا كەسێتی تایبەت هەڵدەگرێ و لە ڕێی كۆنەستەوە دەگوێزرێتەوە بۆ منداڵ و بە كەسێتی نەتەوەیی پەروەردە دەكرێ تا ئەو قۆناغەی دەتوانێ خۆی گوزارش لە كەسێتی خۆی بكات، ئەمەش لە كۆمەڵگایەكی سەقامگیرو جێگیرو ئارامدا پیادە دەبێ و زۆر لەسەرخۆ جێگەی خۆی دەگرێ و ماندووبوونی زۆر ناوێ بەڵكو ئەو ڕۆڵە گرنگەی پەروەردە كۆمەڵ دەیبینێ و بە ئەركی خۆڕسكانەی خۆی دەزانێ ئەوجا ئەركی گرانتر دەكەوێتە سەر پەروەردە كراو بۆ ئەوەی ئەویش لە ڕێی خۆیەوە گەشە

به شارستانیەتەکەی بدات و لە هەمان کاتدا پارێزەری بێت و بەرگریشی لێ بکات، سەرەڕای ئەوەی تاکەکەس لە کۆمەڵدا دەتوێتەوە بەڵام هەر بیرکردنەوەیەکی نوێ بۆ گەشەی شارستانیەت کە تاکەکەس ڕۆڵی تیا دەبینێ و پێشکەوتن بەخۆوە دەبینێ، ئەمەش بایەخی تایبەتی خۆی دەبێت لەنێو نەتەوەکاندا، کەوابێ تاکەکەس لەنێو کۆمەڵدا زیاتر دەتوانێ هەڵگری کەسێتی نەتەوەیی بێت و لەوێدا کەسێتی نەتەوەیی پێ دەبەخشرێ، ئەویش بەهۆی تێکەڵاو بوون و لەیەك گەیشتن و گونجاندن تا وایان لێ دێ هەموو یەك کەسێتی تایبەتی هەڵدەگرن کە ئەویش کەسێتی نەتەوەیی‌یە، ئەو کەسێتی‌یە پابەندە بە باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و هوشیاری و ئارامی شارستانیەت و نەتەوەوە. کە لە پێشدا بوونەتە ژێرخانی کۆمەڵ و شارستانیەتیان لەسەر بنیات نراوە هەر لە مێژوویەکی دوورو درێژەوە، دیارە لە کۆمەڵگای کورددا ئەو جۆرە شارستانیەتە قۆناغی مێژوویی خۆی تەواو نەکردووەو کۆمەڵگای کوردی ئارامی و جێگیری بەخۆیەوە نەدیوە بۆیە پەروەردەکردن بەهەموو فەرهەنگەکانیەوە لاوازەو نەتوانراوە منداڵ بەشێوەیەکی فەرهەنگیانە گۆش بکرێ و پەروەردە بکرێ تا بتوانرێ لەوێوە ناسنامەو کەسێتی نەتەوەیی سەربەخۆیی پێ ببەخشرێ، ئەم ناتەواویە کاریگەری گەورەی کردۆتە سەر کۆمەڵ و کۆمەڵیش لە حاڵەتێکی بێ کەسێتی و بێ ناسنامەدا دەژی واتە پەرت پەرت بوون و تێك شکاندن لەنێو کەسێتی نەتەوەیی‌دا، ئەمەش بۆ ئەو شکستانەی پێشوو دەگەڕێتەوە کە

مێژوویەکی تراژیدی بەخۆوە دیوە، ئەوجا باری ئابووری و رۆشنبیری و سیاسی کورد لەبەر ئاستی نزمیان نەبۆتە ژێرخانێك بۆ دروست کردنی هەر شێوە کەسێتییەی بۆ تاکەکەسی کورد، لەبەر پێکدادانی شارستانیەتەکان لە کوردستاندا کەسێتییەکی هەمە کەسێتی دروست بووە کە کورد یان تاکی کورد بە زەحمەت دەتوانێ گوزارش لە کەسێتی خۆی بکات، هەروەها خێزانیش لە شێوەکانی پەروەردە کردن و گۆش کردنی منداڵ بێبەری کراوە گوێزانەوەی ئەو بارە نالەبارە لە گەورەوە بۆ منداڵ بە تێك شکاوی هاتووە هەر بۆیە کۆمەڵی کوردی کۆمەڵێکی تێك شکاوە، بە هیچ جۆرێك بووار نەدراوە بۆ پەروەردەکردن هۆی ئەمەش ئەو مێژووەیە کە کوردو کوردستان پیایدا تێپەڕیوە، هیچ فەرهەنگێك لای کورد ئارامی بەخۆوە نەدیوە تا بتوانرێ بیرێك لە پەروەردە کردن بکرێتەوەو لەوەیوە کەسێتییەك یان ئەو کەسێتییەی لێی سەندراوە بە دەستی بخاتەوە بەڵکو ئەو کەسێتییە هەر چەپێندراوە، هۆکاری سەرەکی ئەو جۆرە کەسێتییەی کورد دەگەڕێتەوە بۆ نەتەوەکانی دراوسێی کورد لە رێی داگیرکردنی کلتورو فەرهەنگەوەو نکوڵی کردنی مەسەلەی نەتەوەیی و مێژووی کوردن کە ئەو بارە گوازراوەتەوە لە گەورەوە بۆ منداڵ، ئەو هەستەش کە بووەتە هۆی خۆ بە نەتەوەیەکی جیاواز لەوانی دی هەر لە کۆنەستدا بە چەپێندراوی ماوەتەوەو لە سندوقەکانی کۆنەستدا هەڵگیراوەو جاربەجارێ کە رووداوێکی دژواری گەورە روودەدات ئەو هەستە چەپێندراوە بە ئاگا دێتەوەو لە ماوەیەکی

کەمدا کپ دەبێتەوە، ئەمەش واتای نەبوونی کەسێتی نەتەوەیی دەردەخات، کەسێتی کورد ناتوانێ گوزارش لە خۆیی و کۆمەڵ و نەتەوەکان بکات لەبەرئەوەی خاوەن ناسنامەی کەسێتی نەتەوەیی و کەسێتی خۆی نیەو نامۆیە لێی بۆیە زۆرجار لەلایەن نەتەوەکانی ترەوە رەت دەکرێنەوە یان ناناسرێن و تەنانەت بە کوردو بە نەتەوەش سەیر ناکرێن. کەسێتی نەتەوەیی پێش دروست بوونی دەوڵەت سەرهەڵدەدات جاری واشە دوای دروست کردنی دەوڵەت ئەو کەسێتی‌یە جێی خۆی دەگرێ، نەتەوەی کورد لە مێژوودا توانیویەتی خێڵ/ کۆمار/ دەوڵەتۆکە دروست بکات بەڵام نەیتوانیوە بۆیە ئەو پێکهاتانە تێك شکان، ئەمانەش لاوازی کەسێتی کورد دەردەخات کە نەیتوانیوە کەسێتی نەتەوەیی‌یان بپارێزن، بۆیە رووخان و تێك شکاندن کارێکی چاوەڕوان کراو بووە، سەرەڕای بوونی ئاڵاو، دراوو،.. هتد، دیارە ئەو کەسێتی‌یە لەژێر زەبرو زەنگی داگیرکەراندا تێك شکاوەو داگیرکەرەی لە بۆتەی کەسێتی خۆیدا تواندویەتیەوەو کردوویەتیە خزمەت خۆی، تا کورد وای لێ هاتووە زیاتر لە داگیرکەر هەڵگری کلتوریان بێ و قوربانی بدەن لە پێناو فەرهەنگ و کلتوری داگیرکەران، واتە تاکی کوردیش خۆی هەڵخەڵەتاندووەو لەو گێلیەدا دەژی کە رۆژانە خۆی کەسێتی نەتەوەیی و کەسێتی خۆی دەکوژێ.

## زەردەشت

"٥٨٣ پ. ز" "٦٦٠ پ.ز"

ئەو پێغەمبەرەی نەیتوانی لەگەڵ رۆحی کورددا ئاوێتە ببێت و رۆحی کورد داگیربکات، تا لەوێوە بتوانێ کەسێتی دینی و کەسێتی نەتەوەیی پێ ببەخشێ.

زەردەشت کەسێکی کراوە بووەو بڕوای وابووە کە هەموو کەس وەکو ئەوی لێببێت و ببێتە مرۆڤێکی خودایی.

کورده دەوڵەمەندەکان. کاری ریکلۆسی فەرەنسی، سەدەی (١٩).

دەرەبەگە کوردەکان، ئەوانەی تەنها بەرژەوەندی خۆیان ویستووە بەرژەوەندی گەل و نەتەوەیان لەبیر چوبۆوە،

(میر شەرەفخانی بەدلیسی ١٥٤٣-١٦٠٣، ١٦٠٤)

ئەو سەرکردەیەی وازی لە دەسەڵات هێناو کەوتە نوسینەوەی مێژوو

( قازی محمد ١٨٩٢-١٩٤٧ )

(له لایەن رژێمی کۆنەپەرستی پەهلەویەوە لە سێدارە دراوە)

لەبەردەم پەتی سێدارەدا دەڵێ: (ئێوە ئێستە قازی محمد-ێک ئەکوژن و ئیعدامی ئەکەن، بەڵام شەعبی کوردی هەریەکەی قازی محمد-ێکن بڕوام وایە ئەو قازی محمد-انە زۆر دڵڕەق ئەبن بەرانبەر بەو کەسانە کە بوون بە جەلادی شەعبی کوردی)

پێش کۆچ کردنی وەتی: (متمانەم بە دەوڵەتی ئەمریکا هەبوو ئەمیش خیانەتی پێکردین)

### کەریم خانی زەند ١٧٠١-١٧٧٩ز

کەریم خانی زەند کە هەموو ئێرانی داگیرکرد نەك هەر دەوڵەتێکی کوردی دانەمەزراند بەڵکو خۆی بە شایەنی ئەوە نەدەزانی ناسنامەی (شا) لەخۆی بنێت و نازناوی (وەکیل)ی لەخۆی نا واتە وەکیلی شا لە کاتێکدا هیچ شایەك لە ئێراندا نەبوو ئەوە بوو بە ڕەوای هەقی خۆی نەبینی خۆی بکاتە شای ئێران، بەڵام (محمد ئاغا خانی قاجاری) تورکمان کە جڵەوی حوکمی لەدەستی زەندیەکان وەرگرت (شا)یەتی خۆیی ڕاگەیاندووە خۆی ورە بەرز بوو ئەگەرچی نێرە مووکیش بوو خۆی بەلایەقی پاشایەتی ئێران زانی بە پێچەوانەی ورەنزمی (کەریم خان)ەوە.

(ئسماعیل خانی سمکۆی شکاك ١٨٧٥-١٩٣٠)

(بە ڕێکەوتنی هەردوو دەوڵەتی ئێران- تورکیا شەهیدکرا)

(ئیسماعیل خانی سمکۆی شکاك کە یەکەم جار چاوی بە رەزاشا دەکەویٚ دەڵیٚ: من لە ژیانما لە کەس نەترساوم بەڵام کە چاوم بە رەزا شا کەوت پشتم هاتە لەرزین من هەلم بۆ هەڵکەوت ئەوم نەکوشت و هەلم لە دەست بەردا،/ بەڵام لە ئاخردا ئەو من ئەکوژیٚ).

لە نیسانی ١٩٣٠ رەزا شا فێڵی لیٚدەکاو گوللەباران ددکریٚ قسەکەی خۆشی هاتەدی کە وتی (من ئەوم نەکوشت، بەڵام ئەو من ئەکوژیٚ)

## سەلاحەدینی ئەیوبی ١١٣٨-١١٩٣ز

(رزگارکەری قودس لە دەستی خاچ پەرستان)

"ئـەو کەسـایەتیەی وەك کەسـایەتی ئیسـلامی دەرکـەوت نـەك وەك سەرکردەیەکی نەتەوەیی و کەسێتیەکی نەتەوەیی"

**شێخ سەعیدی پیران ١٨٦٨-١٩٢٥ )**

لە بەردەم پەتی سێدارەدا دەڵێ (ئەمشەو مانگەشەوە.. سوپاس بۆ تۆ خوای گەورە کە ئێمە شەویشمان هەر رۆژە، چونکە دەرونمان تاریکی تیا نیە، وە ئەمڕۆش ئێمە ئەبینە قۆچی قوربانی بۆ ئازادی کوردستان.. وە ئێمە بڕگەیەکین لەو قوربانیانەی لاشەکانمان ئەکەین بە پرد بۆ ئەوەی

کورد بەسەریا بپەڕێتەوە بۆ بەری رزگاری و ئازادی.. وە ئەو مانگە جوانەی کە بە ئاسمانەوە خەرمانەی داوەو ئەدرەوشێتەوە ئەوە هیوای کوردە، ئەو ئەستێرە گەشانەی دەورو پشتیشی ئەو قۆچانەن کە لە رێی کوردستانا بەخت بوون و ئێستا بە ئاسمانی کوردستانەوە پرشنگ ئەدەن و ئەدرەوشێنەوە، پێویست ناکات کەس بۆ ئێمە بگری، وە داوای ئێمە لە کەس و کارمان و هەموو کوردێك ئەوەیە تەنانەت دڵیشیان تەنگ نەبێ، بەڵکو پێبکەنن و شانازی بکەن کە ئێمە لە رێی خواو کوردستانا ئەڕۆین و دۆعای خێرمان بۆ بکەن، بەڵام ئێوە بۆ خۆتان بگرین هەی تاوانکارینە کە رۆژێك یەت گەلی کورد ئەم رۆژەتان یەنێتەوە بەرچاو) ئەمەی وت و دانەوییەوە بۆ زەوی و مشتێ لە خۆڵەکەی هەڵگرت و ماچی کردو سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕیەوە (وتی: خوایە خۆت ئاگاداری ئێمە لە پێناوی ئەم چاکە پیرۆزەدا ئەڕۆین، کە پێی گڵاوی زۆرداران و بێگانەی لێ ببڕین) ئەمجارەش مشتەخۆڵەکەی دەستی ماچ کردەوەو وتی: (.. بەڵی ئێمە لەرێی تۆدا ئەڕۆین. تکامان هەر ئەوەیە ئەو خوێنەی ئێمەو هەموو شەهیدان کە ئەڕژێنە سەرت بیکەی بە گوڵاڵە سورە لە هەموو لایەکا، بۆ ئەوەی نیشانەی خوێن و رشتنی ئێمەو تۆڵە سەندنەوەی خەڵکی کوردستان بێ).

(شێخ مەحمود ١٨٨٣-١٩٥٦)

(لە لایەن حکومەتی ئینگلیزەوە سزادراوەو حکومەتەکەی رووخاوە)

شێخ مەحمود محاکەمەی بە حەق نەزانیوە لەلایەن ئینگلیزەوە و بە حوکمی ئینگلیز رازی نەبووەو بە عەدالەتیشی نەزانیوە. شێخ لە

مەحکەمــەدا ســەروپێچکەی خــۆیدا راتــەکان و دای بەســـەر ســنگی (گرینهاوس)دا کە لە هۆڵــی مەحکەمــەدا بــۆ شــایەتی وەســتابوو وتــی: بەدبەخت ئەوە هــەموو گۆیــەندی تۆیــە (واتــە تــۆو هاورێکــانی تــۆ ئــەو فیتنــەتان نایــەوەو ئــاوا کــوردو کوردســتانیان شــێوان). شــێخ مــەحمود داوای مافی گەلەکەی نەبێ داوای هیچی تــری نــەکردووە، هــەروەها شێخ مەحمود پێش مردنــی وتــی: بەشێکی زۆر لــە تەمــەنم لــە چیــاو شــاخ و ئەشکەوت و دەربەدەری و دورخستنەوە لــە خــاکی نیشتمانم بەسەربرد، هەمیشە پێچەوانەی شەپۆل و گەردەلوول مەلەم کردووە.. لەهەرە قوڵایی دەریاکاندا ژێرە مەلەم کــردووە.. هەمیشــە پێشــەنگی بــازو هــەڵۆ بــووم لــەراوی دوژمنــاندا گــەرچی جــێی داخــە (دواکــەوتویی گەلەکــەم) بــووە ئاستەنگ بەسەر شانمەوە!

**سەرچاوەکان:**

١-حکومەتی کوردستان و کورد لە گەمەی شۆڤێت/ نەوشیروان مستەفا/ ١٩٩٢

٢-تابلۆکانی شەرەفنامە/ عبدالرقیب یوسف/ چاپی دووەم/ ١٩٩٨

٣-ئەو هۆکارانەی مەسەلەی کورد پێك دەهێنن/ لازارییف/ سعد عبدالله کردوویە بە کوردی/ بێ مێژوو.

٤-کوردو کوردستان: ئەبو القاسمی لاهوتی/ د. جەبار قادر لە روسیەوە کردویە بە کوردی و تێبینی بۆ نوسیوە/ هۆڵەندە ١٩٩٨

٥-جوگرافیای کوردستان/ عەبدوڵلا غەفور/ چاپی دووەم سلێمانی ٢٠٠٠

٦-کوردو شۆڕش و هەڵی مێژوویی/ حوسێن محەمەد عەزیز/ چاپی دووەم ٢٠٠٠

٧-پەیوەندی نێوان کوردو روسیا (کوردستانی قەفقاز یا سۆڤێتی)/ ئارام علی/ ستۆکهۆڵم ١٩٩٩

٨-ئاغاو شێخ و دەوڵەت/ مارتن ڤان برونەسن/ کوردۆ لە ئەڵمانیەوە کردوویە بە کوردی/ بەرگی یەکەم/ چاپی سێیەم/ سلێمانی ١٩٩٩

٩-راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران/ روبەرت ئولسن/ وەرگێڕانی بۆ کوردی ئەبوبەکر خۆشناو/ ١٩٩٩

١٠-گەلێكی پەژموردەو نیشتمانێكی پەرت/ وەرگێڕانی لە عەرەبی و فارسیەوە و گۆمەیی/ لە ئینگلیزیەوە ا حەوێزی سوید ١٩٩٨
١١-كۆمەڵزانی و كورد/ فوئاد تاهیر سادق/ سلێمانی ١٩٩٩
١٢-چەمكی دەوڵەت و بزوێنەری مێژوو لە كۆمەڵگای كوردیدا/ عەتا قەرەداغی/ ١٩٩٩.
١٣-ستراتیژی كەسێتی نەتەوەیی كورد/ عەتا قەرەداغی/ سلێمانی ١٩٩٨
١٤-دەروازەی گۆڕانی كۆمەڵ/ بەیاد عبدالقادر/ بغداد ١٩٨٧
١٥-كۆمەڵی مەدەنی/ وەرگێڕانی ئەبوبەكر خۆشناو ٢٠٠٠
١٦-مرۆڤ لە روانگەی ماركسەوە/ ئەریك فرۆم/ وەرگێڕ هەبنگاو/ چاپی یەكەم ١٩٩٩.
١٧-گیروگازی چەمكی كۆمەڵی مەدەنی/ نوسینی د. كەریم ئەبوجەلاوە/ وەرگێڕانی بۆ كوردی/ ئیسماعیل كوردە، رەوشت رەشید، نوری بێخاڵی. چاپی یەكەم ساڵی ٢٠٠٠
١٨-لیبرالیزم و دیموكراسی/ نوربیر توبویۆ/ وەرگێڕانی/ رێباز مستەفا/ سلێمانی ٢٠٠٠.
١٩-تطور النظرة الواحدية الى التأريخ/ جورج بليخانوف/ ترجمة متجير مصطفى/ مراجعة د. مراد وهبة بيروت/ بێ مێژوو.

٢٠-اشكالية مفهوم المجتمع المدنى/ د. كريم ابو حلاوة الطبعة الاولى/ سوريه ١٩٩٨.
٢١-المجتمع المدنى دراسة نقد/ د. عربى بشارة/ مركز دراسات الوحدة العربية/ الطبعة الاولى بيروت ك٢/ ١٩٩٨
٢٢-كردستان مستعمرة دولية: اسماعيل بێشكچى/ ترجمة زهير عبدالملك ١٩٩٨
٢٣-العصبيه و الدولية/ د. محمد عابد الجابرى/ بغداد/ بێ مێژوو.
٢٤-العامل الاقتصادى فى التاريخ/ جورج بليخانوف/ بێ مێژوو.
٢٥-الفرد و المجتمع/ ب. بخوفسكى/ ترجمة هندى رياض/ الطبعة الثانية/ بيروت ك ٢، ١٩٧٨
٢٦-الانسان و الارتفاء/ جون لويس، نقله عن الروسيه/ عدنان جاموس/ دمشق ١٩٧٠
٢٧-الانا و الهذا/ سغموند فرويد/ ترجمة جورج طرابيش/ الطبعة الاولى/ بيروت ١٩٨٣
٢٨-مباديء علم النفس الفرويدى/ تأليف كالفن -س- هةول/ تعريب دحام الكيال/ الطبعة الثالثة، بغداد ١٩٨٨
٢٩-علم النفس الجمعى و تحليل الأنا/ سغموند فرويد/ ترجمة جورجد طرابيش/ الطبعة الاولى/ بيروت ١٩٧٩

٣٠-بافلوف و فرويد/ تاليف هارى ويلز/ ترجمة شوقى جلال/ الجزء الاول/ الهيئة المصرية العامة للكتاب ١٩٧٥.
٣١-علم النفس الاكلينيكى/ د. مصطفى فهمى/ دار مصر للطباعة/ بێ مێژوو.
٣٢-قاموس علم النفس/ د. عبدالستار طاهر شريف/ الطبعة الاولى ١٩٨٥.
٣٣-گۆڤارى نڤار/ ژماره (٢) ساڵى یەکەم هاوینی ١٩٩٨.
٣٤-گۆڤارى نڤار/ ژماره (٥) بەهارى ١٩٩٩.
٣٥-گۆڤارى مەدەنیەت/ ژماره (٢) ساڵى یەکەم ١٩٩٩.
٣٦-گۆڤارى مەدەنیەت/ ژماره (٤) ساڵى یەکەم ١٩٩٩.
٣٧-گۆڤارى مەدەنیەت/ ژماره (٨) ساڵى ٢٠٠٠
٣٨-گۆڤارى سەنتەرى لێکۆڵینەوەی ستراتیژی/ ژماره (٢) ساڵى حەوتەم مایسی ١٩٩٩ سلێمانی.
٣٩-کورد- کورتە لێکۆڵینەوەیەکی زانستییە/ فوئاد حەمە خورشید وەرگێڕ سالح سەعید دەلۆیی ساڵی ٢٠٠٠
٤٠-رەوشى ئایینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا/ د. رەشاد میران چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان- چاپی دووەم ٢٠٠٠

٤١- نەتەوەو نەتەوایەتی/ ئازاد مستەفا- لە بڵاوکراوەکانی چاپخانەی شەهید ئارام/ چاپی دووەم ١٩٩٢.
٤٢-پەندی پێشینان/ شێخ محەمەدی خاڵ/ چاپی سێیەم سلێمانی ٢٠٠٠.
٤٣-کوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان/ حوسێنی مەدەنی- بەرگی دووەم چاپی یەکەم نادریلی ٢٠٠١.
٤٤-چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی نوێ و هاوچەرخی گەلی کورد/ کەیوان ئازاد ئەنوەر، چاپی دووەم سلێمانی ٢٠٠٠.
٤٥-کوردستان و کێشەی سنووری عوسمانی- ئێرانی (١٦٣٩-١٨٤٧) نەجاتی عەبدوڵڵا- چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە- هەولێر ٢٠٠١
٤٦-کاریگەری کەلتوری ئەوان لەسەر کورد- عەتا قەرەداخی، وەزارەتی رۆشنبیری/ ٢٠٠١
٤٧-کوردستان لە مێژوودا- چاخە کۆنەکان (١٠٠٠ هەزار ساڵی پ.ز- ٤٠٠ی ز) نوسینی خەسرۆ گۆران- وەرگێڕانی ئاسۆ کەریك بەشی یەکەم/ چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری هەولێر/ ٢٠٠١
٤٨-الدولة و المشكلات الدولية/ دراسة في الجغرافية السياسية، د. عبدالله عطوي ١٩٩٤ بيروت- لبنان.
٤٩-الحضارة و الشخصية/ د. قيس النوری/ وزارة التعليم العالي و البحث العلمي بغداد ١٩٨١.

٥٠-منطق ابن خلدون في ضوء حضارته و شخصية/ د. علي الوردي المطبعة امير- قم ١٩٩٧.

٥١-مێژووی راپەرینی کورد- عەلائەدین سەجادی/ چاپی دووەم ١٣٧٥ چاپخانەی شاری کورد، سەقز.

٥٢-شۆرشی دیاربەکر- نوسینی شەهید عوسمان عوزێری- ئامادەکردن و رێکخستنەوەی بەرزان حاجی ابراهیم چەرمەگا- چاپی دووەم ٢٠٠٠.

٥٣-هەندێك داوەری بەناوبانگ- یاخود (محاکمات)ی مەزن لە مێژوودا، پارێزەر جمال بابان- چاپخانەی کۆری زانیاری عێراق ١٩٨١ بغداد.

٥٤-لە هەرباخەی گولێك- نوسین و کۆکردنەوەی فەتاح رەشید بێسارانی، چاپی یەکەم ١٩٩٩

Rahim Sabir

# Apsycosociological research about The Kurdish Society

2001